



نـــــاوی کتێـــــب: فیکری ڕۆژئاوا

بابـــــــــــــەت: فیکری مێژوویی

نووســـــــــــینی: أنور الجندي

وەرگێڕانـــــــــــی: نهاد جلال حبيب الله

نـەخـشەسازی نـاوەوە: کۆمپیوتەری نارین (محمد علی)

نـۆرەو ســالّی چــاپ: یەکەم ٢٠١٢ ز

ژمـــارەی ســـپاردن: ژمارە سپاردنی (١٩١٩)ی سالّی ٢٠١١ی پێدراوە

بازاڕی زانست بۆ کتێب و چاپەمەنی
website:www.nareenpub.com
E-mail: info@nareenpub.com
nareenpub@gmail.com
تەلەفۆن: ٢٥١١٩٨٢ ٦٦ (٠٠٩٦٤)
مۆبایل: ٧٥٠٤٠٦٤٦١٠ ٠٠٩٦٤




بەناوی خوای گەورە

# پێشەکی وەرگێڕ

سوپاس و ستایش بۆ خوای گەورە، صەلات و سەلامی خوا لە پێغەمبەر و ئالوبەیتو یارانی.

پاشان: ململانێی مرۆڤایەتی لە لایەنە جۆر بەجۆرەکانی ژیاندا لە دێر زەمانەوە بە زەقی دەرکەوتووە، بەڵکو یەکەم هەنگاوی ژیانی مرۆڤ ململانێی بەدوادا هات کاتێ دوژمنی دیاری خۆی پێ ناسێنرا ﴿إِنَّ الشَّيْطَانَ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ﴾.

لێرەوە جیاوازی فیکری و سەرکەوتن و داکەوتنی بیرەکان دەردەکەون، هەر جارەو لایەنێك هەوڵ دەدات زاڵتر بێ، لەو پێناوەشدا پەیامی خوایی دابەزی تا ڕەوتی دروستو ڕەوا نیشانی مرۆڤایەتی بدات تا بتوانن ڕێی ڕاستی بەختەوەری بگرنە بەرو نەکەونە داوی دژایەتی و یەکتربرین.

بەڵام بەردەوام نەیارانی پەیامی خوا دەستبەرداری ڕێی خۆیان نەبوون و هەر هەنگاوێکیان ناوە بۆ لەناوبردنی ئەو پەیامە خوداییە، ئیتر لەڕێی لێدانی سەربازی یان لاڕێکردنی ڕەوتەکەوە بوو بێت، ئەگەرچی توانیبێتیان لە ماوەیەکی زەمەنیدا سەرکەوتوو بن بەڵام لە ڕێکردەی گشتی ژیاندا دۆڕاوە بوون، چونکە بەردەوام پەیامی خوایی لە نوێبوونەوەدا بووەو ئەو برین و بەرکەوتنانەی سارێژکردووە تا دواجار پەیامی کامڵی کۆتایی خۆی نارد کە ئیسلامە و هەرگیز ڕووناکیەکەی ناکوژێتەوە.

ئەگەر خوا پەیامی جوولەکەی نارد و دۆستانی شەیتان توانییان ئەو پەیامە لاڕێ بکەن و بیکەنە پێناوێکی دژایەتی پەیامی خوایی، ئەوا خێرا بە هاتنی مەسیحیەت ئەو برینە سارێژ کراو ئەو ڕێگە لادراوەش ڕاست کرایەوە، ئەگەر بە دوایدا مەسیحیەت

هەمان ڕێگەی پێ گیرایە بەر ئەوا ئیسلام هات و ڕیشەی یەکخواپەرستی و ڕێی ڕاستی بە تەواوەتی چەسپاند ﴿يُرِيدُونَ أَن يُطْفِؤُواْ نُورَ اللّهِ بِأَفْوَاهِهِمْ وَيَأْبَى اللّهُ إِلاَّ أَن يُتِمَّ نُورَهُ وَلَوْ كَرِهَ الْكَافِرُونَ﴾.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دوژمنانی خوا دەستەوسان نەوەستاون و هەردەم لە هەوڵی خۆیاندا بەردەوام بوون، بۆیە بەهیوای سەرکەوتنی کاتی جارانیان دەیانەوێ ئەم جارەش سەرکەوتن بەسەر ئیسلام دا بەدەست بهێنن، کاتێ دەسەلاتدارانی دژە پەیامی خوا لەگەڵ ئایینێکدا بەریەکدەکەون سەرەتا هەوڵی لەناوبردنی دەدەن، دواجار ئەگەر نەیانتوانی هەوڵی نەخۆش خستنی دەدەن، پاشان ئەگەر ئەوەشیان چاك بۆ نەچوویە سەر هەوڵ دەدەن ڕێگەکەیان لەگەڵدا دابەش بکەن، ئەمەش بۆ هەریەك لە جوولەکەو مەسیحیەت ڕووی دا، کاتێ دەسەلاتدارانی ڕۆما لەگەڵ مەسیحیەت نەیاندەکرا کەوتنە لێدانی، کە زانییان بەوە سەرکەوتوو نابن کەوتنە دابەشکردنی ڕێگەکە لەگەڵیان، بەوە مەسیحیەت دەستبەردای برێ بنەمای سەرەکی خۆی بوو لە بەرامبەر قبولکردنی لەلایەن دەسەلاتەوە، هەمان ڕێگەش لەگەڵ ئیسلامدا گیرایەبەر، بەڵام ئیسلام بێ باکی خۆی نواند ﴿لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ﴾.

هەر هەوڵێکی ئەوان بۆ ئەوەیە گومان لەسەر ئەم سیفەتانە دروست بکەن:

١- گشتگیری و کاملێتی.

٢- بێ گومانی.

٣- جیهانێتی.

٤-هەمیشەیی.

٥-نەگۆڕاوی.

ئیسلام هەموو لایەنەکانی ژیانی گرتووە و کەماڵی مەسەلەکانیشی باسکردووە، نەك تەنها ئەوەی برێ لایەنی هێنابێ‌و لەو هێنانەشدا کەموکورتی لە باسکردنیدا هەبێ،

بەڵکو هێندە پڕاوپڕ باسی کردووە تەحەدای مرۆڤایەتی دەکات نمونەی پەیامی وا بێنن، بانگێشیان دەکات بۆ مشتومڕ ﴿تَعَالَوْاْ نَدْعُ أَبْنَاءنَا وَأَبْنَاءكُمْ وَنِسَاءنَا وَنِسَاءكُمْ وَأَنفُسَنَا وأَنفُسَكُمْ ثُمَّ نَبْتَهِلْ﴾. ئەوەشی باس کردووە هیچ گومانێکی تێدا نیە ﴿ذَلِكَ الْكِتَابُ لاَ رَيْبَ فِيهِ﴾ هەمیشەش نەیارانی دەیانەوێ ئەم سیفەتەی لێ دامالن، هەروەها پەیامەکە جیهانیە نەك ناوچەیی یان نەتەوەیی ﴿وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَالَمِينَ﴾، هاوکات هەمیشەییەو ماوەیەکی دیاری کراوی بۆ دانەنراوە، بەڵکو کۆتا پەیامی خوایە تا ڕۆژی دوایی.

هەروەها ئیسلام چەسپاوو نەگۆڕاوە، واتە دانراوی خواییەو دەستکاری ناکرێ، خواش پەیامی خۆی دەپارێزێ و تا ئێستاش پاراستوویەتی و تا دوارۆژیش دەیپارێزێ ﴿إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ﴾.

جیهانی ڕۆژئاواش کە یەك دوای یەك کەوتووەتە گۆڕینی پەیامە خوداییەکان بەو جۆرەی لەگەڵ ویست و حەزی خۆیدا بگونجێ، توانی مەسیحیەت وا لێبکات تێکەڵ بێ بەبیری کۆنی یۆنانی و ڕۆمانی و خواپەرستی پێ بگۆڕێ بە فرە خودایی و ئایینەکە لە ڕەوتی دروستی خۆی لابدات، چونکە ڕۆژئاوا تا ئەمڕۆش دەنازێت بە ڕۆمانو یۆنان و خۆی بە کەسی باڵاو جگە لە خۆی بە بیرکەوتوو و دواکەوتەی خۆی دەزانێ.

سەرەتا وای زانی بەرامبەر ئیسلامیش ئەوەی بۆ دەچێتە سەر، بەڵام کە بۆی ڕوون بوویەوە سەبارەت بە ئیسلام مەسەلەکە جیاوازە کەوتە بەرگریکاریەکی سەرسەختانەو کۆمەڵێك هەنگاوی گرتەبەر:

یەکەم: لەناوخۆیدا: لەلای خۆیەوە کۆمەڵێك هەنگاوی خێرای گرتەبەر:

١- هەوڵی دوور ڕاگرتنی خەڵك لە ناسینی ئیسلام تا نەزانن ئیسلام چیە و نەکەونە بەراوردکاری لەگەڵ بیری ڕۆژئاوادا تا خۆیان بمێننەوە.

٢- ڕێگرتن لەوانەش کە دەیانویست ئیسلام بناسێنن بە ڕۆژئاوا.

٣- بەردەوام سەرقاڵکردنی خەڵك بە پەیامی جیاجیا تا هەردەم سەرقاڵ بن بەوانەوە، ماوەیەك بە مەسیحیەت، دواتر بە هەڵدانەوەی بیری کۆنی یۆنان و ڕۆمان، جارێ بە بیری دژە ئایینی، جارێ بە بیری سەرمایەداری، جارێ بە ڕەوتی مارکسی، سەرقاڵکردنیان بە بیری جنسی بێئابڕوویی، چەندین ڕێگەی تریان پێ تاقی دەکەنەوە تەنها بۆ ئەوەی دەرفەت نەدەن چاوێکیان ڕوو لە ئیسلام بێ.

٤- هەوڵی نیشاندانی ئیسلام بەوجۆرەی خۆیان حەزیان پێیە، تا ئیسلام وا نیشان بدەن لە لایەکەوە کەموکورتی هەبێ، لە لایەکەوە بە بیری دزراوی دابنێن، لە لایەکی تریشەوە بە دوژمنی ئەو خەڵکەی خۆیانی دابنێن.

دووەم: لە بەرامبەر جیهانی ئیسلامی دا: لەم ڕووەشەوە چەند هەنگاوێکیان گرتەبەر:

١- ڕێ گرتن لە موسڵمانان تا تێکەڵ نەبن و ڕێیان پێنەدەن ئیسلام بەو خەڵکە بناسێنن.

٢- دروستکردنی دوژمنایەتی لەگەڵ جیهانی ئیسلامی و موسڵماناندا وەك ئەوەی لە سەردەمی فتوحاتدا کاتێ خەڵکێ ئیسلامیان ناسی خێرا موسڵمان دەبوون مەسیحیەکانی ڕۆژئاوا کەوتنە سوتاندنی قورئان تا ڕقێ لەگەڵ موسڵمانان دروست بکەن و بەربگرن بەو لێشاوی موسڵمان بوونە.

٣- لێدانی موسڵمانان لە ڕووی سەربازیەوە، دیارترین نموونەش شاڵاوە خاچیەکانی سەردەمانی عەباسی و مەملووکی، دواتریش شاڵاوە داگیرکاریەکان کە تا ئەمڕۆش لەژێر دروشمی جیاجیادا بەردەوامن.

٤- هەناردەکردنی بیری خۆیان بۆ جیهانی ئیسلامی لەڕێی بیربراو و کەمفامانی ناو جیهانی ئیسلامیەوە تا ئەگەریش سەرکەوتوو نەبن هیچ نەبێ کەمفامانێ لە خشتەبەرن.

٥- ڕەوتی بەرفراوانی موژدەبەری کە هاودەم بە ڕەوتە سەربازیەکە هەنارده دەکرا.

بەڵام ئیسلام هەموو ئەو هەنگاوانەی بەرپەرچ دایەوە، بۆیە لەسەر ئاستی ناوخۆیی توانی لە چەند ڕێیەکەوە بچێتە ناو ڕۆژئاوا و بە لێشاو خەڵکی موسڵمان بن، لەوانە:

١- چوونی تاکە تاکەی موسڵمانان و بانگەوازیان لەوێ کە بەوە بنکەیان دادەکوتاو هەریەك لەو موسڵمان بووانە دەبووە وێستگەیەکی بانگەوازی بەهێز.

٢- فتوحاتی ئیسلامی کە زۆر بەهێز و چالاکانە ڕۆڵی بینی لەگەیاندنی ئیسلام بە ڕۆژئاوا.

٣- گەیاندن و ناساندنی ئیسلام بەوانەی دەهاتن بۆ لێدانی ئیسلام، ئیتر زۆرێکیان موسڵمان دەبوون و بە توێشوویەکی ئیسلامیەوە دەچوونەوە ڕۆژئاوا.

٤- بەهێزی زانستی ئیسلامی کە شەیدایانی زانستی لە ڕۆژئاوادا ڕاکێش دەکرد تا بێن لە جیهانی ئیسلامیدا زانست وەربگرن، کاتێ شارەزای ئیسلام دەبوون بە موسڵمانی دەگەڕانەوە یان هیچ نەبێ ئیسلامیان زۆر لا ڕەواتر بوو لە ئایینی نیشتمانی خۆیان یان هەر هیچ نا دژایەتییان نەدەکرد.

لەسەر ئاستی هێرشی دژ بە ئیسلامیش کە ڕۆژئاوا گرتبوویەبەر دووبارە ئیسلام سەرکەوت و کۆمەڵێك هەنگاوی یەکلاکەرەوەی نا، لەوانە:

١- بە سەختی وەڵامی شاڵاوە سەربازیەکانی دایەوەو توانی بە دۆڕاوی بیانگێڕێتەوە، نەك تەنها بە دۆڕاوی سەربازی، بەڵکو دۆڕاوی هزریشیان تووش بکات، لە داگیرکاری نوێ و هاوچەرخیش دا ئەگەر چی ئیسلام بە تەواوەتی لە دیدی سەربازیەوە سەرنەکەوت بەڵام لەلایەکەوە بەردەوام بەرگریکاری باشی هەبووە، لەلایەکی دیکەشەوە لە سەنگەری بانگەوازو چوونە ناو ڕۆژئاواو بەلێشاو موسڵمانکردنی ڕۆژئاواییەکان سەنگەری لێگرتووە، بۆیە ڕۆژ بە ڕۆژ ڕێژەی موسڵمانان لە جیهاندا ڕوو لە زیادبوونە بەتایبەت لە جیهانی دەرەوەی ئیسلامی دا ڕێژەی موسڵمان بوون تەواو

ڕوو لەزیاد بوونە، ئەمەش سەرکەوتنی گەورەی ئیسلامەو ئەمەش هێندەی تر ڕۆژئاوای داخ لەدڵ کردووەو وای لێکردووە سەر لەنوێ هەست بە شکست بکات.

٢- بەسەختی وەڵامی شاڵاوی هزری ڕۆژئاوای داپەوە، چونکە پیلانی ڕۆژئاوا ئەوە بوو بتوانێ هەریەك لە بیری لارێی یۆنانی و ڕۆمانی و بیری بتپەرستی ناو ڕۆژئاواو بیری لارێی کەهەنوتی مەسیحی و بیری جادووگەری هیندی و بیری ئاگرپەرستی فارسی تێکەڵ بکات بە بیری دروستی ئیسلامی، بەمەش چەند داردەستێکی دەست کەوتن وەك فارابی و حەلاج و ئیبن عەرەبی و چەندێکی تر کە خێرا زانایانی ئیسلامی وەك غەزالی و ئیبن تەیمیە و ئیبن قەیم و چەندێکی تر بە بەڵگەی بەهێزی قورئان و سوننەت بێزەبوونیان کردن و نەیانهێشت ڕەوتی دروستی ئیسلامی تێکبدەن، بەداخەوە ئەمڕۆش کەسانێ کەوتوونەتە هەمان داوەوەو واش تێگەیشتوون ئەوە خزمەتە بە بیرو ڕەوتی ئیسلامی، بەڵام بێگومان ڕەوتی ئیسلامی لارێبوون قبوڵ ناکات.

ئەمڕۆش جیهانی ئیسلامی لە تەنگژەدایە، تەنگژەیەك کە لە سەدەی نۆزدەوە ڕووی تێکردووەو لە چەند ڕوویەکەوە جیهانی ئیسلامی شێلاوە، بەڵام سوپاس بۆ خوا وا لەسەر پێ کەوتنەوەدایەو لەم سەدەی بیست و یەکەمەشدا ڕووەو گرتنەوە دەستی جڵەوی جیهان دەچێت.

ئەو تەنگژەی ئەمڕۆ جیهانی ئیسلامی تێکەوتووە لەم مەترسیانەدا خۆی دەبینێتەوە:

١- مەترسی خاچی کە شاڵاوی سەربازی و موژدەبەریشی هێناوە بۆ سەر جیهانی ئیسلامی.

٢- مەترسی گرنگیدان و سەرخستنی ڕەوتە لادەرەکانی ناو مێژووی ئیسلامیو پاڵپشتیکردنیان بۆ لێدانی بیرو دەسەڵاتی ئیسلامیش وەك موعتەزیلەو شیعەو سۆفیگەری لارێ و قادیانی و... هتد.

٣- مەترسی ڕەوتی عەلمانیەت کە بە زۆر بەسەر موسڵماناندا دەسەپێنرێ، چ لە ئاستی دەسەڵات و سیاسەتدا، چ لە ئاستی پەروەردەو فێرکردندا.

سوپاس بۆ خوا پاش خەبات و بەرخۆدانی زیاد لە سەدەیەکی موسڵمانان وا موسڵمانان لە قۆناغی شکستەوە هەنگاویان ناوە بەرەو قۆناغی بەرگری و خۆگرتنەوەو پێشڕەوی تا ئاستێ زۆرێك لە بیریارانی جیهان سەدەی بیست و یەك بە سەدەی ئیسلام دادەنێن

لەم ڕوانگەوەو وەك خستنە بەردەستی زانیاریەکی پوخت و پڕواتا لەسەر بیری ڕۆژئاوا بە پێویستمان زانی ئەم کتێبەی بەردەستتان وەرگێڕینە سەر زمانی کوردی بە ناونیشانی بیری ڕۆژئاوا لە نوسینی بیریاری گەورەی ئیسلامی ئەنوەرلجوندی کە زانایەکی بیرمەندی ئیسلامی میسریەو بەداخەوە زۆرێك لە موسڵمانان هێشتا ئەم کەڵە پیاوە بەباشی ناناسن، بەڵام هەرکەس دەست بداتە نووسینەکانی سات دوای سات هەست بە گەورەیی بیری ئەم کەسایەتیە دەکات.

نووسەر لەم کتێبەی دا بە شێوەیەکی مەوزوعی باس لە بیری ڕۆژئاوا دەکات هەر لە قۆناغی یۆنانی ڕۆمانیەوە تا ئەمڕۆ، لە هەر قۆناغێکیشدا دیدی ڕەخنەیی لەسەر دێنێ و بە وردی شەن و کەوی ئەو قۆناغە دەکات، بەرامبەر بەوەش بەدیلی بیری ئیسلامی لەڕووی ئەو بیری قۆناغانەدا دێنێ.

هاوکات بە پێویستمان زانی وەك سەرەتایەك پوختەیەك لەسەر ژیان و نووسین و هەوڵ و دیدی نووسەر (ئەنوەرلجوندی) بۆ خوێنەرانی ئازیز بخەینە ڕوو، بۆ ئەمەش هەمان نووسینی بەڕێز مامۆستا ئیکرام کەریمان لەوبارەیەوە هێناوەو دامان ناوە کە لە ژمارە دووی گۆڤاری ڕێنوێن دا بڵاوی کردووەتەوەو بە پوختی ئەم کەسایەتیەمان پێ دەناسێنێ.

خوایە ئیسلام پەیامی تۆیەو ئێمەش بۆ ئیسلام لێنەوییوین، نیازمان تەنها بۆ تۆیـە و تەنها تۆیشمان بەسە، دەی پەنامان بدەو بۆ خزمەتی پەیامەکەت ڕێمان پێ بگرەبەر.

﴿إن أريد الا الاصلاح ما استطعت وما توفيقي إلا بالله عليه توكلت و إليه انيب﴾

نهاد جلال حبيب الله

١٣\شعبان\١٤٣٢

# کورتەیەك لەسەر نووسەر( أنور الجندي )

## نووسینی: إکرام کریم

ئەنوەر جوندی بەحەق ئەو بیرمەندە گەورەیە کە کەم کەس ئەیناسیت، سەیرە بیرمەندو بەحیکمەت و زانایەکی وەك ئەم زاتە، موسڵمانان بێ ئاگابن لێی؟! ئەم مامۆستایەی کە هەتا لەگەڵی دەڕۆیت زیاتر گەورەی و فرەی و ئاستی بێ کۆتای مەعریفیت بۆ ئاشکرا دەبێت، قەڵەمەکە بە راستی بەقەد شمشێری یەك سوپا بەرگری لە ئیسلام کردوە، هێندەی کتێبی بە نرخی نوسیوە کە گەر نەیناسیت دەڵێت ئەمە یەکێکە لە زانا ناودارو گەورەکانی مێژووی موسڵمانان، ئێمە لە گۆڤاری ڕێنوین بڕیارمانداوە پرۆژەی بە کورد کردنی نوسینەکانی ئەم زاتە گەورەیە دەست پێ بکەین چ لە ڕێگەی گۆڤارەکەوە بێت یان لە ڕێگەی ئەو زنجرە کتێبەی کە پاشکۆی گۆڤارەکەیە، دەرگاش والآیە بۆ هەموو کەس ئەو خزمەتە گەورەیە بە کتێبخانەی هزری ئیسلامی کوردی بکات، چونکە مامۆستا هێندە گەورەیە بەشی هەمووی دەکات! دەرگای ئەم پرۆژەشمان بەم نوسینەی م.ئیکرام دەکەینەوە کە بەراستی بە خوێندنەوەی ئەم بابەتە یەکسەر شەیدای نوسینەکانی ئەم زانا گەورەیە دەبیت.

هەر باشە لەپاش مردنیشیان یادی زانان و پیاوە گەورەکان بکرێتەوە ولا بکرێتەوە بەلای ئەو کەلەپوورەی کە بەجێ ی دەهێڵن بۆمان، هەرچەندە وەفاو راستی لەوەدایە کە لەژیاندا بە یادی زاناو پیاوە گەورەکانەوە بژین و لەخزمەتیاندا گرێ ی دڵی خۆمانیان بۆ بکەینەوە و سود لە حیکمەت و ئەزمون و زانستەکانیان وەربگرین و ئەوانیش ئاسودەو دڵخۆش بکەین بە چالاکی و گوێگرتن و گوێرایەڵی بۆیان.

چەند زانا لە ژیانی خۆیاندا لە بێمەیلی خەڵکی نائومێد بوون، هەبوە سەری خۆی هەڵگرتووە، هەبوە کەشکۆڵی سەفەری لێ هەڵگرتوە و هەبووە هەڵوێستی ناباش و پر

زیانی وەرگرتوە لە خەڵکی وەك کاردانەوەیەك بۆ ئەو بیمەیلیەی خەڵکی بۆ خۆی و بۆ زانستەکەی!!

ئەبو حەیانی تەوحیدی لە کۆتای ژیانیدا چوەتە ناو کتێبخانەکەی و چاوێکی گێراوە بەناویاندا و بەحەسرەت و دڵنێشانێکەوە تێر تێر بۆی ڕوانین و لەداخی بێمەیلی و ناحاڵی بوونی خەڵکی لێ ی ئاگری خۆش کردو دانە دانە هەموو کتێبەکانی سوتاند کە هەموو تەمەن و عەقڵی خۆی تیدا سەرف کردبوو!

سەعدەدینی تەفتەزانی لە گەرمەی وانە وتنەوەیدا بە قوتابیەکانی کە فێری (منطق) و (فەلسەفە) و (زانستەکانی دین)ی ئەکردن، یەکێك لە منداڵەکانی هاتە ژورەوەو وتی: باوکە لەماڵەوە نانمان نیە، تەفتەزانی کتێبەکەی لە دەست کەوتە خوارەوەو زمانی بەسرا، قوتابیەکانی سەریان بەرزکردەوەو عەرزیان کرد قوربان! دەرسمان بۆ تەواو بکە، هاتە زمان و وتی نانمان نیە هەموو زانستێکی لە بیر بردمەوە!

نەضری کوری شەمیل زانای گەورەی (نحو) کتێبەکانی دا بە شانیدا و لەشار چوویە دەرەوەو کەشکۆڵی سەفەری هەڵگرت، قوتابیەکانی پێشیان لێ گرت و عەرزیان کرد: قوربان! بۆچی جێمان دەهێڵی؟ بە حەسرەتێکەوە فەرمووی: کوڕینە! خوا ئەزانێت ناوساجیەکم شك ببردایە جێم نە ئەهێشتن!

ئەمانەو سەدان زانای گەورە کاتێك کە توێژینەوە لە کەلەپورەکانی ئەکەیت هەست دەکەیت عملاقێکە و لە پشت یەك شاخی گەورە بەرهەمەوە وەستاوە و شەو ڕۆژی داوەتە دەم یەك بۆ خزمەتی دین و دونیای خەڵکی، (ئەنوەر لجوندی) یەکێکە لەز زانایانەی کە باڵای لە باڵای زۆربەی زانایان و بیرمەندان بەرزترە و نوسین و شوێنەوارەکانیشی شایەتی ئەو راستیەن.

**ئەنور لجوندی خاوەنی خەزێنەیەکی پڕ کتێبە بۆ نمونە:**

١. دووسەد کتێبی هەمە چەشن لە هەموو بوارەکانی رۆشنبیری ئیسلامیدا.

٢. زیاد لە سێ سەد نامیلکەی تر کە پێکەوە قوتابخانەیەکی فیکری دائەمەزرێنن.

٣. دە (مەوسوعەی) ی گەورەی نوسیوە کە یەکێکیان بە ناوی (مقدمە المناهج و العلوم)ە کە چل بەرگەو لە (١٠) جەڵد کتێبدا کۆکراوەتەوە و ئەم مەوسوعەیەی هەوڵێکە بۆ دانانی بەرنامەیەکی رۆشنبیری تێرو تەواو کە جێگەی هەموو سەرچاوەیەك بگرێتەوە بۆ رۆشنبیرانی ئیسلامی و ئەوانەش ئەیانەوێت لەسەر ئیسلام بخوێننەوە.

یەکەم: (موسوعة مقدمات العلوم والمناهج) کە دە موجەڵەدو ٦٣٠٧ لاپەرەیە و موجەڵەدەکانی بەم شێوەیەن:

(١) الفكر الإسلامي (بناء الفكر الإسلامي وتطوره . مخططات غزو الفكر الإسلامي . مؤامرات إنبعاث الفكر الوثني الهليني والشرقي القديم) ط الاولى ١٣٩٩هـ /١٩٧٩م دار الأنصار بالقاهرة.

(٢) تاريخ الإسلام (من فجر الإسلام إلي العصر الحديث . عالم الإسلام وعالم الغرب_ من الوحدة الإسلامية إلي الترك والعرب

(٣) العالم الإسلامي المعاصر (عالم الإسلام المعاصر . العالم الإسلامي والغزو الصهيوني . العالم الإسلامي والغزو الشيوعي).

(٤) اللغة والأدب والثقافة (اللغة العربية وقضاياها . خصائص الأدب الغربي وقضية الشعوبية . الثقافة العربية اسلامية أصولها وانتماءها) ط دار الأنصار ١٩٨٢ م.

(٥) التبشير والاستشراق والدعوات الهدامة (التبشير والاستشراق وأثرهما في الفكر والاجتماع . المؤامرة على تاريخ الإسلام _ الإسلام والدعوات الهدامة ) ط دار الأنصار ١٩٨٣م.

(٦) المجتمع الإسلامي (نظام الإسلام . قضايا المجتمع . التربية الإسلامية ومناهج التعليم) ط دار الأنصار ١٩٨٥م.

(٧) الحضارة والعلم والعلوم الاجتماعية (مفاهيم العلوم الاجتماعية . الإسلام والحضارة . الإسلام والتكنولوجيا) ط دار الأنصار ١٩٨٦م.

(٨) طابع الإسلام بين الأديان والأيديولوجيات (عطاء الإسلام للبشرية . العلمانية في ضوء الإسلام والأيديولوجيات المعاصرة) ط دار الأنصار ١٩٨٦م.

(٩) المنهج الغربي أخطاؤه والشبهات المثارة ضد الإسلام (أخطاء المنهج الغربي الوافد _ من التبعية إلي الأصالة دراسة قضايا التعليم والشريعة واللغة العربية . موقف الإسلام من الفلسفات القديمة).

(١٠) تاريخ اليقظة الإسلامية في مراحلها الثلاث (اليقظة الإسلامية فى مواجهة الاستعمار _ اليقظة الإسلامية فى مواجهة التغريب _ اليقظة الإسلامية فى الشيوعية . والموسوعة طبعة دار الأنصار١٤٠٩ هـ.

دووهەم: (الموسوعة الإسلامية العربية) لەم بەشانە پێکدێت:

(١) أصول الثقافة العربية ومصادرها الإسلامية ط دار الكتاب اللبنانى ١٩٦٤ م.

(٢) خصائص الأدب العربي.

(٣) العروبة والإسلام.

(٤) الإسلام والفلسفات المعاصرة.

(٥) حضارة التوحيد وحضارة الوثنية.

(٦) الفصحى لغة القرآن.

(٧) الشريعة الإسلامية في مواجهة الراسمالية والديمقراطية والماركسية.

(٨) الإسلام والعالم المعاصر.

(٩) سقوط العلمانية ط دار الكتاب اللبنانى بيروت ١٩٩٣ هـ/ ١٩٧٣م الأولى.

(١٠) الإسلام والدعوات الهدامة.

(١١) الفلسفات القديمة والمعاصرة في ضوء الإسلام.

(١٢) مفاهيم النفس والأخلاق والإجتماع في ضوء الإسلام.

(١٣) أخطاء المنهج الغربي الوافد ط دار الكتاب اللبنانى بيروت الأولى ١٩٧٤م.

(١٤) مخططات التبشير الغربي في غزو الفكر الإسلامي.

(١٥) مخططات الاستشراق في تغريب الفكر الإسلامي.

(١٦) المخططات الإستشراقية في تغريب الفكر الإسلامي.

(١٧) الإسلام وحركة التاريخ ط دار الكتاب اللبنانى بيروت.

(١٨) العالم الإسلامي والإستعمار السياسي، والاجتماعي، والثقافي ط دار الكتاب اللبنانى بيروت الأولى ١٩٧٩م.

(١٩) التربية والتعليم والثقافة في ضوء الإسلام.

(٢٠) الشبهات والأخطاء الشائعة في الأدب والاجتماع والتاريخ ط دار الاعتصام ١٩٩٥م.

(٢١) الأخطار التي تواجه الأمم.

(٢٢) القيم الأساسية للفكر الإسلامي والثقافة العربية.

(٢٣) الإسلام والثقافة العربية في مواجهة التغريب.

(٢٤) يقظة الفكر العربي في مواجهة الاستعمار.

(٢٥) معالم الفكر العربي

سێیەم: (موسوعة معالم الأدب العربي المعاصر): ئەم بەشانە لەخۆدەگرێ:

(١) النثر العربي تطوره وأعلامه.

(٢) الأدب العربي الحديث في معركة المقاومة والتجمع.

(٣) المعارك الأدبية.

(٤) الفكر العربي المعاصر في معركة التغريب والثقافة.

(٥) الصحافة السياسية في مصر.

(٦) الشعر العربي المعاصر تطوره وأعلامه.

(٧) القصة العربية المعاصرة تطورها وأعلامها.

(٨) اللغة العربية بين خصومها وأنصارها.

(٩) أدب المرأة العربية تطوره وأعلامه.

(١٠) معالم الأدب العربي المعاصر في النقد والفنون المختلفة.

چوارەم: (موسوعة التأصيل الإسلامي) ئەم کتێبانە لەخۆدەگرێ:

(١) من سقوط الخلافة إلي مولد الصحوة ط بيت الحكمة للنشر والتوزيع بالقاهرة بدون تاريخ الجزء الأول.

(٢) من سقوط الخلافة إلي مولد الصحوة ط بيت الحكمة للنشر والتوزيع بالقاهرة بدون تاريخ الجزء الثاني.

(٣) من سقوط الخلافة إلي مولد الصحوة ط بيت الحكمة للنشر والتوزيع بالقاهرة بدون تاريخ الجزء الثالث.

(٤) من سقوط الخلافة إلي مولد الصحوة ط بيت الحكمة للنشر والتوزيع بالقاهرة بدون تاريخ الجزء الرابع.

پێنجەم: (موسوعة معلمة الإسلام)

لە دوو بەرگدا ئیسلام دەناسێنێ

(١) المجلد الأول خمسون مصطلحا في مختلف المجالات.

(٢) المجلد الثاني خمسون مصطلحا في مختلف المجالات.

شەشەم:(موسوعة العلوم الإسلامية)ط دار الاعتصام ١٩٨٢م

(١) الفكر الإسلامي والثقافة العربية المعاصرة في مواجهة تحديات الإستشراق والتبشير والغزو الثقافي.

(٢) تاريخ الغزو الفكري والتغريب خلال مرحلة ما بين الحربين العالميتين ١٩٢٠: ١٩٤٠م.

(٣) أسلمة المناهج والعلوم والقضايا والمصطلحات المعاصرة.

(٤) معالم تاريخ الإسلام المعاصر.

(٥) من اليقظة إلي الصحوة خلال المرحلة من ١٩٣٣: ١٩٨٨م.

حەوتەم: (موسوعة تاريخ الصحافة الإسلامية خلال القرن الرابع عشر الهجري من ١٣٠١ هـ: ١٤٠٠هـ، ومن ١٨٨٤: ١٩٨٠م)

(١) الصحافة السياسية في مصر منذ نشأتها إلي الحرب العالمية الثانية.

(٢) تطور الصحافة العربية في مصر (إطار لملامح المجتمع وصورة العصر).

(٣) تطور الصحافة العربية بين الحربين ١٩١٩: ١٩٣٩م في العالم العربي.

(٤) تطور الصحافة في العالم العربي بين الحرب العالمية الثانية إلي اليوم.

(٥) تاريخ الصحافة الإسلامية الجزء الأول ويتحدث فيه عن مجلة المنار.

(٦) تاريخ الصحافة الإسلامية الجزء الثاني ويتحدث فيه عن مجلة الفتح.

(٧) الصحافة والأقلام المسمومة.

(٨) الصحافة الكاريكاتورية.

هەشتەم:(موسوعة القرن الخامس عشر الهجري)

(١) الأخطاء الشائعة ط دار الاعتصام ١٩٩٥م.

(٢) معالم التاريخ الإسلامي المعاصر ط دار الاعتصام ١٩٨١م.

(٣) المد الإسلامي ط دار الاعتصام بدون تاريخ.

(٤) إعادة النظر في كتابات العصريين في ضوء الإسلام، دار الاعتصام ١٩٨٥م.

(٥) القرن الخامس عشر: قضاياه وتحدياته.

(٦) إطار إسلامي للفكر المعاصر ط المكتب الإسلامي،ط١، ١٤٠٠هـ /١٩٨٠م.

(٧) مشكلات العصر وقضايا الفكر ط.

(٨) نوابغ الإسلام ط دار الاعتصام ١٩٨٣م.

(٩) الأخطار التي تواجه الأمم.

(١٠) الصحوة الإسلامية منطلق الأصالة ط دار الاعتصام بدون تاريخ.

(١١) تصحيح المفاهيم في ضوء الكتاب والسنة ط دار الاعتصام ١٩٨٣م.

نۆيەم:(معالم التاريخ الإسلامي المعاصر)

(١) الإسلام وحركة التاريخ.

(٢) العالم الإسلامي والاستعمار السياسي والاجتماعي والثقافي.

(٣) العروبة والإسلام.

(٤) الإسلام والغرب.

(٥) الوحدة الإسلامية وعودة الخلافة.

(٦) خريطة الإسلام المعاصر.

(٧) مصر العربية الإسلامية.

دەیەم: معالم تاريخ الإسلام

(١) تاريخ الإسلام في مواجهة التحديات.

(٢) المؤامرة على الإسلام.

(٣) المخططات التلمودية والصهيونية في غزو الفكر الإسلامي.

(٤) مقدمة المناهج.

(٥) من التبعية إلى الأصالة في مجال التعليم و القانون واللغة.

(٦) الف مليون مسلم في مواجهة الأخطار والتحديات.

(٧) حركة اليقظة الإسلامية في مواجهة الاستعمار والتغريب والشعوبية.

"محمد المجذووب"ی هاوڕێ و نوسەری دیاری میصری ئەڵێت: پەنجا بەرگی لە (معلمة الاسلام)نوسیوە !.

٥. ئەوەی دەستی پێ ی گەشتبێت لە ڕێبەرانی فەرهەنگ و ئەوەی هاوچەرخ لە (١٧) هەڤدە جەڵدا ژیانامەو بەرهەم و نوسینەکانیانی داوەتە بەر نەشتەری ڕەخنەو لێکۆڵینەوەی زانستی.

٦. ژیانامەی گەورە پیاوانی ئیسلام بە شێوازێکی زۆر بەچێژو ووردەکارانەوە کە تەنیا لەسەر ژیانی ئیمامی حەسەن بەننا (٣)بەرگ کتێبی نوسیوە و تیدا میتۆدی ئەو زانا بەرزانەی باس کردوە کە خۆیان و شاگردانیان لەسەر پەروەردە کردوە وەك (نوابغ الفكر الاسلامى) کە تیدا لە ژیانی (ابن خلدوون و بێرونی و غەزالی و ئیبن تیمیە و ئیبن حەزم و شافعی...هتد) توێژیوەتەوە.

٧. مامۆستا ئەنوەر لجوندی بە درێژای ٦٠ساڵی تەواو لە وتار نوسین نەکەوتوە و بەردەوام نوسینی لە ڕۆژنامە دیارو بەناوبانگەکاندا نووسیوە.

## ناونیشانی هەندێك لە كتێبەكانی:

١. شبهات حول الفكر الاسلامي.
٢. نقد مناهج الغرب.
٣. اخطاء المنهج الغربي الوافد.
٤. الضربات التى وجهت الى الامة الاسلامية.
٥. تأصيل مناهج العلوم.
٦. اليقظة الاسلامية في مواجهة الاستعمار.
٧. اقباس من السيرة العطرة.
٨. قضايا الشباب المسلم.
٩. نحو بناء منهج البدائل الاسلامية للنظريات و الايدولوجيات و المفاهيم الغربية الوافدة.
١٠. موقف الاسلام من العلم او الفلسفة الغربية.
١١. مقدمات العلوم و المناهج
١٢. اطار اسلامي للفكر المعاصر.
١٣. بناء منهج جديد للتعليم و الثقافة على قاعدة الاصالة.
١٤. التربية و بناء الاجيال في ضوء الاسلام.
١٥. ترشيد الفكر الاسلامى.
١٦. نظريات وافدة كشف الفكر الاسلامي زيفها.
١٧. نحن و حضارة الغرب.
١٨. وحدة الفكر الاسلامي:مقدمة للوحدة الاسلامية الكبرى.
١٩. نوابغ الاسلام.
٢٠. مصححوا المفاهم.
٢١. المسلمون على مشارف القرن خامس العشر الهجرى
٢٢. اسلمة المناهج والعلوم والقضايا و المصطلحات المعاصرة.

مامۆستا ئەنورلجوندی دوو جۆر كتێبی گیرفانی نوسیوە:

یەكەمیان: لە ژێر ناوی في دائرة الضوء كە پەنجاهەڵقە كتێبی گیرفانییە.

دووهەمیان: لە ژێر ناوی(على طريق الاصالة) ئەمیش هەر پەنجا هەڵقەیە ! !

# کورتەیەکی ژیانی ئەنوەر الجندی ( ١٩١٧-٢٠٠٢ ).

ناوی تەواوی بریتیە لە (احمد انور سید احمد الجندی) لە ڕۆژی دەی مانگی ربیع الاولی ساڵی ١٣٣٠ کۆچی دا بەرامبەر ساڵی (١٩١٧) ی زاینیدا لە دێ ی (نەخیلە)ی سەربە شاری دیروگی سەر بە پارێزگای (اسیوط) لە دایك بوە.

لە ماڵێکی دیندار و محافیزکاردا هاتوەتە دنیاو باوکی پیاوێکی خوێندەوارو خاوەن کتێبخانەیەکی گەورەی خۆی بوە.

لەتەمەنی منداڵیدا و هەر لە مزگەوتی لادێکەیاندا هەموو قورئان لەبەر دەکات و ئەچێتە بەرخوێندنی حکومی.

دەست بە نوسین و وتار دان ئەکات و سەرنجی مامۆستاو هاورێکانی ڕائەکیشێت و لە بەشی (ئابوری و بەرێوبردنی بانکەکان) زانکۆی ئەمریکی تەواو دەکات و فێری ئینگلیزیەکی چاك دەبێت کە تایبەت بۆ ئەوە ئەیخوێنێت کە چاودێری وردی ئەو نوسینانە بکات کە دژ بە ئیسلام و موسوڵمانان ئەنوسرێن، وەك پێغەمبەری خوا ئەفەرموێ (من تعلم لغه قوم امن مکرهم) هەرکەسێك زمانی میللەتێکی تر فێر ببێت ئەوە لە فرت و فێڵ و پیلانیان بە دوور دەبێت.

ئەو مامۆستاو کەسایەتیانەی کە ڕۆڵی گرنگیان بینیوە لە پێگەیاندنی ئەنوەر لجوندیدا بریتی بوون لە دوو کەس یەکەمیان (ئیمامی بەننا) و ئەوی تریان (شێخ فخرالدین)ناوێك کە هیچ زانیاریەك دەربارەی ئەم دووهەمەیان نی یە و نازانرێت کێ بوە، ئەوەندە نەبێت مامۆستا ئەنوەرلجوندی خۆی دەربارەی ئەم شیخ فخرالدینە ئەفەرموێ: (لە قۆناغی گەشە کردن و دروست بوونمدا پیاوێکی بەرێزم ناسی کە

ئاراستەی فیكرمی بە تەواوی گۆڕی و كردمیە خاوەنی فیكرێكی رەسەن و میتۆدێكی راست و دروست بەتایبەت لەو نوسینانەدا كە لە رۆژنامەكاندا بە گشتی و لە رۆژنامە ئیسلامیەكاندا بەتایبەتی بلاّوم ئەكردنەوە كە تا ئیستاش هەر بەردەوامم لەسەری) ئەم پیاوە گەورەیە هەر ئەوەندە لە ژیانی ئەزانرێت بەلاّم ئەوەندە بەسە كە بیرمەندێكی گەوری وەك ئەنوەرلجوندی ئەم شایەتیەی بۆ بدات و خۆی بە قەرزاری ئەو بزانێت وئەبێ ئێستا ڕۆحی چەندە بەختەوەر بێت كە بیرمەندێكی گەورەی وای خستبێتە سەر فیكری ڕەسەنی ئیسلامی.

بەلاّم مامۆستا حەسەن البنا كە پیاوێكی بەناو بانگ و رێبەرێكی ئیسلامی گەورەیە مامۆستا ئەنوەر لجوندی سێ كتێبی لەسەر نوسیوە كە یەكەمیان لەسەرەتای گەنجێتیدا لەسەری نوسیوە بە ناوی (الاخوان المسلمون فی میزان الحق) پاشان كتێبێكی چڕ تر و زانستی تری لەسەر نوسیوە بە ناوی (قائد الدعوه...حیاه رجل وتأریخ مدرسه) سێیەمین كتێبی دەربارەی ئیمامی بەننا بریتی بوە لە (حسن البنا...الداعیه الامام و المجدد الشهید) كە كتێبێكی گەورەی شەشسەد لاپەڕەییەو لە تەواوی ژیانی ئەو مامۆستا بەرێزەی كۆڵیوەتەوە و سەرسامی خۆی دەربریوە بەرامبەر خۆی و فیكر و بەرنامەی كاری و ئەو قوتابخانە ئیسلامیەی كە ئەو خشت خشت پێكەوەی ناوە.

ئیمامی بەننا هەر لە قۆناغی گەنجێتیدا دەستی گەشتە مامۆستا انور الجوندی و بۆی دەركەوت كە ئەم گەنجە گەوهەرێكی گرانبەهایە و پێویستە ئاراستەی تەواو بكرێت... دكتۆر یوسف القرضاوی ئەفەرموێ (ئیمام حەسەن بەننا بوو كە هانی مامۆستا ئەنوەر الجوندی دا دەست بداتە قەڵەم و بنوسێت، لەسەفەرێكی فەریزەی

حەجدا لە خزمەتی ئیمام بەننا دەبێت و پێ دەڵێت: خورپەیەك بنوسە دەربارەی ئەم گەشتەمان، کە لە پاشاندا خورپەکەی بۆ ئەخوێنێتەوە سەرسام ئەبێت پێی و هانی ئەدات بۆ (نوسینی مەنهەجی)، محمود خلیل ئەڵێت: (ئیمام بەننا پێشنیاری نوسینی (مقدمات العلوم و المناهج) ی بۆ ئەکات تا ببێتە توێشویەکی تەواو بۆ بەرەی یەکەمی بزافی ئیسلامی لە میصر بەتایبەتی و لە هەموو دوونیادا بە گشتی) کە زانایەکی وەك محمود خلیل راست ئەڵێت: "کاری لەو شێوەیە بە دامەزراوەیەکی گەورەش ناکرێت".

محمود خلیلی نوسەرو هاوڕێ مامۆستا ئەنور الجوندی قەناعەتی وایە ئەنوەر الجوندی (پاسەوان و ئەمینداری یەکەمە بۆ فەرهەنگ و ڕۆشنبیری ئیسلامی) بە درێژای چوار بەرەی یەك لە دوای یەکی ڕابوونی ئیسلامی وەك ئەڵێت:(کان انور الجوندی بحق هو الامین الاول علی الثقافة الاسلامیة لاربعة اجیال متعاقبة، جیل البناء والتاسیس، جیل الصبر والجهاد، جیل التکوین و الانتشار، جیل التربیة و المستقبل).

## خاڵەکانی وەرچەرخان لە ژیانی ئەنور ئەلجوندیدا:

ئەنوەر لجوندی خۆی ئەفەرموێ: (من لە ناوچەرگەی روداوە گەورەکانەوە هاتومەتە دەرەوە: بۆ نمونە لە ساڵی ١٩١٧ زاینیدا لە دایك بووم کەساڵی پەیمانی (بلفۆر) بوو (تێیدا بڕیارێکی نێودەوڵەتی درا بۆ دامەزراندنی قەوارەیەکی نامۆ کە ئیسرائیلە لە لەشی دونیای ئیسلامیدا)، لەسەردەمی گەنجێتیشمدا کە ساڵی ١٩٢٤ بوو خیلافەتی ئیسلامی روخێنرا و ئەوە بوو پاش ماوەیەك مارکسیەکان لە میصردا دەستیان کێشا بەسەر دەزگاکانی ڕاگەیاندندا، پاشان گلان و ئاشبەتاڵی ساڵی ١٩٦٧ ڕویدا (ئیسر ائیل زەوی پێنج دەوڵەتی عەرەبی داگیر کرد کە سینا لە میصر و جولان لە سوریا وکەرتی ڕۆژئاوا لە ئوردن و مەزارعی شەبعا لە لوبنان و قدس لە فەلستین بوو) داگیرکردنی

قودس فاکتەرێکی زۆر گەورە بوو بۆ گەڕانەوەی خەڵکی جارێکی تر بۆ لای خوا و بۆ لای ئیسلام، وە ئەوەش وا ئەخوازێت کە دەستی ئەم ڕابوونە ئیسلامیە بگیرێت و بەرەو ڕوشدی فیکری ببرێت و ئەم کارەش هەموو بیر و بیرکردنەوەی منی داگیر کردوە).

## ئاستی فیکری و زانستی ئەنوەر لجوندی:

ئەنوەر لجوندی دەرچووی زانکۆی ئەمریکییەو ئینگلیزیزانێکی بەتوانایەو ئەوەی چنگی کەوتبێت لەسەرچاوەی بێگانە خوێندیەتیەوە و خوێندنەوەی بۆ زۆرێک لەو کتێب و وتارانە کردووە کە دەربارەی فیکری ئیسلامی و مێژووی ئیسلامیو بیری ئینسانی نوسراوە.

خۆی دەڵێت:(لەدارالکتب)دا لیستی زیاد لە دوو ملیون کتێبم خوێندۆتەوە و چەندین نامیلکەشم لێدروست کردوون، نێوەڕۆکی (فەهرەست)ی هەموو گۆڤارە گەورەکانی وەك (الهلال) و (المقتطف) و (المشرق) و (المنار) و (الرسالة) و (الثقافة)خوێندوەتەوەو سەرباسی هەندێ لە بابەتەکانیانیشم لای خۆم تۆمار کردووە بەدرێژای (بیست ساڵ) ڕۆژنامەی "الاهرام"مم نەبواردووە و خوێندنەوەم کردووە بۆ (المقطم) و (المؤید) و (الهوا) و (البلاغ) و (کوکب الشرق)و (الجهاد) و چەندین گۆڤاری تریش.

هەروەها دەیان گۆڤارو بلاوکراوەی ترم خوێندوەتەوە کە لەو وڵاتی ئێمەدا و لەم سەدەیەدا هاتونەتە بەر دیدی خوێنەران،هەموو ئەو خوێندنەوەو بەدوادا چونانەم بۆ ئەوە بوە سەرکەوتوانە بابەتێکی دیاریکراو لەکاتێکی دیاریکراودا بنوسم)!!!

گەر ئەمەی کردبێت بۆ نووسینی کتێبێك یان ڕاستکردنەوەی بابەتێك ئیتر ئاساییە کە نوسینەکانی ئەو قوڵیەو هەمەلایەنیەی هەبێت.

## سەرەتاکانی نووسینی:

ئەنوەرلجوندی کە دەستی قەڵەمی گرت، یەکەمین کتێبێك کە نووسی بریتی بوو لە (مصابیح علی الگریق) کە کتێبێکی ئەدەبی بوو ئەوکات هێشتا تەمەنی لە ٢٠ ساڵ تێنەپەراندبوو، بابەتی ئەم کتێبە بریتیە لە بەرگریکردن لە بەها جوانەکانی لادێکەی خۆی و لادێکانی میصر و تێدا باسی ئەوە ئەکات پێویستە پارێزگاری لەو بەها جوانانە بکرێت.

زۆری نەبرد کتێبێکی تری نوسی بە ناوی (أخجوا من دیارینا) کە مەبەستی بوو بە داگیرکەری بەریتانی بڵێت: لە ولأتەکەمان بچنە دەرەوە و دەست وەرمەدەنە کاروبارمان و ئاژاوە مەخەنە ناو ماڵ و منالّمان، دەستەلأتی ئینگلیزی ئەو کات کە حاکمی راستەقینەی میصر بوون کەوتنە بازارو کتێبخانەکان و هەموو نوسخەی کتێبەکەیان کۆکردەوە و یاساغیان کرد بفرۆشرێت و ئەنورلجوندی لاویشیان دەستگیر کرد خستیانە بەندینخانەو چەند مانگێکی تێدا بەسەر بزد.

ئەنورلجوندی فەلسەفەی لە ژیاندا ئەوە بوە (ووشەی جوان و ڕاستی هەر سەر ئەگرێت با پاش ماوەیەکیش بێت).

ئەنوەر لجوندی کە کتێبی (وجهه الاسلام) ی (جیب) رۆژهەڵأتناسی خوێندەوە کە ڕاو سەرنجی کۆمەڵێك رۆژهەلاتناسی دەربارەی ئیسلام باسکردوەو ڕێژەو قەبارەی ئەو پیلانە ترسناکەی بینی ئەچێنرێت بۆ ئەم دینە دائەچڵەکێت و دڵ و فیکری قەڵەمەکەی پێکەوە گڕیٚ دەگرن و بڕیار ئەدات کە خۆی و ژیان و فکری وەقف بکات بۆ ئەوەی بەربگرێت لەو پیلانە ترسناکەی کە رۆژهەڵأتناسان کاری بۆ دەکەن.

مامۆستا ئەنوەرلجوندی خۆی لەم بارەیەوە ئەفەرمویٚ: ژیانێکی هێمن و ناسکم ئەگوزەراند کە ڕووبەڕووی (تحدی)یەکی وا بومەوە ژیانی گۆڕیم بە ژیانێکی زۆر قوڵی هەمە لایەنە، دوو شتی سەرەکی بوونە هۆی ئەوەی ڕوو لە جۆری ژیانە بکەم و هەر

ئەو دوو شتە بوو کە (گەردنگیری) و (ترسناکی) و (کارکردنی) تێدا دروستکردم تا باز بدەم بەسەر ڕووداوەکاندا:

یەکەمیان بریتی بوو لەو کتێبەی کە پێنج کەس لە ڕۆژهەڵاتناسان دەربارەی ئیسلام نووسیبوویان یان کە (هاملتۆن جیب)ی پێشەنگیان ئەو بیرۆکە زۆر ترسناکەی ڕاگەیاند کە چەند ساڵە ڕۆژهەڵاتناسان کاری لەسەر دەکەن کە ئەویش بریتی یە لە (ئیحتیواکردنی ئیسلام) واتە هەڵکوڵینی ئیسلام لەناوەوە کە بریتی یە لە هەوڵدان بۆ ئەوەی ئیسلام بکەنە دینێکی ڕۆحی و قۆرخی بکەنەوە لەوەدا کەتەنیا بریتیە لە نوێژو چەند عەقیدەیەکی شەخصی وە هیچ پەیوەندیەکی بە کارو باری کۆمەڵگە و سیاسەت و ئابوریەوە نییە و پێویستە دوور بخرێتەوە لەو بوارانە، ئەم پێنج ڕۆژهەڵاتناسە کتێبەکەشیان لە هەموو وڵاتانی ئیسلامی دا بڵاو کردوەتەوە لە (مغریب)ە وە تا (ئەندۆنیسیا) کتێبەکە تەرجەمە کراوە بۆ زمانی عەرەبی بە ناوی (وجهە الاسلام)... ئەم کتێبە فکری هەموو داگیر کردم بە ڕادەیەك بڕیارمدا لەگەڵ دڵسۆزانی تردا پەلاماری ئەم پیلانە بدەم بەڵام بیریشم ئەکردەوە کە چۆن و لە کوێوە دەست پێبکەم، منێك کە ڕێژەیەکی کەم ڕۆشنبیریم پێ هەیە.. بۆیە پێوستە باش بیر لەم ڕوبەڕو بونەوەیە بکەمەوە پێش دەستەو یەخە بون لە گەڵیدا.ئەم خولیاو خەیاڵە ئەوەندە سەرقاڵی کردم هیچ بوارێکم بۆ نەمایەوە کەکارێکی تری تێدا بکەم و ئەو هەستەم لادروست بوو کە ئەبێت شان بدەمە ژێر ئەمانەتی ڕاگرتنی ئەم هێرشە ترسناکە بۆسەر ئوممەتی ئیسلامی، بۆیە دەستم کرد بە چاوخشاندنەوەیەکی تەواو بەبنەماکانی فیکری ئیسلامیو بەرنامە و مێژووی ئیسلامدا، سەر لەنوێ خوێنەوەیەکی وردم کرد بۆ مێژووی ئەم ئوممەتەو لەبەرانبەر ئەو قۆناغانەدا ئەوەستام کەتیایدا شەڕی پێ فرۆشراوە بە ئیسلام و ئەو شەڕو هەڵمەتانەش چۆن ڕاگیراوە بەچەکی(قورئانی پیرۆز)و (سونەتی پیغەمبەر)(ﷺ) و(ژیاننامە شیرینەکەی).

دووەمیان/ کتێبێکی تر بوو کەهی نوسەرێکی موسوڵمانی ناشنام بوو، بەناونیشانی (کیف صححت اسلامی)،ئەم کتێبە بەروونی ئەوە دەردەخات کەئیسلام تەنها دینێکی رۆحی و عیبادەتی نیە بەلکو بریتییە لە بەرنامە بۆ هەموو ژیان وپێویستیەکی تێرو تەواوە بو کومەلگە مروییەکان، عەقیدەو عیبادەتیش بەشێکە لە ئیسلام نەك تانو پۆی ئیسلام بێت، ئەوەم بۆ روون بویەوە کە ئەمرۆ زۆریەی موسوڵمانان بەو شێوەیە بۆ ئیسلام ئەڕوانن کە رۆژهەڵاتناسان و مژدەدەران وکلکە کانی روژئاواباسی دەکەن و کاری بۆ دەکەن و هەوڵ ئەدەن ئیسلام تەنیا بەندی ناو نوێژەکان و مزگەوتەکان بێتو بەتەواوی دوری بخەنەوە لەکایەکانی سیاسەت و ئابوری و کومەڵناسی و کاری پەروەردەکردن.

بەم شیوەیە بوم دەرکەوت راستی بانگەوازی ئیسلام چی یە وئەم بیرۆکەیەی تریش کە هەندێ لە هەڵقە لەگوێکانی رۆژئاوا ڕەواجی پێ ئەدەن.

هەر لەو کاتەوەی کە لەشەڕەکانی خاچ پەرستیدا قەشەلویسی (نۆیەم)بەدیلگیراو لەنزیکەوە بۆی دەرکەوت دینەمۆی شۆڕشەکانی موقاوەمەت بریتییە لەئیسلام، بۆیە بریاریدا هێرشی سەربازی رابگرێت و بانگەشە بۆ جۆرە هێرشێکی تر بکات کەبریتییە لە(شەڕی وشە)کەبەوە دەبێت چەمکی ئیسلامەتی لارو خوار بکرێت و بکرێتە دینیکی لاهوتی و ببرێتە ریزی ئەو دینانەی کەدەستیان تێخراوەو بەدەستی مرۆڤ دانراون.

ئەم پیلانە سەری لەوەوە دەر دەکرد کەبنەماکانی ئابوری و پەروەردەو سیاسەت هەموو لە بازنەی ئیسلام دەربهێنرێت و چەمکی (عەلمانیەت)بەرز ڕابگیرێت و پیرۆزی پێ بدرێت ! !.

چالەو ڕۆژەوەو دروست لەساڵی(۱۹٤۰)ەوە، هاتمە سەر ئەو بریارەی کە پێویستە بگەڕێم بەدوای ڕەگ و ریشەی ئەم نەخشانەدا(ڕۆژهەلاتناسان، مژدەدەران، هێرشی فکری، غەربزەدەیی....تالەو توێژینەوانەوە بگەمە کێشە سەرەکیو گەورەکە کە بریتی یە لە (ڕاستکردنەوەی چەمکەکان)، دەساڵی تەواو هەرچی دۆسیەکانی دار

الكتب و گۆڤار و روژنامەكان هەیە هەمویم خوێندەوە،لەبەر ئەوەی پێوست بوو بزانم رەگ و ریشەکانی ئەم هێرشە دڕندانەیە لە کوێوە هاتوەو چۆن دەستیان پێ کردوە، چونكە رۆژنامەو گۆڤارەكان لەگەڵ رووداوەكاندا ئەژیان هەر لەكاتی داگیر كردنی ئینگلیزەوە تا ئەمرۆ.

پاش ئەم خوێندنەوە زۆرە مامۆستا ئەنوەرلجوندی دەستی دایە نوسینی جدی دەربارەی ئیسلام و گەورەیی ئیسلام هەروەك خۆی ئەفەرمێ (كانت اعمالي قائمة اساسا على التعريف بعظمة الاسلام و تأريخه وتراثه وتقديم صورة الامة الاسلامية في مجال عظمة تاريخها و امجادها وكان هذا مفهومي للدعوة الاسلامة) ئەمە وای کرد کە دوو جۆر كتێب بنوسێ: جۆرێكیان باس لە گەورەی بەرەی یەكەمی ئیسلامەتی بكات و چوار جەڵد كتێبی بۆ نوسی بە ناوەكانی (الشرق في فجر النهضة) و (الاسلام تاريخ و حضارة) و(صور مضيئة من التراث) و (نوابغ الاسلام) جۆرێكی تر لە كتێب كە باس لە گەورەیی بەرەی هاوچەرخ بكات لە ژێر ناونیشانی (اعلام القرن الرابع عشر الهجرى) كە چوار جەڵدیشی لەمەیان نوسی بە ناونیشانی (اعلام الدعوه والفكر) و (تراجم الاعلام المعاصر)، (اعلام واصحاب الاقلام) و (اعيان البيان و اللغه)....هەروەها دەستی دایە نوسینی كتێبی (مصابيح التراث والعصر).

ئەم دوو زنجیرە لەو دوو زنجیرەیە دەچێت كە ڕێخستنە ئیسلامیەكان لە ساڵەكانی هەشتاكاندا بە دەستنووس دەریدەكردن لە ژێر ناونیشانی (زنجیرەی ناودارانی ئیسلام) و (زنجیرەی هەڵكەوتوانی ئیسلام)دا.

مامۆستا ئەنوەرلجوندی لە سەرەتای نوسینەكانیەوە هەموو تەركیزێكی لەسەر ئەوە بوو كە (گومان و پلانەكان) وەڵام بداتەوە تا ساڵی ١٩٨٠ و دوای ئەو ساڵانە دەستی دایە تەرشیدی صحوەو نوسینی (بەرنامە ریشە دارەكان) و (المناهج التفاصيليه) كە خۆی پێ خۆش بوو ناوی بنرێت (البدائل الاسلاميه).

كۆتا كتێبی ئەنوەرلجوندی بریتییە لە كتێبی (نجم الاسلام لا يزال يصعد).

ئەنوەرلجوندی پاش ژیانێکی پڕ سەروەری و پڕ هەژاری و بێ کەسی (!!!) لە ڕۆژی ٢٠٠٢/١/٢٨ ڕۆژی دووشەمە ئەم دونیای فانیەی بەجێهێشت و گیانی گەڕایەوە بۆ لای پەروەردگاری و کۆتای بە ماندوویونی دنیای هات و پاش خۆی کتێبخانەیەکی گەورەی بە جێهێشت کە بەراستی شایەتی ئەوەی بۆ ئەدەن کە پیاوێکی بلیمەت و تا ئەوپەر خوێنەوار بوە و موسوڵمانێکی هەستیار و زۆر وریا بوە، پاسەوانێکی چاوکراوە بوە لەسەنگەرەکەی خۆیدا، خشپەیەك، تارمایەك، جوڵەیەك... کەوتبێتە بەرچاوی خێرا سەرچاوەی ئەو شتەی دۆزیوەتەوەو زەنگی ترسناکی لێداوەو سەربازگەی موسڵمانانی بەخبەر هێناوە بۆ ئەوەی غافڵگیر نەکرێن.

## هەندێك لە ڕەوشتەکانی مامۆستا ئەنوەرلجوندی:

هەرچەندە وەك پێویست ژیانی ئەم مامۆستا بلیمەتە تۆمار نەکراوە بەڵام چەندین زاناو نوسەری گەورە گەورە هەریەکەیان لە گۆشەیەکەوە ڕەوشتێك لە ڕەوشتەکانی ئەم پیاوەی باس کردوە:

دکتور یوسف القرضاوی ئەڵێت: مامۆستا ئەنوەرلجوندی پیاوێکی دونیا نەویست بوو بە دوای بریق و باقی دونیادا نەدەگەڕا، زۆر قانع و سوپاسگوزار بوو... هەموو ئاوات و حەزەکانی لە سێ شتدا کۆ بوو بویەوە، بخوێنێت و بنوسێت و ئەو نوسینانەش بڵاو بکاتەوە، وەك ئەو پیاو چاك وزانایە بوو لەناو (سلف)دا کە پرسیاریان لێ کرد: کامەرانی خۆت لە چیدا ئەبینیت؟ فەرموی: (کامەرانی لەوەدایە بەڵگەیەك ببینی کە خۆی بنوێنێ و گومانێك ببینی کە لە سەر شۆڕیدا کز کز ئەکوژێتەوە!!

تیمێکی تەلەفزیونی ویستیان بەرنامەیەکی پێ تۆما بکەن بۆ تەلەفزیون، پاش ئەوەی کە چونە ماڵەوە بۆ لای لە خانوەکەیدا شوێنێکی گونجاوی وایان نەدۆزیەوە کە چاوپێکەوتنەکەی تێدا ئەنجام بدەن لەبەر کۆنی و پەرش و بڵاوی کتێبەکان بە ژورەکاندا، ناچار پێشنیاری ئەوەیان کرد کە لە یەکێك لە میوانخانەکانی شاردا ئەو چاو پێکەوتنە تۆمار بکەن، مامۆستا ئەنوەرلجوندی فەرموی: ئێوە بڕۆن، منیش پاشان دێم. وتیان: جا چۆن سەیارەکەت لەم کۆڵانە جەنجاڵانەدا دەر ئەکەیت؟

فەرموی: سەیارەم پێ نیە بە پاص دێم بۆ میوانخانەکە... تیمە تەلەفزیونیەکە زۆر تەریق دەبنەوە کە پیاوێکی بلیمەتیوا ئەوەندە هەژار و کەمدەستە، بۆیە پاش ئەوەی بەرنامەکە تۆمار دەکەن بەڕێوبەری مونتاژ لە زەرفێکدا بڕێك پارە ئەداتە مامۆستا ئەنوەرلجوندی و ئەڵێت: ئومێد ئەکەم جەنابی مامۆستا ئەم مەبلغە کەمەمان لێ وەربگرێ وەك دیاریەك هەرچەند شایان بە جەنابیشتان نیە. سەیر ئەکەن مامۆستا ئەنوەرلجوندی پارەکە وەرناگرێ و ئەفەرموێ: من کە چاوپێکەوتنم بۆ ئەنجامداون نیازم نەبوە بە پارە قسەتان بۆ بکەم ئامادەش نیم نیەت و نیازم بگۆرم، پاشان من چ شتێکی وام کردوە تا شایانی ئەوە بێت خەلآت بکرێم! چەند ئەوان مکوریان کرد لەسەر داواکەیان ئەم هەر قەبوڵی نەکرد و دەستی برد تەوقەی لە گەڵدا کردن و خوحافیزی لێ کردن، ناچار بە سەیارەکەی خۆیان گەیاندیانەوە بۆ ماڵ و ناو کتێبەکانی!!! ئەمە وای کرد کە عبدالسلام بسیونی ئەدیب و رۆژنامەنوس ئەم هەڵوێستە تۆمار بکات و بە درێژی بۆ مێژوو بڵێت.(وأوصلناه و نحن في حياء منه ومن تواضعه و ورعه ونحن ايضا في خجل من انفسنا وحرصنا على الراحة و الكشخة!!!)

ئەنوەرلجوندی خۆی ئەڵێت: لە ژیانمدا بە دوو لێقەومانی گەورەدا تێپەر بووم، یەکەمیان دامەزراندنم لە بانکی سو خۆریدا و دووهەمیان کارکردنم لە ناو رۆژنامەگەریدا، بەلآم سەبارەت بە بانك ئەوە ئەوپەری هەوڵم داوە کە دوریم لەبەشی ژمێریاری سوخۆری و هەوڵم هەر ئەوە بوو کە تەنیا لە بەشی بازرگانیدا کار بکەم و لەگەڵ ئەوەشدا زۆر ئەترسام و زۆر خۆشم ئەپاراست لەو ترسەی کە توشی حەرامێك ببم، هەمیشەش مامەڵەی پاك وبێ غەل و غەشم ئەکرد و باسی ئیمان و پارێزکاریم بۆ چواردەورەکەم ئەکرد و پێم ئەوتن ئێمە وەك ئەو کەسە واین کە ناچارە لە ناو ترسناکیەکدا ژیان بگوزەرێنێ بۆیە پێویستە هەمیشە چاوی بەسەر سەرچاوەی ترسناکیەکەوە بێت و لێی غافڵ نەبێت و بەردەوامیش دوعا بکات خوا رزگاری بکات

لەو ترسناکیە، وکە گواستیشمەوە بۆ ناو ڕۆژنامە گەری، ڕاستە سەرەتا ڕۆژنامەگەرییەکی ئیسلامی پاك و بێ غەل بوو، بەڵام پاشان بوو بە ڕۆژنامەگەریەکی حزبی و سیاسی، من زۆر خۆم لەوە ئەپاراست کە نەیەڵم ئەو ڕۆژنامە گەریە قوتم بدات بۆیە سەرەتا هەر ئەو لاپەڕانەم ئەگرتە ئەستۆ کە بابەتی ئەدەبی بوون، پاشان تەنیا ئەو لاپەڕانەم ئەگرتە ئەستۆ کە کاروباری ئیسلامی بوون، لە بواری ڕۆژنامەگەریدا توشی سەختیەکی تریش بووم ئەویش ئەوە بوو کارم کەوتە لای مارکسیەکان و بە فەزڵی خواوە توانیم باز بەسەر هەموو فریدانەکانیاندا بدەم و دەست بەهەموو هۆکارێکی ژیانی پڕ عەیش و خۆشی بنێم و (دە) دانە ساڵم بەڕێکرد لە گەڵیاندا یەك خەلات چیە بۆم نەهاتەوەو تاکە دڵخۆشی خۆشم بەوە ئەدایەوە کە من خۆم بۆ بەرهەم هێنانی پرۆژەیەکی فیکری گەورە ئامادە ئەکەم و ئەمەویَ یەکلا ببمەوە بۆی؟

ئەنوەرلجوندی پیاوێکی تا بڵێ بە دین و صالح بووە، خواناس و خوا پەرست بووە، کچە تاقانەکەی ئەڵێ: باوکم هەمیشە حەزی ئەکرد دەستی بە دەست نوێژ بێت تەنانەت بۆ نانخواردنیش حەزی ئەکرد بە دەستی بەدەستنوێژەوە نان بخوات و بە دەستی بەدەستنوێژەوە بنوسێت و دوای عیشا ئەخەوت و پێش فەجر هەڵئەساو شەو نوێژی ئەکرد تا بانگی بەیانی.پاشان ئەچوو بۆ مزگەوت و نوێژەکەی بە جەماعەت ئەکرد و دووسەعات دوای نوێژی بەیانی ئەخەوت و پاشان هەڵئەسا هەندێك لە ئیش و کارەکانی ماڵەوەی بەدەستی خۆی ئەکرد، حەزی بە خزمەتکردنی دەرودراوسێ بوو و دەبەودەفەرەکانی بۆ پڕ ئاو دەکردن و ئەیبردە بەردەم ماڵەکانیان و دای ئەنا، چەند جاریش نانی گەرمی لە بازار بۆ ئەهێنانەوە...مامۆستا ئەنوەرلجوندی غەریقی ڕەحمەت بێت سوودی زۆری لەم نوێژی بەیانیانە ئەبرد، ئەوەتا خۆی ئەفەرموێت:(تعلّمت من مدرسه صلاه الفجر الایمان العمیق وحبّ النّاس والحرص علی مساعدتهم)

ئەنوەرلجوندی پیاوێکی کەم دووبوە، بەلاّم قەڵەمەکەی هەمیشە خەریکی قسەکردن بوو...دکتۆر یوسف القرضاوی ئەڵێت:جارێکیان پێم وت: ئەری باشە جەنابت ئەوەندە خوێندوارو رۆشنبیری بۆچی ناچییتە سەر مینبەر و قسە بۆ خەڵکی بکەیت؟ فەرموی: من خوا یەك پیشەی پێ داوم و هەر ئەوەش ئەزانم ئەویش بریتیە لە پیشەی قەڵەم گرتن و نوسین! ! رانەهاتوم وتار بدەم و رووبەرووی خەڵکی رابوەستم و قسە بکەم، وتم: ئاخر خەڵکی مافیان بەسەر تەوە هەیە کە لەو هەموە فەرهەنگ و زانستە بەشیان بدەیت، وتی: خوا تەنیا ئەم چەکی قەڵەمەی بە من داوە بەلاّم چەکی قەڵەم و دەمیشی بە تۆ و بە محمد الغزالی داوە ئەوەش فەزڵی خوایە و بیەوێت بیدات بە هەر کەسێ پێی ئەدات.

## کۆتا رۆژەکانی ئەنوەرلجوندی

مامۆستا ئەنوەرلجوندی وەك دکتۆر یوسف قرضاوی ئەگێرێتەوە و دەربارەی ئەڵێت: مامۆستا ئەنوەرلجوندی لە ساڵەکانی کۆتایی ژیانیدا زۆر بێ کەسانە ئەژیا و کەوتە سەر جێگە و گرێی خەم و خەفەتەکانی تەنیا هەر لای خوای خۆی ئەکردەوە، هەروەك چۆن یعقوب تەنها هەر هانای بۆ لای خوا ئەبرد و شکاتی حاڵی خۆی و بێ مەیلی خەڵکی هەر لە لای پەروەردگاری ئەکرد، چەند ناخۆش بوو کە لەو قۆناغە هەستیارەی تەمەنیدا هاوەڵێك، ناسیاوێك، وەك پێویست لێی نە ئەپرسیەوە؟؟؟ جا دکتۆر قەرزاوی ئەڵێت: زۆر ئەم شیعرەی ئیمامی عەلی ئەوتەوە کە ئەڵێت:

ولا خـــير في ود امرئ متلـــون　　اذا الريح مالت مال حيث تميل

جواد اذا استغنيت عن اخذ ماله　　وعند زوال المـــال عنك بخيل

فما اكثر الاخوان حين تعدهـــم　　و لكنهـــــم في النائبات قليل

پاشان دكتۆر قەرزاوی ئەڵێ: ماوەیەك پێش مردنی كچە تاقانەكەی لە قاهیرەوە پەیوەندیەكی پێوە كردم و سەلامی باوكی پێ گەیاندم و كە كەوتوە لە جێگەدا و لە پێ كەوتوە، خەریكە بڵێم نە كەس ئەبینێت و نەكەس هەواڵێكی ئە پرسێت! لەگەڵ ئەو هەمو بەرهەمەیدا، ئەم وشانەی وەك تیرێك جەرگی بریم و دڵم بۆی پڕ بوو وتم سلامم بە جەنابی باوكت بگەیەنە و دوعای خێریشم بۆی هەیە و داواكارم خوای گەورە شیفای بدات و خوا یار بێت لە فرسەتێكی نزیكدا سەردانی ئەكەم و دێم بۆ میصر بۆ لای، ئەوە بوو نامەیەك و سكرتێر ی تایبەتی خۆم كاك عصامم نارد بۆ لای تا بەڵكو سەلام و ئەحواڵپرسینی منی پێ بگەیەنێت و لە ئازارەكانی كەم بكات، كچەكەی پاش ئەو سەردانەی تەلەفونی بۆ كردم وتی باوكم زۆر زۆر سوپاسی نامەكەتی كردوە و وە لێت نەشارمەوە كە نامەكەتمان بۆ خوێندەوە دەستی بە گریان كرد بۆ نامەكەو ئەوەشی لەگەڵ نامەكەدا بوو، وتم: جا دادەگیان من جگە لە ئەرك وەزیفەی خۆم هیچی ترم كردوە؟ منیشی و خەڵكێكی تریش هەموو قەرزاری باوكی تۆین و هەموو ئومەتی ئیسلامیش قەرزاری باوكی تۆیە و ان شاالله لە زوترین فرسەتدا سەریش ئەدەم لێدتان...كەچی قەدەری خوا زۆری نەبرد فەوتی كرد ورێنەكەوت بە خزمەتی ئەو مامۆستا پایە بەرزەم بگەم بۆ كۆتا جار... خوا لێیخۆش بێت و لە ریزی سالحاندا وەریبگرێت و لە جیاتی ئێمەو هەموو ئومەتی ئیسلامی باشترین پاداشتی بداتەوە بە راستی مامۆستا ئەنوەرلجوندی یەكێكە لەو زانایانەی كە ئەتوانی بڵێی فقیهێكی ئیسلامی و مێژوونوسێكی موسوڵمان و عارفێكی گەورە و بیر مەندێكی بلیمەت و زاهیدێكی كەم وێنەو خوێندەوارێكی مەوسوعی بوە و بە كەمترین خوێندنەوەش بۆ كتێبەكانی، ئەو راستیانەت بۆ ئەسەلمێت.

مامۆستا ئەنوەرلجوندی ئەوەندەی كتێب نوسیوە ئەتوانی بڵێت كتێبەكانی ئەو بەسە بۆ هەر كەسێ كە بیەوێت تویژینەوە لە ئیسلامدا بكات یان بیەوێت بە

بەرنامەیەك خزمەت بە ئیسلام بكات، ئەگەر خوا یار بێت هەر لە سۆنگەی ئەم گۆڤارەوە جاری نا جارێك خوێندنەوە بۆ کتێبەکانی ئەنوەر لجوندی بلیمەت ئەکەین و وادەی ئەوەش ئەدەین کە دەست بکەینە پرۆژەی وەرگێڕانی نوسینەکانی بۆ ئەم بەرە ئیسلامیەی کە لە کوردستاندا دروست بوەو هیچێکی وا لە کەلە پوری زاناو پیاوە گەورەکانی خۆی نازانێت.

# دەروازە:

پێش کۆتـایی هـاتنی دەیـەی یەکـەمی سـەدەی یـانزەی کۆچـی ئومـەتی ئیـسلامی پێویست بوو هەڵوێستی خۆی بەتـەواوەتی بەرامبـەر بـیری ڕۆژئـاوا و ژیـاری ڕۆژئـاوایی یەکلا بکاتەوە دوای ئەوەی بە چەندین قۆناغ دا لەگەڵ بیرو ژیـاری ڕۆژئـاوادا هـەنگاوی نا، دیارترینیان دواکەوتن و شوێنکەوتنی و دواتریش گەڕانەوە بۆ خـود و چـوونەوە بـۆ سەرچاوەکان و ئاشکراکردنی گەندەڵی بیردۆزەیی و هەواداریی و پێویستی ڕزگارکردن و خۆ ئازادکردن. ئەم ڕووداوانەش هۆکار بوون تا موسڵمانان بخەنەوە سەر ڕێی بنـەڕەتی دوای ئەوەی بیرۆکەی هەواداری و شوێنکەوتەیی لەخشتەی بردبوون و لـەو ئەنجامـەش دا شکستێکیان خواردبوو و گەمارۆو تەنگ پێهەڵچنراو کەوتبوون و گـەورەترین مـرواری مێژووی بوونی ئیسلامی خۆیان لەدەست دا کە قودسی جێ سەردانی پێغەمبـەر (ﷺ) قیبلەی یەکەمی مسوڵمانان کەوتە دەست سەرسەختترین دوژمنی مرۆڤایەتی (جولەکە) لە ماوەی سـاڵی ١٩٤٨-١٩٦٤دا گفتوگۆیـەکی زۆر لـە نێـوان مـسوڵمانان دا هـەبوو بـە ڕێبەری کەسە دیار و ڕۆشنبیرەکانیان لەپێناو گەڕانەوە بۆ سەرچـاوەکان دوای ئـەوەی ڕووداوەکان ساختەکاری و لە خشتەبەری گرتنەبەری ڕێی هەواداری و شـوێنکەوتەییان ئاشکرا کرد و پاش ئەوەی هەردوو ئایدۆلۆجیایی لیبراڵی و مارکسی نەیانتوانی ئامانجی باڵا بەدەست بهێنن کـە ئـەویش توانـای گرتنـەوەی خـۆی ویـست و گێڕانـەوەی بـزاڤ و هێنانەوەی ژیار و دامەزراندنی کۆمەڵگا خواناسیەکەی ئومـەتی ئیـسلامی و هـەنگاونان بەرەو گەیاندنی پەیامی پوختی یەکخواپەرستی بۆ جیهانیان و ڕزگـارکردنی مرۆڤایـەتی لەدەست بتپەرستی و تاکەکەس پەرستی و ڕزگارکردنی خەڵك لە تەنگەبەری دنیاوە بۆ فراوانخوازی ڕۆژی دوایی هەر لە سەرەتای پەیامەکانەوە (١٩٤٦) چـاومان لـەو قۆناغانـە بوو. ئیسلام دەکشێ، دارمانی ژیاری ڕۆژئاوای... هتد.

ئینجا قۆناغی دواترهات (بێداربوونەوەی ئیسلامی، کشانی ئیسلامی، ڕابوونی ئیسلامی) ئەمەش دوای ئەوەی لە ساڵی ١٩٦٣و دواتر دا ڕاگەیاندن لەدەست مارکسیەکان کەوت.

زووبەزوو مەترسیەکانی ڕۆژئاواگەری لە نوسینەکانی ساڵانی ١٩٤٧-١٩٤٨ و شاڵاوی هزری ١٩٥٦و دواتر تا ئەمڕۆش ئاشکرابوون.

لەو قۆناغە دوورو درێژەدا (١٩٤٦-١٩٨٦) چەند ڕاستیەکی گەورە ئاشکرا بوون:

یەکەم: شکستی بیری ڕۆژئاواگەرا و بانگخوازانی شوێنکەوتەیی ژیاری ڕۆژئاوایی (طه حسین، حسین نوری، توفیق الحکیم، سلامه موسی، علی عبدالرزاق)

دووەم: شکستی هەوڵی تەنگ پێهەڵچنینی چەمك و واتای ئیسلامی بەلارێخستنی مێژووی ئیسلامی و ژیانی پێغەمبەر(ﷺ) (هیکل، العقاد، طه حسین، الشرقاوی).

سێیەم: ئاشکرابوونی گەندەڵی بانگەواز بۆ زیندو کردنەوەی بیری باتینی و بتپەرستی بانگەوازەکانی قادیانیەت و بەهائی و باتینی.

چوارەم: ئاشکرا بوونی گەندەڵی بانگەواز بۆ ئایدۆلۆجیاکانی مارکسی و لیبراڵی و بوونگەرایی و شیکاری فرۆیدی و بیردۆزەی خوێندنگەی کۆمەڵایەتی نەفس و ئیغلالی دۆرکایم و بیردۆزی بوونگەرایی و جگە لەوانەش.

پێنجەم: دارمانی بانگەشەکانی ڕۆژئاواگەری و شاڵاوی ڕۆشنبیری پەیوەست بە چەمك و واتای ئاینی و لاهووتی و زمانی نەتەوەیی ڕاڤەی مێژووی ئیسلامی بەڕاڤەیەکی ڕەوتی ماددی و شکستی ئەو بیردۆزانەی پەیوەست بە ئەدەب و ڕۆشنبیری و پەروەردە کە لە ڕۆژئاواوە دەهاتن.

شەشەم: دارمانی چەمك و واتای ژیاری ڕۆژئاوایی بانگەشەکەرانی بە زانین قبوڵ کردنی ڕاستی ئەو خراپە و بیرو گەندەڵیەی کە لەخۆی گرتبوو.

حەوتەم: دارمانی چەمك و واتای شیعە سەبارەت بە قبوڵ کردنی چەمك و واتای زانستی ئەزموونی و پەیوەستی بە شێوەی ژیانی ڕۆژئاواییەوە.

ئەوەیەکی تەواوی بانگخوازانی بێداری و ڕابوون لە ئاسۆی بیری ئیسلامی و لەڕێی شوێنکەوتەو هەوادارانیەوە زیاتر لە سەدەیەك بەوردی چاویان لەو چەمك و واتایانە بوو هەر لەو کاتەوەی جەمالەدینی ئەفغانی کتێبەکەی خۆی نوسی (الرد علی الدهريين)و بەدوای ئەوەدا نوسینەکانی موحەمەد عەبدە هاتن (اللاسلام و النصرانية بين العلم ومدنية) و فەرید وەجدی سەبارەت بە بەرپەرچ دانەوەی هەڵمەتەکانی کرۆمەر بۆسەر ئیسلام، هەروەها ڕەشید ڕەزا و موحیبەدین خەتیب سەبارەت بە بەرەنگاربوونەوەی قادیانیەت و بەهائیەت و شاڵاوەکانی موژدەبەرە مەسیحیەکان و ئەمەش لە بانگەوازی ئیسلامی دا بەفراوانی بڵاوبوویەوە. ئەو بانگەوازە ئیسلامیەی کە پێشەوا حەسەن بەنناو کۆمەڵەی ئیخوان و گەنجان و ڕەوشت جوانان هەڵگری ئاڵاکەی بوون. لە بانگەوازی سەلەفیەتیشەوە گەیشتە مەغریب، لە سایەی ئەزهەر و زەیتونە و قورەوبینیشەوە پەلیهاویشت و دواتر گەیشتە کۆمەڵی ئیسلامی لە پاکستان و کۆڕبەندی زانایان لە هیند و ئەندەنوسیاو مەلایۆ لەوپەڕی زەویەوە.

ئەمڕۆش دوای نزیکەی سەدەیەك لەو بەرگریکاریە پێم وایە کاتی ئەوە هاتووە تا بیری نوێگەری ئیسلامی بەهێز و ڕاستاڵ لە بەرەنگاربوونەوەیەکی یەکلاکەرەوە دا بەرامبەر بیرو ژیاری ڕۆژئاوایی بوەستێت. ئەو بەرەنگار بوونەوەش گەندەڵی دیدی فیکری هاتووی ڕۆژئاواو کەمی و دەستەوسانی ئەو بیرە لە بەخشین لە ئاسۆی ئیسلامەوە بخاتە ڕوو، بەڵکو دەستەوسانی ئەو بیرە لە ئاسۆی بیری خۆشیەوە ئاشکرا بکات. ئەمەش دوای ئەوەی بە شکستی دوو ئایدۆلۆجیای لیبڕاڵی و مارکسی ڕۆژئاوا هاواری لێهەڵسا. لە هەمان کاتیش دا بەخشندەیی و توانای ئیسلامە بۆ چارەسەری

کێشە جۆربەجۆرەکانی کۆمەڵگە ئیسلامیەکانی ئەمڕۆ دەرکەوت، بەڵکو توانای ئیسلامە بۆ چارەسەرکردنی کێشە جیهانیەکانیش دەرکەوت.

لێرەوە ئەو هەوڵە دەرکەوت بۆ بەرەنگاربوونەوەیەکی یەکلایی بەرامبەر بیری هاوچەرخی ڕۆژئاوایی (لیبراڵی و مارکسی و صەهیۆنی) بە ڕەگ و ڕیشەی یۆنانی و جولەکەیی و مەسیحیەکانیەوە تا بزانین چۆن هەڵوێستەکانی ئەمڕۆ لەچاو نزیکەی سەدەیەك لەمەو پێش بەشێوەیەکی بەرچاو گۆڕان لە ڕووی دەرکەوتنی چەندین کۆمەڵی ڕۆژئاوایی کە دەستە بە دەستە موسڵماندەبوون، لە سەرووی هەموویانەوە چەند سەرکردەو بیریارێکی ڕۆژئاوایی کە زانیان کە تەنها بە ئیسلام ڕزگار دەبن. ئەوانیش وەك پرۆفیسۆر مۆریسۆن و گارودی و بۆکای. هەر کامە و لە تایبەتمەندی خۆیان دا بە هەمان ئەو ڕێگەیەی کە پێشتر لۆردهۆل و دکتۆر خالید شلدریك و عەبدولکەریم جرماسوس پێیدا ڕۆیشتن سەبارەت بە داننان بە گەورەیی ئیسلام دا توماس کارلین و گۆستاف لۆبۆن و برناردشۆ و درایەر هۆنکە و لە نزیکیشەوە جاك بیرك و ئەلیکس کاریل و مارسیل بواشنا ڕێبەرانی ئەو ڕێڕەوە بوون.

من پێم وایە ئێمە ئێستا لە قۆناغی ئیسالەت و پێگەیشتنێکی فیکریداین کە دەتوانێ بیری هەموو مرۆڤایەتی بگرێتە دەست و لەشوێنی دروستی خۆیدا دابنێ بەو ئیسلامەی کە ڕێبازی بنەڕەتی و دروستی خواییەو توانای هەیە ڕێی مرۆڤ ڕاست بکاتەوە بەرەو لای خوا دوای ئەوەی لە ڕێ لادرا هەر لە سەدەی پانزەی کۆچیەوە تا ئەمڕۆ کە زانستە ئەزموونیەکانی ناو ئیسلام گوازرانەوە و تێکەڵ بە بتپەرستی یۆنانیو ڕۆمانی کران و تێکناڵاو کران بە چەمك و واتای لاڕێ بووی جولەکە و مەسیحیەتێ کە جیا لە ڕێکخستنی پەیامی حەقی خوایی گەیشتە ئەورووپا و دواتر ئەزموونەکە بەرەوتێکی لاڕێ بووی هەڵە لە ڕۆژئاوا دەستپێکردووە دواتریش موسڵمانان هاتن و لەژێر فێڵی هەندێك دا ئەو بەرهەمە بەزیوەیان وەرگرت بە نرخی کالای چاك. دواتر

شەپۆلی دووەمی شاڵاوبەران هات کە هەوڵیان دەدا موسڵمانان بەوە ڕازی بکەن تەنها بە شوێنکەوتەیی تەواو بۆ ڕێباز و ژیاری ڕۆژئاوایی (بە چاك و خراپ و حەز و ناحەز و جوان و ناشرینیەوە) دەتوانن لە تەنگژەی دواکەوتەیی ڕزگاربن.

ئەوەی ڕوون و بێگومانە ئەوەیە ئەو بەرنامە ڕۆژئاوایە سەپێنرا بەسەر موسڵمانان داو موسڵمانان لەڕێی خوێندنگەی (عەلمانیەت)و دادگا (یاسای دانراو) و بانکی سووەوە هەڵیانەبژارد. کاتێ بەرنامەی پەروەردەی ئیسلامی و شەریعەتی ئیسلامی و بەرنامەی هەڵسوکەوتی ئابووری ئیسلامی لەبەرچاو نەما.

ئەزموونە ڕۆژئاواگەراکە هەوڵیدەدا ئیسلام وەك ئاینێکی لاهووتی وێنا بکات کە تەنها پەیوەندی نێوان خواو مرۆڤە لەوپەڕی دووری لە لایەنەکەی دیکە (پەیوەندی نێوان مرۆڤ و کۆمەڵگە) بۆ ئەمەش چەند بانگخوازێ کە مێژەر بەسەربوون بانگەشەی ئەوەیان دەکرد ئیسلام ئاینێکی لاهوتیە و سیستمی دەسەڵات یان سیاسەت یان ئابووری نیە هاریکاری ئەو هەوڵەیان بوون. ئەمەش کارێکی ستەمکارانە و تاوانبارانە بوو کە لەبەردەم تیشکی حەقی ئیسلامە و هاواری ئەو بیریارە موسڵمانە چاکخوازانەدا خۆی ناگرێت کە ئەو دیدەیان ئاشکرا کردووە دواجار بیرۆکەکە گەشەی سەند بۆ بانگەوازێکی سەرپێ کەوتوو بۆ بنیاتنانای تاکی موسڵمان بە پەروەردەی ئیسلامی لەپێناو دامەزراندن و چەسپاندنی حوکمی خواو نیزامە کۆمەڵایەتیەکەی لە خاکی ئیسلام دا.

دواتر بانگەوازی ئیسلامی دەبێت قۆناغەکانی پێکهاتن و بنیات بیرێ و ساختەی پێشنیارە ژەهراویەکان لە ئاسۆی بیری ئیسلامی و کۆمەڵگەی ئیسلامیەوە ئاشکرا بکات تا بگەینە ڕاستیەکی بنەڕەتی کە بریتیە لە بەرەنگاربوونەوەی تەواوی بیری ڕۆژئاوایی و ئاشکرا کردنی ساختەکاریەکانی لە ڕوانگەی چەمك و واتایەکی قوڵ و

بنەڕەتی ناو بانگەواز و نیزامی ئیسلامی کە توانای بەردەوامی ئیسلامە بۆ بوژاندنەوەی لە نێو خۆیدا و لە کرۆکی خۆیدا پێناوەکانی ڕاستکردنەوەی ڕێی پێیە کاتێ ڕێگەکان جیاواز دەبن موسڵمانان واز دێنن لە پەیڕەوی و هەڵدەخەڵەتێن بە هەڵخەڵەتێنەرێ کە ڕێبازێکی نوێی پێیەو پێیان وایە ئەو ڕێبازە پێشکەوتن یان خاوەندارێتی ئیداری یان پێدەبەخشێت یان لەدەست قەڵەمڕەوی زاڵی یەکێ لە هێزە جیهانیەکان ڕزگاریان دەکات. بەڵام ئەگەر وریا بن چاک دەزانن قورئان ڕێی نوێگەری بۆ داناون. ڕێی پێچەسپاوی و سەرکەوتن و دەرچوون لە چەرمەسەری و لە چەند ئایەتێکی ڕوون دا هەن کە بەیانی و ئێواران دەیان خوێنن هەر وەك ئەو سەرچاوانەی بۆ دیاری کردوون کە ئەو بەرنامە ئەزموونیەیان لێ دروست دەبێ کە ژیاری هاوچەرخی دروست کردووە، ڕێبازی مەعریفەی دوولاکە واتای تەواوێتی لە نێو بەهاکان دا و هاوسەنگی نێوان ڕەگەزە هاوتەریبەکانی بۆ دیاری کردووە.

ڕۆژئاوا هەموو هێزی خۆی کۆکردەوە تا بیرو کۆمەڵگەی موسڵمانان تەنگ پێهەڵچنێ لەپێناو درێژەدان بە دەست ڕۆیی و قەڵەمڕەوی خۆی. بۆ ئەو کشانەش بە شێوەیەکی قوڵ و فراوان ئامادەسازی کرد. گەورەترین ئامانجیشی پەروەردە کردنی نەوەیەکی نوێ بوو لە کۆشی ئوممەت دا بەڵام لەسەر چەمك و واتاو بەهاکانی خۆی تا ببێتە بەدیلێك بۆی لە کاتی نەمانی داگیرکاری سەربازی خۆیدا. بۆ ئەمەش لە ڕێگەی موژدەبەرانەوە ئامادەسازی کرد کە بە جلی زانایانەوە دەهاتن بەڵام لەناخیان دا کینەی کڵێسایان بەرامبەر بە ئیسلام پێبوو و ڕێبازی نوێیان لە دەروون دا بوو کە چەند چەمکێکی نوێ و جیاجیایان لەخۆ دەگرت لەسەر بنەمای هەرێمچێتی و نەتەوەگەرایی و بەرتەسك لە پێناو تێکشکاندنی بنکەی یەکبوونی ئیسلامی و جیاکردنەوەی کۆمەڵگە ئیسلامیەکان لە بنکە کۆکەرەوەکە (بنکەی خیلافەتی ئیسلامی). لە هەمان کات دا لە کۆمەڵگەدا چەند نمونەیەکی گەندەڵ و بومەح

خرانەڕوو تا بەهاکانی ئاین و ئەخلاق و حەیا و ناموس و ئابڕوو بەسوك سەیر بکرێن، هەر لە قومارخانەو مەی تا سەماخانەکان. لە بواری پەروەردەو فێرکردنیش دا پەیامێکی پێچەوانەی بیروباوەڕی یەکخواپەرستیان پێشکەش کرد (چ لە چەمکی دروست بوون دا وەك بیردۆزەکەی داروین یان چەمکی سوو یا ڕزگاریخوازی کۆمەلایەتی بۆ دارمانی بەها پەروەردەییی ئیسلامیەکان. پێشڕەویی پیلانەکانیشیان زاڵکردنی سەربازگەکان لە نیشتمان و چەسپاندنی پایەکانی زمانە بیانیەکان و خستنەڕووی چەند چەمکێکی جیا لە چەمکی ئیسلام بوو بۆ پێشڕەوی ڕاپەڕین و نوێکەری.

ئەو هەڵمەتە گەورە مەترسیدارەی کە قەڵەمڕەوی بیانی جەختی لێدەکردەوە بڵاوی دەکردەوە ئەوە بوو دەیوت هۆکاری دواکەوتن لە وڵاتانی ئیسلامی و عەرەبی تەنها بەهۆی هۆکارێکی بنەڕەتیەوەیە کە ئەویش خودی ئیسلامە بەهۆی ئەو بیرو باوەڕانەیەوە کە لەگەڵ سەردەم دا هەڵناکەن و بەرپرسی یەکەمن لە هەموو کێشەکانی دواکەوتن و لاوازی و تاك هۆکار و پێناوی ڕزگاریش بۆ موسڵمانان و عەرەب ئەگەر بیانەوێت پێشکەون و سەرپێ کەون ئەوەیە هەمان چەمك و واتاکانی ڕۆژئاوا وەربگرن دوای ئەوەی بەتەواوەتی ئەو پەیامە کۆنە پەککەوتەیە (مەبەستیان ئیسلامە) دەست بەردار بوون ئەوە ئەو هەنگاو و ڕەوتەیە کە قەڵەمڕەوی بیانی بۆ سەپاندنی چەمك و واتاکانی لەڕێی فێرکاری و خوێندن و ڕۆژنامەوانیەوە دەست پێکرد. ئیدی چەند ڕۆژنامەیەك بۆ خستنەڕووی زانست و چەمك و واتاکانی ڕۆژئاوا دامەزران و بیردۆزەی داروینیان بڵاودەکردەوە کە ئەو مەسەلە گەورەیە بوو قسەی لەسەر دەکرا لەنێوان بڵاوکارێك دا (دکتۆر شیلی شمیل) و نێوان بنکەیەکی جیای دا بۆ دابەزاندنی مشتومڕەکە (دکتۆر صروف) دواتر شوێنکەوتوانیان لەدوای ئیسماعیل مەزهەر و سەلامە موسا و کەسانێکی تر هاتن تا بنەماکانی بیردۆزەی دروستبوون لەسەر بنەمای

مەیمون بچەسپێنن (دژ بە واتای قورئانی) دواتر چەند بیردۆزەیەکی تر لە مەیدانی یاسای دانراو و سوو و بوارەکانی تردا خرانە ڕوو و زانایانی موسڵمانیش بێ ئەوەی مینبەرێکی حەقیقەتیان هەبێت تا لەوێوە بەرگری لەخۆیان بکەن لەدژیان وەستان چونکە هەموو مینبەرەکان لەدەست سەردەمگەرەکانی شوێنکەوتەی قەڵەمڕەوی ڕۆژئاوایی دا بوون تا ئەمڕۆش کە زیاتر لە سەد ساڵ تێپەڕیووە هەروایە. بەرەنگابوونەوەی ئەو هەڵمەتە دژ بە ئیسلامەی کە ڕۆژئاوا بە کینەیەکی کۆن و ڕق بوون لە ئیسلامەوە ڕێبەری دەکرد و چوار سەدە بوو بەسەر ئەوروپادا زاڵ بوو ئەوروپا لە جەنگە خاچیەکان دا دوای دوو سەدە شکا و ئیسلام بوونی خۆی بەزاڵ بوون بەسەر ڕووبەرێکی شاخەکانی بیرتی تا سنوری چین لە ماوەی هەشتا ساڵ دا چەسپاند و قەڵەمڕەوی دوو دەوڵەتی ڕۆمانی و فارسی لەناو برد و پەیامی حەقی خوای سەرخستو چەمکی پوختی یەکخواپەرستی سەرخست و ئەوروپای لە هەزار ساڵ کەنارگیری و بتپەرستیەوە بۆ بەرنامەی زانستی ئەزموونی برد و چی ڕۆشنبیری و زمانو پەرستشی بتپەرستی پێش ئیسلام هەبوون لەناوی برد و ئاسۆیەکی نوێی لەبەردەم مرۆڤایەتی دا کردەوە بەرەو لای خوا تا لە کۆیلایەتی ژیارەکانی یۆنان و ڕۆمان و فارس و فیرعەونەکان و هیندەکانەوە بیانبات بۆ ژیارێك کە عەرەبێ بەسەر عەجەمە و سپیەك بەسەر ڕەشێك دا هیچ فەزڵ و گەورەییەکی نەبێت بەتەقوا نەبێت. چەمکێکی نوێی ناو شارستانیەت دابنێت لەسەروو بنەمای ڕەحمەت و دادپەروەری و یەکخواپەرستی و برایەتی مرۆڤایەتی.

هەر لە گرتنی لویسی نۆیەم و بەندکردنی لە ماڵی ئیبن لوقمان لە مەنسورە تا کاتێ فیدیەکەی بدات و دوای حەوت جەنگی یەك دوای یەکی خاچی ئەوکات هاتەوە هۆش کە موسڵمانان لەڕێی ئەو بیروباوەڕەیانەوە کەلەسەر بنەمای گیانبەخشی موسڵمانە بۆ بەرز ڕاگرتنی پەیامی خوا بە پوختی لەڕێی بڕوای جیهادی بەردەوامە تا ڕۆژی دوایی

شکست ناخۆن. ئەوکات بانگەواز بۆ لاڕێکردنی ئیسلامەو دەرکردنی لە چەمك و واتا دروستەکانی و دەرکردنی موسڵمانان لە ئیسلامەوە بۆ چەمکی لاهوت و پەرستش دەستی پێکرد تا ڕۆژئاوا بتوانێ لەڕێی سەپاندنی ئایدۆلۆژیای بەسەر ئوممەتی ئیسلامیدا و ملکەچ کردنی خۆی و داهات و ڕێڕەو و خاکی بۆ قەڵەمڕەوی ئەو ژیارەی خۆی کە ئێستا لە قۆناغی خۆیدایە بەسەر موسڵمانان دا زاڵ بێت.

قەڵەمڕەوی ڕۆژئاوایی کۆمەڵگەیەکی لاواز و چەند هێزێکی جیهادی لاواز بوو بە ناپاکی بەدیکرد (ئەو ناپاکیەی عەبدولقادری جەزائیری و عورابی و عەبدولکەریم و شێخ کامیل و ئەحمەدی کوڕی عیرفانی شکاندن) دواتر ئەو نەوەی کە قەڵەمڕەوی داگیرکەری پەروەردەی کردبوو زاڵ بوو و پیلانی گەمارۆ و تەنگ پێهەڵچنینی گرتەبەر بە ئامانجی هەڵوەشاندنی کۆمەڵگە و خێزان بە بڵاوبوونەوەی بەدڕەوشتی و شکاندنی عەقڵی ئیسلامی بە بڵاوکردنەوەی ملهوڕی و بتپەرستی و هێنانی چەند چەمك و بەهایەکی نوێ سەبارەت بە ئەخلاق و دەروون و کۆمەڵایەتی تا کۆمەڵگەی ئیسلامی تەنگ پێهەڵچنێ و دایڕمێنێ.

ئامانجی قەڵەمڕەو بە دەستانی بیانی بەدەربڕینی کرۆمەری ڕێبەڕیان بریتبوو لە دروستکردنی نەوەیەکی نوێ کە سپاردەی قەڵەمڕەوی بیانی هەڵگرێ و بدات لە بزاڤی نەتەوەیی و چەند واتایەکی ئیسلام، لێرەوە دیمان ئەو نەوە نوێیە دوای جەنگی جیهانی یەکەم (دوای ئەوە هێزە نیشتمانیەکان و جگە لەوانیش شکاندبوویان) دەسەڵاتی گرتە دەست و هێندەی چەمك و واتاکانی ڕۆژئاوای وەردەگرت هێندە بەرگری نەدەکرد لە ئازادی نیشتمان. سەعد زەغلول لە میسر و دوای ئەتاتورك لە تورکیا و پەهلەوی لە ئێران، بانگخوازانی عەلمانیەت بوون و یەکەم کەسانێ بوون کە واتای کۆکەرەوەی نێوان ئیسلامە نیشتمان بوونیان لە تێکشکاند، لەگەڵ ئەوەش دا هەموو جەنگە ڕزگارخوازیەکان و بەرگریکاری دژ بە قەڵەمڕەوی بیانی لەژێر ئاڵای

ئیسلام و له واتای بنەڕەتی قوفڵی ئیسلامەوه بوون كه له نێوەندی ئەو ئوممەتەدا هەبوو، برنارد لویس دەڵێت بزوتنەوه دیار و بنەڕەتیەكان كه له خاكی ئیسلامدا دەركەوتن هەر لەو كاتەوەی ڕۆژئاوا پەیوەندی بەو خاكەوه كرد بزافی ئیسلامی بوون له كرۆك و بوونیان دا. زیاتر له گرنگیدان بەو ئوممەت یان وڵاتەی داگیر كرابوو گرنگی دەدا به مەسەلەكانی ئیمان و هەڵوێستی كۆمەڵی ئیسلامی بەرامبەر ئەو دەوڵەتانەی كه خاكی ئیسلامییان داگیر كردبوو.

ئەو بزاڤانەش له سێ شێوەدا خۆیان دەنواند:

١- قبوڵ نەكردنی تەواوەتی ژیاری ئەورووپی لەگەڵ گەڕانەوه بۆ ڕابردووی دوورو هەوڵی خۆ بوژاندنەوه لەسەر ئەو شێوەی وەلیوڵڵای هیندی و وەهابیەت و هەندێ له سەلەفیەكانی دواتر ئەنجامیان دا.

٢- ئەو هەڵوێستەی ئەحمەد خان له هیند و عەبدولقەیومی ناصری له ناوەڕاستی ئاسیا گرتیانەبەر كه هەڵوێستێكی هاریكاری بوو.

٣- هەڵوێستی لیبراڵی كه شێخ موحەمەد عەبده دەینواند و دەیویست ئیسلامه بەرفراوانانه لەگەڵ زانست دا (تەقەنیەت) بەوێ بێ ئەوەی دەست بەرداری تایبەتمەندیەكانی خۆی بێ.

٤- هەڵوێستی كۆمەڵی ئیسلامی و جەمالەدین.

سەرەڕای ڕێژەیەكی بەرچاوی خۆپاراستن بەرامبەر وتەكانی برنارد لویسی جولەكه كه پوخت لەبەر حەق نانوسێ دەبینین ڕیشەی ئیسلامی لەو قۆناغەدا كه لای ڕۆژئاواییەكان به سەردەمی دارمان وەسف دەكرا هۆشیاربوونەوەیەك بوو كه خێرا زیادی كرد و گەشەی سەند و فراوان بوو و لەڕێی نەوەكانی بانگخوازانەوه كه یەكلەدوای یەك دەهاتن چوویەوه سەر ڕیشەی خۆی تا گەیشته ئەو قۆناغه قورئانیەی كه هەندێ جار ڕەخنه گرانه دەڕوانێته هەندێ قۆناغ (بەلام ئەگەر له چوارچێوه

مێژووییەکەیدا داینێین دەبینین سەرفکردنی وزە و پۆزش هێنانەوەیە لەبەردەم خوادا).

هەوڵی قەڵەمڕەوی بیانی هەولگەلێکی زۆر و فرە چەشن بوون بۆ بانگەواز کردن بۆ هەرێمچێتی یان بۆ نەتەوەگەرایی یان دیدی مرۆڤگەرایی (تۆلستۆی و گاندی) یان ئەوەی پێی دەوترێ کۆنی ئیسلامی و نوێی هاوچەرخ یان ژیاری ڕۆژئاواو ڕۆشنبیری ئەدەب یان بۆ زیندوکردنەوەی فیرعەونی و فینیقی هەرکامە و لە وڵاتی خۆیان دا.

هێزە ڕۆژئاواییەکان هەوڵیان دا لە پێنج پرسی گەورەدا چەمك و واتا ئیسلامیەکان بشێوێنن و لەواتای بنەڕەتی خۆیان دەریان بکەن (سیاسەت، یاسا، ئابووری، فێرکردن، هەواداری، کەمینە و نەتەوەکان) نیزامی سیاسی ملکەچ بوو بۆ دیموکراتیەتی ڕۆژئاوایی و لیبرالیەت و نیزامی کۆمەڵایەتیش ملکەچی یاسای دانراو بوو، ئابوری ملکەچی سیستمی سەرمایەداری و دواتر مارکسیش بوو. فێرکاری ملکەچی بەرنامەی ڕۆژئاوا و بیردۆزەی پوچی دیوی بوو کە هیچ بنەمایەکی ئایین و ئەخلاقی تێدا نەبوو. قەڵەمڕەوی بیانی کە خۆی دەنواند لە دەستڕۆیی فەرمانڕەواییدا جیا لە بیردۆزەیەکی جیاکاری ئیسلامی لە هەموو ئەو بوارانەدا خۆی نواند.

سەرەڕای هەموو ئەو هەوڵە چڕو پڕانەی قەڵەمڕەوی بیانی- لە ڕێی ڕۆژهەڵاتناسی و مۆژدەبەری و ماسۆنیستەوە دەیگرتەبەر- هاودەمە بە چەند هێزێکی دی بۆ چەسپاندنی چەمك و واتاکانی خۆی و دارماندنی هاواری بێدارخوازی ئیسلامی ئەوا ڕۆژئاوا نەیتوانی زاڵ بێ بەسەر عەقڵی ئیسلامیدا و نەیتوانی بە تەواوی بەسەر ئیسلامدا سەرکەوێ و ئیسلام لەبەردەم هەڕەشەکان دا خۆی گرت و لاواز نەبوویان لەبەردەم شاڵاوەکان دا خۆی نەدا بەدەستەوە لە کاتێك دا ئاین و ڕەوتەکانی جگە لە ئیسلام خۆیان دابوو بەدەستەوە. فەلسەفە بتپەرستی و ماددیەکان نەیانتوانی وەك ئاینی جولەکە و مەسیحیەت تەنگ هەڵبچنن بە ئیسلام و ئیسلام بەهۆی هێزی خودی

خۆیەوە توانی بەرپەرچی ئەو هەڵمەتانە بداتەوە و بیانشکێنێ و هێز و کەسێتی خۆی بپارێزێ. ئەوەش سروشتی ئیسلامە لەکاتی سەختی و تەنگژەکان دا.

دوای ئەو گەشتە بەرفراوانە لە ماوەی سەدەیەك دا هەر لە سەپاندنی یاسای ناپلیۆنەوە شکستی مارکسی و لیبراڵی هەبوو و بێداریخوازی ئیسلامی تەنگژەی خۆچواندنی تێپەڕاند بۆ دڵنیایی چارەسەری ئیسلامی.

قەڵەمڕەوی بیانی دە بانگەوازی ژەهراوی پێشنیار کرد:

١- بیردۆزەی ماددی

٢- فەلسەفەی ماسۆنی صەهیۆنی

٣- ڕۆحیەتی نوێ

٤- بیردۆزەی والدی (تەقینەوەی دانیشتوان و دیاریکردنی ڕەچەڵەك)

٥- بیردۆزەی سوو

٦- ئازادکردنی ئافرەت و بردنە دەرەوەی و تێکشکاندنی خێزانی موسڵمان

٧- ڕاڤەی ماددی بۆ مێژوو

٨- بانگەشە بۆ چەند پێغەمبەرایەتیەك دوای کۆتایی پەیامی پێغەمبەرایەتی بەهائی و قادیانی.

٩- بیردۆزەی گەشەسەندن

١٠- بیردۆزەی فرۆید

١١- بوونگەرایی

١٢- بیردۆزەی دورکایم لە تێکشکاندنی بەهاکان دا

١٣- گۆڕینی چەمك و واتاکانی تلمود بۆ چەند بیرۆکەیەکی فەلسەفی مۆرك پێدراوی زانستی.

١٤- زیندوکردنەوەی کلتوری ملهوڕی و وەحدەتول وجود و توانەوە.

١٥- بیردۆزەی نەتەوەگەری هاوردە

١٦- بانگەواز بۆ زیندوکردنەوەی فەرهەنگی پێش ئیسلام

١٧- هۆنفرم (بیرۆکەی مرۆیی)

١٨- هەڵمەتی دژ بە فەرهەنگ، دژ بە ژیانی پێغەمبەر (ﷺ)و سوننەت. هەروەها پێشنیاری بیرۆکەی بیری ئازاد و بیروباوەڕو مەزهەبەکانی گومان و نازانمگەرا و ملهوڕی.

چیرۆکی ئەوەی ئاینەکان ئاسمانی نین و لە ئاسمانەوە نەهاتوون و دیاردەیەکی کۆمەڵایەتین. مرۆڤایەتیش سەرەتا بتپەرست بووە و دواتر یەکخواپەرستی فێربووە. بیردۆزەی ئەوەی ئاین پەیوەندی نێوان مرۆڤ و خوایەو هیچ پەیوەندیەکی نیە بە کۆمەڵگەوە، ئاینیش مەستی بەخشی گەلانە و ئاینینش ڕێگرە لە گەشە کردن و پێشکەوتن، بڵاوکردنەوەی ڕاڤەی ماددی و ئابوری و جنسی بۆ مێژوو، لەوەش مەترسیدارتر زیندووکردنەوەی بیری باتینی و بتپەرستی و چەمکەکانی ئیشراق و ئیتیحاد و حلول و وەحدەتولوجود و باسی ڕووکەش و ناوەڕۆکی قورئان و تەئویل و وەزع و ئیسرائیلیات.

ڕێبەرانی بێداریخوازی و نوسەرانی ڕابوون هەموو ئەو گومانەیان تێکشکاندن. هەڵمەتەکان لە چەند شەپۆلێکی یەك لەدوای یەك دا بوون و بەرگریکاری زانایانی ئیسلامیش هێندەی قەبارەی پرسەکان توانایان هەبوو تیرەکان بەڕووی وەشێنەرانیان دا بگێڕنەوە. جەنگەکە تا ئێستاش بەردەوامەو نەوەستاوە.

# باسی یەکەم

## سەرهەڵدانی بیری ڕۆژئاوایی

بیری ڕۆژئاوایی کە دواتر بوو بە بیرێکی جیهانی و هەوڵی دەدا قەڵەمڕەو و واتاو چەمکی خۆی بسەپێنێ و لە بنەڕەت دا بەسەر کیشوەری ئیسلام دا زاڵ بێت. ئەم بیرە لە کۆشی بتپەرستی یۆنان و پەرستشی خواوەند قەیسەری ڕۆمانی دا سەری هەڵدا، دواتر ئەو میراتەی بە ئەفسانەی لاڕێ بووی جولەکەو ئەو چەمك و واتا مەسیحیانە ڕەنگ ڕێژ کرد کە لە بازنەی ئاینی سیانە خودای و فرە خودایی پێشتر دا تێکەڵ ببوو چ لە ڕۆما یا میسر یا هیند یان فارس. ئیدی لە میراتی ڕاستی پێغەمبەرایەتی دا تەنها ڕێژەیەکی کزی لەکرۆك دا مابوو کە سەرکردەکانی ئاینەکان لە ڕێ لایان دا و گۆڕیان کاتێ جولەکایەتی چوو بەرەو بیرۆکەی گەلی هەڵبژاردەی خواو پەروەردگاری توند و ڕەق کە جیا لە خەڵك خواوەندیان گرنگی پێدەدان. مەسیحیەتیش چوو بەرەو بیرۆکەی خاچ و سیانە خوادایی و تاوان کە هەموویان بیرۆکەی بتپەرستی بوون لە چەند ئاینێکی پێشوو دا هەبوون و ئەوروپا لە گەلانی کۆنەوە وەریان گرتبوو وەك قورئانی پیرۆز دەفەرموویێت ﴿**یضاهئون به قول الذین کفروا من قبل**﴾ دواتر ئەو پێگە بنەڕەتیەی بیری ڕۆژئاوایی پێش دەرکەوتنی ئیسلام تۆز و خاشاك و کۆی خوڕافە و ئەفسانەی ئەو گەلانە بوو کە لە سەرەتای منداڵێتی مرۆڤایەتی دا هەیانبوون لەو ماوانەدا کە ئاینە دابەزیوەکانی ئاسمان و هەندێکی دیکەیان لە یەك جیا دەکرانەوە. مرۆڤایەتی سەرەتا بە ڕێبازی پێغەمبەرایەتی دەستی پێکرد، بەڵام هێندەی نەبرد بایدا بەلای ئارەزووەکانی دا و ئەو خاشاك و تۆزە دروست بوو. ئەوروپا پێش ئەوەی لە بەخششی پەیامەکانی موسا و عیسا (علیهما السلام) پێبگات تەواو نغرۆی ناو بتپەرستی بوو. ئەمەش لە قسەو وتەی ئەملاولای ناو بیری

هەندێ بیریاریان دا دەردەکەوێت، بەڵام بەداخەوە ئەو بەخششانەش بە سەختی تێکەڵی بتپەرستی بوون و دواتر نەیانتوانی بەخششی حەق ببەخشن. لەگەڵ فرە خودایی دا چ لە بەکۆیلە کردنی مرۆڤ و زاڵکردنی گیانی زاڵ بوون بەسەر کۆیلەدا بێ هاوکات بە کەم ڕوانینە ئافرەت-ئەورووپا گوازرایەوە بۆ ئەو مەسیحیەتەی کە تێکەڵ ببوو بە چەمك و واتاکانی ئاینە بتپەرستیەکان تا ئەوەی لە چەند سەدەیەك دا گۆڕا بۆ ئەو کەنارگیریەی کە کۆمەڵگە بەهۆیەوە بەتەواوەتی کەناری گرت و ژیانی شێواو بوو تا ئیسلام هات و بەرەو تێگەیشتنێکی نوێی برد سەبارەت بە پەیوەندی نوێ لەگەڵ خواو لەگەڵ کۆیلەو لەگەڵ ئافرەت دا. خێرا بەرنامەی ئەزموونی وەرگرت و ئەو ئەزموونە گەیشتە جەرگەی ئەورووپا کاتێ موسڵمانان دەستیان گرت بەسەر ئەندەلوسدا. ئەو فێردەوسە لەدەست چووەی کە تیایدا زانکۆیان دامەزراند و خەڵکی ئەورووپا دەهاتن بۆ زانکۆکانی ئەندەلوس و لەوێ واتای زانستی ڕاستییان وەردەگرت و لە تاریکیەوە بەرەو ڕووناکی دەچوون، ئەمەش لە گەشتێکی سەخت و درێژ خایەنی زیاتر لە سێ سەدەیی دا، بەڵام ڕۆژئاوا هەرچەندە توانی زانستە ئیسلامیەکان وەربگرێ و کەچی بیروباوەڕی ئیسلامی و بەرنامەی خودایی بۆخۆی قبوڵ نەکرد، بەڵام چەندە توانی ئەزموونی زانستەکانی گواستەوە بۆ بازنەی بیری بنەڕەتی خۆی: یۆنانی ڕۆمانی لەڕوانگەیەکەوە و جولەکەی مەسیحی لە ڕوانگەیەکی ترەوە. دواتر پێچایەوەو کەوتە هەڵمەتێکی سەختی دژ بە ئیسلام و موسڵمانان لە واتاو چەمکێکی قوڵەوە کە تا ئەمڕۆش زاڵە بەسەر هەڵسوکەوت و ناخی ڕۆژئاوادا. پێم وانیە ڕۆژئاوا ساتێکیش دەست بەرداری ئەوە بووبێت هەرچەندە لە دەیەکانی کۆتایی دا ڕێوی ئاسا ئەوەی شاردبێتەوە. مامۆستا جەمالەدینی ئەفغانی ئەو واتایەی ئاشکرا کرد کاتێ وتی (ڕۆژئاوا هێشتا بەرامبەر بە ئیسلام گیانی دەمارگیری هەیە) ئەمەش لە بوتروسی ناسکەوە دێ لەژێر چەند بانگەشەیەکی جۆراوجۆردا، لەوانە خاکی ئیسلام پێشتر

خاکی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی بووە (لە شامەوە تا مەغریب) لەمەش دا قسەکەی لۆرد سالسبیری دەوترایەوە: پێویستە مانگ چی لە خاچ سەندووە بیگێڕینەوە بۆ مانگ، یان وتەکەی بیبوس شمیس لەو کتێبەی دا لەسەر ژیانی مەسیح نوسیبووی: (ئەم دەست گرتنە بەسەر بەیتولمەقدیس دا جەنگێکی خاچی هەشتەمە کە تیایدا مەسیحیەت گەیشت بە ئامانجەکەی).

یان یەکێکیان دەڵێت: (ئەگەر عەرەبەکان لە نیمچە دورگەی عەرەبی خۆیان دا نەهاتنایەتە دەر جەنگە خاچەکان ڕوویان نەدەدا)، هەموو ئەوانە چەند دەربڕینێکی شێوێنەرن کە زادەی کینەو ڕقی سەختی ئەوانن، چونکە ئەو ناوچانەی ئەوان باسیان دەکەن (ئەندەلوس، مەغریب، ئەفریقیا، شام) لە ڕاستی دا وڵاتانێکن ڕەسیدی عەرەبی گەورەیان هەیەو لەپێش ئیسلام دا چەند کۆچێکیان بۆ چووە بە هەزاران ساڵ لە چەند شەپۆلێك دا ئەو کۆچانە ڕوویان داوە کە لای مێژوونوسان ناسراون، هەروەها داگیرکاری ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی بۆ ئەو ناوچانە واتای ئەوە نیە بووەتە خاوەنی ئەو ناوچانە، بەڵکو ئەو ناوچانەن ناوچەی داگیرکرابوون و خەڵکەکەی زەلیلیان چەشتووە. تا ئیسلام هات و قەڵەمڕەوی ڕۆمانی دوورخستەوە و ڕزگاری کردن و دواتر ئازادی بەجێهێشت بۆ خەڵکەکە و ئەوانیش لە ویستی تایبەتی خۆیانەوە ئیسلامیان قبوڵ کرد.

ئەوە ئەو بانگەشە پوچانە بوون کە بۆ داگیرکردنی خاکی موسڵمانان دەیانکردنە بەڵگە وێڕای بانگەشە سەر شێوێنەرەکانیان سەبارەت بە ڕزگارکردنی بەیتولمەقدیس لەدەست ئەو موسڵمانانەی کە هەر لە سەرەتای بەیانی ئیسلامەوە دەیان پاراست و بڕوایان هەبوو بە مافی ئەهلی زیمە بەسەر موسڵمانانەوە تا پەرستگاو بەرژەوەندییان بپارێزن، ئەوەش سپاردەیەکی سەر شانی موسڵمانانە تا ڕۆژی دوایی، بەڵام ئەو ڕاستیە نابێ لەبەرچاو لابرێ و پشت گوێ خستنی نەگونجاوە ئەوەیە دەرکەوتنی

ئیسلام لەرزەیەکی گەورەی لە هەموو جیهانی ئەهلی کیتاب و بتپەرستان دا دروست کرد ئەوانەی چەندین خواوەندیان دەپەرست و ئەهلی کیتابیش دەستەیەك بوون لەسێ دەستەکە: بێباوەڕان و بتپەرستان لە لایەك و حەنیفیەکان کە پاشماوەی گەلی ئیبراهیمو ئاریۆسیەکان بوون ئامادە نەبوون مەسیح بەخوا بزانن. پێغەمبەریش (ﷺ) لە نامەیەکی دا بۆ هیرقلی ئیمپراتۆری ڕوم باسی کردووە. ئەوانە لە شاخەکان یان ناوچە دوورەکان دا خۆیان حەشاردابوو و چاوەڕێ بوون حەق دەرکەوێ. هەر کە بانگەوازی یەکەمی ئیسلام دەرکەوت خێرا نەخشەی پیلاندانان بۆ لەناوبردنی ئاینی نوێ لەلایەن دوو دەوڵەتی فارس و ڕۆمەوە دەرکەوت، یەکێکیان بتپەرست و ئەوی دیکەش مەسیحی سەر بە مەزهەبی سیانە خودایی. ئەمەش لە ڕۆژگاری کۆتایی پێغەمبەر دا (ﷺ) دەرکەوت کاتێ پێشڕەوی کرد بۆ جەنگی تەبوك لەوپەڕی گەرماداو پێغەمبەر(ﷺ) باکورو دەروازەکانی نیمچە دورگەی دڵنیا کرد و دواتر ئامادە سازی کرد بۆ ناردنی ئوسامە، کاتێ ئاڵاکەی ئوسامە بەسەر مزگەوتی مەدینەوە بوو پێغەمبەر (ﷺ) ڕەفیقولئەعلای هەڵبژارد (گەڕانەوە بۆلای خوا) کۆتا فەرمایشتیشی ئەوە بوو نەخشەی سەدساڵی دواتری دانا بۆ موسڵمانان:

١- دەستەکەی ئوسامە بنێرن.

٢- لە نیمچە دورگەی عەرەبدا دوو ئایین نەمێنن.

هەر لە ڕۆژی یەکەمی ئیسلامەوە دەوڵەتی ڕۆمانی ڕۆژهەڵاتی هێرشی دەبردە سەر سنوری موسڵمانان و شاڵاوی دەبردە سەری و جەنگیش نۆرە بە نۆرە نەدەوەستا. دواتر فراوان بوو بۆ چەند مەیدانێکی جۆراوجۆر. وەك هەڵمەتێکی خاچپەرستی بۆ شامو میسر، هەڵمەتی فرەنجەکان بۆ سەر ئەندەلوسی و مەغریب دوای ئەوەی موسڵمانان گەیشتنە ڕووباری لوار، دواتر گەشتی دووەمی ئیسلامی بە پاشەکشە لە ڕۆژئاوای ئەورووپا و چوون بەرەو ڕۆژهەڵاتی ئەورووپا بەرەو شورەکانی ڤیەننا دەستی پێکردو دەوڵەتی عوسمانی چوار سەدە بەرامبەر ئەورووپا وەستا.

پاش ئەوەی هەڵمەتە خاچیەکان شکان، بەو جۆرە بەشوێن پێی خۆیدا گەڕایەوە، ئەوکات گەشتی کۆتایی هات کە تیایدا لۆرد لەشاری قودس وەستا و وتی ئەمڕۆ جەنگە خاچیەکان کۆتاییان پێهات. سەرکردەی فەڕەنسیش غۆرۆ لە دیمەشق وەستاو وتی ئەی صەلاحەدین ئەوە ئێمەین وا گەڕاینەوە. ئەوکات گەشتێکی نوێی ململانێ دەستی پێکرد. لە کاتێك دا موسڵمانان لە تەنگژەی دواکەوتەییدا بوون و دوای هەزار ساڵ ڕێبەری کردنی هەموو جیهان و پێشکەش کردنی ژیاری یەکخواپەرستی و بەرنامەی ئەزموونی و چەمك و واتای دادوەری کۆمەڵایەتی و برایەتی مرۆڤایەتی هەناسەبڕکێیان تێکەوتبوو. لەو قۆناغەدا ڕۆژئاوا هەموو پێناوەکانی بەردەستیان خستنەکار بۆ بە ڕۆژئاوایی کردنی موسڵمانان و تەنگهەڵچنین بە ئیسلام و وروژاندنی گومانەکانی سەر کرۆکی بیروباوەڕ. ئەمەش ئەمەش لە ڕێی دامەزراوەکانی ڕۆژهەڵاتناسی و موژدەبەریو بە مەسیحی کردن و ماسۆنیەت و بانگەشە ڕمێنەرەکان و پێشنیاری ئایدۆلۆژیاکانی ملهوڕی و بێڕەوشتی و گومانی فەلسەفی و بوونگەرایی لە ئاسۆی جیهانی ئیسلامیدا و دەستگرتن بەسەر بەرنامەکانی فێرکردن و نیزامی دەسەڵات دا وسەپاندنی یاسای دانراو و بانکی سووخۆری لەپێناو ئەوەی ئوممەتی ئیسلامی لە نێوەندی نەزانی جیهانیدا بتوێتەوە. بەڵام ئایا موسڵمانان وەستان و لەبەردەم ئەو هێزە فشار دانەرانەدا خۆیان دا بەدەستەوە؟ هەرگیز. تەنانەت ڕۆژێکیش نەوەستان و بەرگرییان کردو بە واتای ئیسلامی (گەڕانەوە بۆ سەرچاوەکان) خۆیان گرت. ئەگەر کۆمەڵ هەڵوێستی سەرسامییان هەبوو بێت. ئەوا صەفوە هەر لە ڕۆژی یەکەمەوە زانی چەند جیاوازییەکی قوڵ هەن و بانگخوازانی سەرسامبوون پەیڕەوییان نەکردون هەر لە ڕەفاعە تەهتاویەوە تا سەعد زەغلول و لوتفی سەید و تەها حوسەین، چەند عەقڵیەتێکی باوەڕدار هەبوون بە ڕووناکی خوا دەروونیان ڕووناك دەکردەوەو بەخۆ بەدەستەوەدان ڕازی نەبوون و وەستان و بانگەوازیان دەکرد بۆ گەڕانەوە بۆ قورئان،

ئەگەر شارستانیەت هەندێکی لەخشتە بردبێ ئەوا مامۆستا حەسەن بەننا هاواری یەکلاکەرەوەی خۆی ڕاگەیاند لە وەستان بەرامبەر ژیاری ڕۆژئاوایی و خۆبەدەستەوە نەدان چونکە ئەو ژیارە لە کرۆك و ڕوخساریشدا لەگەڵ ئیسلام نەدەگونجا.

لە جەرگەی ئەو جەنگەی نێوان شوێنکەوتەیی و گەڕانەوە بۆ بنەڕەت دا بنەڕەتێك دەرکەوت بۆ وەستان لەسەر بنەمای ڕەسەنی قورئانی کەچی کلتوریێ دێت بیرێتەوە بەردەم قورئان. ئەمەش دوای ئەوەی ئوممەتی ئیسلامی قۆناغی سەرسامبوون و شوێنکەوتەیی و تاقیکردنەوەی یەك دوای یەك تێپەڕاند تا موسڵمانان دڵنیا بوون ئەو ڕێگەی پیایدا ڕۆیشتن پڕە لە داو و هەڵەو نایانگەیەنێتە ئامانجی خۆیان کە بریتی بوو لە گرتنەوە خۆی کارگێڕی تا بتوانن جارێکی تر لەسەر زەوی دا کۆمەڵگەی خواپەرستی خۆیان بەجۆرێ دابمەزرێننەوە کە بتوانن بانگەوازی خوا بە جیهانیان بگەیەنن. ئیدی هەموو پیلانەکان بۆ ئەوە بوون ڕێگەکە کوێر و داخراو بکەن و لەڕێی ڕاستی خواوە بەرەو ڕێیەکیان ببەن کە لە ڕێی ڕاست جیایان بکاتەوە.

## *ڕۆژئاوا بێ ئیسلام خاوەنی چ فەرهەنگێ بوو؟

ئەگەر بڵێین ئەو فەرهەنگەی لەپێش ئیسلام دا هەبوو تێکەڵەی دارو بەردووی بتپەرستی پێشوو و هاوسەردەمیان بوو لە فەرهەنگی فیرعەونی و مەجوسی و هیندۆسی و بیروباوەڕی ڕۆمان کە تێکەڵەی چەند بیرێکی تێکەڵ بوو ڕاستیمان تێپەڕاندووە. ئەوەش تێکەڵ بوونی فەرهەنگی دوو ئاینی ئاسمانی بوو (ئەوەی دابەزی بۆ سەر عیسا و موسا (علیهما السلام)) بەڵام لێکۆڵینەوە و هەموو بەدواداچوونەکان هیچ شتێکی وا نیشان نادەن کە ئاماژە بێ بە کاریگەری ئەو دوو ئاینە بەسەر ئەو دارو بەردووە تێکەڵەی کە لە چەند قۆناغێك دا هەبووە. زیاتر ئەفلاتون و ئەرستۆ لەپێش مەسیحیەت و ئەفلۆتین بیریان پێشکەش کردووە. دواتر لە نوسینەکانی عەدیسی و

تۆگەستین دا دەردەکەوێت بیری مەسیحیەت تێکەڵ دەکات بە ڕەوتی ئەفلاتۆن و ئەوەی تۆماس ئەکوینی پێشکەشی کردووە تێکەڵ بە ڕەوتی ئەرستۆ کردنیەتی. فەلسەفەی یۆنانی بە تەواوەتی زاڵ بوو بەسەر مەسیحیەتی ڕۆژئاوادا (بەو واتایەی قدیس پۆلس پێشکەش کردو لەسەر بنەمای سیانە خودایی و خاچ و هەڵە دامەزرابوو) ئەو بیرەی زۆربەی بەهاکانی ژیاری ڕۆمانی هێشتەوە بەتایبەت سەبارەت بە هەڵسوکەوت لەگەڵ مرۆڤ و هێشتنەوەی کۆیلایەتی و دانانی بە نیزامێکی بنەڕەتی کە هەرگیز لەناوچوونی بۆ نەبێ، دواتر هەڵسوکەوت لەگەڵ ئافرەت و دانانی بەوەی قەوارەیەکی تایبەت یان کەسایەتیەکی سەربەخۆی نەبێت.

دەکرێ بڵێین ئەو بیرە ئەورووپیەی لە ساڵی ٥٧١ز. بڵاوبوو بیرێکی مرۆیی تێکەڵ بوو کە گیانی ستەم و بێ ڕەوشتی و گەندەڵی و خراپە زاڵ بوو بەسەر مرۆڤایەتی داو کۆمەڵگە جیاجیا خاوەنی ژیارە پێشکەوتووەکانیشی داگرتبوو وەك نیزامی فیرعەونی لە میسرو مەجووسی لە فارس و هیندۆکی لە هیند، سەرەڕای نیزامی ئیمپراتۆری ڕۆمانی (قەیسەر...) کە تیایدا بانگەواز بۆ ئەوە دەکرا پاشا خواوەندەو تیایدا گیانی خۆسەپێنی زاڵ بوو و لە نیزامی دەسەڵات دا ئەوپەڕی ڕەقی هەبوو و گیانی بێ ڕەوشتی و پەرستشی جەستەکان لە نیزامی کۆمەڵگە گرنگی پێدەدرا. ململانێی نێوان جولەکەو مەسیحیەکانیش هەبوو و دادگاکانی پشکنین هەبوون و کتێبە پیرۆزەکان دەگۆڕدران و لە گیانی ئیمان بە خوای تاك تەنهاوە دەبران بەرەو فرە خودایی و سیانە خودایی کە ئەوانیش ئاینانێکی پێش جولەکە و مەسیحیەت بوون. هەروەك بیرۆکەی خواوەندی تایبەت لای جولەکە و بیرۆکەی کوڕی خوا لای مەسیحیەت دەرکەوت، بەمە لە سایەی ئاینی ئاسمانی دا بیرۆکەی تەجسید سەرکەوت. ئەمەش ئەو بیرۆکە بوو کە ئاینەکان بۆ لەناوبردنی هاتبوون. مەسیحیەت لەبیری کۆنی یۆنانیەوە بیرۆکەی حەوت عەقڵەکە و بیرۆکەی ئیتیحاد و حلولی وەرگرت لەکاتێك دا ئایینی حەق بۆ لەناوبردنی

ئەمە هاتبوو. ئیدی کرۆکی بیروباوەڕ و واتای کۆمەلایەتی باوی ئەورووپا لەو قۆناغەدا گەشەی سەند و گەیشتە ئەوپەڕی ڕێ کە (ڕەهبانیەت) کەنارگیری یەکجارەکی لە ژیان بوو.

لێکۆلینەوەکانی مێژوونوسان و زانایانی لاهوت جەخت لەوە دەکەنەوە دوو بیروباوەڕی سیانە خودایی و فیدا عکە مەسیحیەت خستنیە ڕوو لە بیروباوەڕی یۆنانیەکان دا هەبوو وە هەر لە ماوەیەکی زۆری پێش زاینەوە زانایانی مێژووی ئادابی یۆنانی دەلێن ئەوە لە گێڕانەوەیەکی تەواو کۆنەوە وەرگیراوە کە شاعیری یۆنانی وێنای ئەو ئازارانەی خاچی کردووە کە ئەو خواوەندە بەرگەی گرتوون. هەروەها لێکۆلینەوەکان جەخت لەوە دەکەنەوە چی لە تەورات دا هەیە (کە بە دەستی ئەحبارەکان نوسراوەتەوە) لە کۆکراوەی فەرهەنگی گلانی پێشووە چ لە بابل یان فارس یان هیند. ئەو کات بەشێوەیەکی نوێ دارێژراون تا ببنە بیروباوەڕی جولەکە. چی مەسەلەی جەبرو تەشبیە و ڕەجعە هەن لەو فەرهەنگە کۆنەدا هەبوون. هەروەك ئەو فەرهەنگە کۆنە ڕێی داوە بە سوو و زینا و خواردنی ناڕەوای سامانی خەلك. کاتێ ڕۆمان مەسیحیەتی وەرگرت ئەو ئاینە لە ئاینی ئەوان نزیك بوو و لە نێوانیان دا تەنها چەند جیاوازیەکی کەم هەبوون، مەسیحیەت لە شێوە پەرستشی ڕۆمانی وەرگرت وەك چۆن شێوە پەرستشی بتپەرستی فیرعەونی وەرگرت. ئیدی پەیکەرەکان بوونە کلێسای مەسیحی و لەگەل هێزە ڕۆمانیەکان جەنگان تا لەگەل مەسیحیەت سیانە خوداییان سەپاند و دژی ئەو وتەش جەنگان کە دەیوت عیسا (علیە السلام) پێغەمبەرە و خوا نیەو کوڕی خواش نیە، پێشڕەوی ئەو ڕایەش ئاریۆس و شوێنکەوتووانی بوون.

ئاریۆس لە سەدەی چوارەمی دوای زاین دا لە ئەسکەندەریە دەرکەوت و لەو کەسانە بوو کە خەلکیان فێری ئەوە دەکرد عیسا خوا نیەو دەیانوت ئەو لە زاتی خوا

نیه و ئەو لە دایك بووە و دروستی بوونی هەیە و حیکمەت لە بوونی ئەوەیە نێوەندیّ بێ بۆ ڕزگارکردنی جیهان لە تاوان و هەڵە. لە ساڵی ٣١٨ز. دا ئاریۆس تۆمەتی نکوڵی لاهوتی مەسیحی خرایە پاڵ و ئەویش دانی نا بە تۆمەتەکەدا و بەبەڵگە سەلماندی. ئەوکات حوکمی حیرمانی بۆ دەرکرا و کڵێسا ڕاکەی وەرنەگرت و ڕاکەی تری وەرگرت. بەو جۆرە فەرهەنگی ڕۆژئاوا لەپێش ئیسلامدا تەنها دوو شتی پێشکەش کردووە: بیّ ڕەوشتی یۆنان و ڕەقی ڕۆمان و بڕیّ فەلسەفەی دامەزراو لەسەر چەمك و واتای شێواو لە مەنتیق کە ئەو بیروباوەڕایانەیان بەرهەمهێنا کە موسڵمانانیّ دوای وەرگێڕانی فەلسەفەی یۆنانی لە سەدەی سێیەمی کۆچیدا ڕەواجیان پیّ دەدان. بەڵام خێرا زانایانی موسڵمان بەرپەرچیان دانەوە، هەروەك کۆمەڵیّ چەمك و واتای پێشکەش کرد کە جیاکاری ڕەگەز و خوێنیان لەخۆ گرتبوو و قۆرخکاری چینە هەژارەکان و بە کۆیلە دانانیان و کۆمەڵیّ ئەفسانە و خورافەی سەبارەت بە ململانیّ و کینەی خواوەندەکانیان لەخۆ دەگرت، ئەمە دواتر ڕەوتی ناسراو بە موحاکات و یەکسانی و ململانێی لەسەر دامەزرا کە لەوێشەوە هونەرەکان و چەمك و واتای تەقلیدی سروشت و سەرکەوتن بەسەر سروشت هاتنە مەیدان.

کاتیّ ئیسلام هات ئەو جەنگە بەردەوام بوو لەنێوان چەند مەزهەبێکی بارگرژی مرۆیی هەموو ناوچەکانی جیهان دا لە فارس و میسرو شام و دەوڵەتی ڕۆمانی ڕۆژهەڵاتی و ڕۆژئاوایش دا لەژێر پەردەی مەسیحیەتی ڕووکەش دا، هاودەم بە دەیان دەستە کە پاشەکشەیان کرد بۆ ئەملاولا وەك خوێندنگەکانی ئەنتاکیە و نصیبین و ڕەها و ململانێی نێوان هیلینی و جولەکە و دەرکەوتنی مەسیحیەتی هیلینی و نەساتیرە و سابیئە و مەجوسیەت و کلتوری هیند و فەرهەنگی کۆنی فارس و بتپەرستی عەرەبی ناو نیمچە دورگەی عەرەبی. هەموو ئەم دارو بەردوانە لە کرۆك دا تەنها ئارەزووی گەلان و ساوایی مرۆڤایەتیان لەخۆ گرتبوو. ئینجا ئیسلام هات و

قورئان دابەزی و بەڕای یەکلاکەرەوە و دروست ئەوانەی لەناوبرد، ئیدی کتێبی خوا هەڵوێستی ئایینی ئاسمانی بەرامبەر هەر دەستەیان ڕەوتێ نیشان دا ئایا لەگەڵیدا پێچەوانەیە یان ڕایەکی پێ ڕەوایە، ﴿لِيُبَيِّنَ لَهُمُ الَّذِي يَخْتَلِفُونَ فِيهِ﴾ (النحل).

کاتێ مێژوو دەخوێنینەوە دەبینین مۆمی ئەورووپی لەسایەی درەختی ئیسلام دا کوژاوە بووە و ئەورووپا سەردانراو لەناو ئەفسانە و چەمکە شێواوەکانی خۆیدا کە تێکەڵەی سەردەمی ڕەهبانیەت بوون ژیاوە. ئیدی هەموو شتێ تیایدا وەستاو بووە تا کاتێ ژیاری ئیسلام و بەرنامەی ئەزموونی ئیسلام لەڕێی ئەندەلوسەوە پەڕیەوە بۆ ئەورووپا. ئیدی ژیان ڕۆحی بەبەردا هاتەوە و ئەورووپا خۆی لەو عەقڵانە دەرباز کرد. بەڵام هەر لە چوارچێوە کۆنەکەی خۆیدا (یۆنانی ڕۆمانی جولەکە مەسیحی) ئەزموونی ئیسلامیشی داڕشتەوە. لەو ڕوانگەوە ئەو چەمك و واتا نوێیانەی زانستی داڕشت تا خێرا لەگەڵ چەمك و واتاکانی کڵێسادا کەوتنە جەنگێکی سەخت و سەرەنجام ئایین بەتەواوی کەنار خرا و چەمکەکانی (زانست عەقڵ ماددە فەلسەفە) سەرکەوتن بەو شێوەی ئەورووپا لەوێوە بەرەو سەرمایەداری و لیبراڵیەت و جەدەلی هیگلی و بیردۆزەی گەشەسەندن و وەزعیەتی مەنتیقی و مارکسیەت و براگماتی و بوونگەرایی هەنگاوی نا.

ئەو چەمکانە هەمان ئەو چەمکانە بوون کە ڕۆژئاوا دوای گەشتی داگیرکاری خۆی لە جیهانی ئیسلام دا ویستی بەوپەڕی هەوڵ و توانای بەرفراوانی خۆیەوە لەڕێی خوێندن و مزگێنیدەری ڕۆژهەڵاتناسی و ڕۆژنامەوانیەوە بیانسەپێنێ و کرۆکی ئیسلام بگۆڕێ و لە واتای بنەڕەتی گشتگیری خودایی خۆی بیگۆڕێ بە مەبەستی بە مەسیحی ڕەنگکردنی و دواتر تێکەڵکردنی لە نێوەندی ژیاری جیهانی یان نێودەوڵەتی بوونی گەلان دا.

## باسی دووەم

## ( لە تەنگپێهەڵچنینەوە بەرەو بەرەنگاربوونەوە )

چالاكی جەنگی نێوان جیهانی ئیسلام و جیهانی ڕۆژئاوا بە چەند قۆناغێكدا تێپەڕ بوو:

*گەشتی یەكەم: نەخشەی تەنگپێهەڵچنین (دەورەدان):

١- ڕۆژئاوا هەوڵیدا لە سایەی ئیسلام دا بەرنامەیەكی نوێ دابمەزرێنێ تا بتوانێ بەسەر زانستەكان دا زاڵ ببێت.

٢- ڕۆژئاوا بۆ دەست گرتن بەسەر وڵاتی ئیسلام دا هەوڵی دا سەروەت و سامانی ریشەكێش بكات.

٣- ڕۆژئاوا هەوڵی دا بەرنامەی ئیسلام ساختە بكات تا موسڵمانان نەتوانن ببنە هێزێك ڕكەبەری بكەن و بەرامبەری ڕاپەڕن.

٤- ڕۆژئاوا شوێنكەوتنی چەمك و بەرنامەكانی بسەپێنێ تا موسڵمانان لەبەردەمی دا خۆبەدەستەوە بدەن.

*گەشتی دووەم: نەخشەی بەرەنگاربوونەوە:

١- موسڵمانان بەرەو ڕووی قەڵەمڕەوی بیانی وەستانەوە تەنانەت هەموو ئاڵایەكی نیشتمانی یان نەتەوەییش.

٢- موسڵمانان كرۆك و ڕاستی ئیسلامیان خستەڕوو و سەر لەنوێ بەو جۆرە پێشكەشیان كرد كە ئاین و دەوڵەتیشە.

٣- موسڵمانان پێشڕەوییان كرد و بەرەو ڕووی چەمكەكانی ڕۆژئاوا وەستانەوەو ساختەكاریەكانیان ئاشكرا كردن.

٤- بیردۆزەكانی ڕۆژئاوا وەك گەڵای پایز دەوەرین چونكە لەسەر بنەڕتێكی دروست نەوەستابوون.

٥- ئیسلام بەرەو ڕۆژئاوا چوو و ویژدانی زانا و بیریارەکانی ڕۆژئاوای بڕی.

* بنـەڕەتی بوژانـەوەی ئیـسلام لـە نـاوخۆوە لـە قۆنـاغی دواکـەوتن دا بنـەڕەتێکی سروشتیە چونکە بزاڤی بێداریخوازی ئیسلامی خێرا لەنێو بەرنامەکانی فەلسەفە و کەلامەوە (جەمالەدین و موحەمەد عەبدە) گۆڕا بۆ بەرنامەی قورئانی (حەسەن بەننا) و موسـڵمانان خێـرا چـالاکی بـە ڕۆژئـاوایکردن و نەخـشەی شـاڵاو و دامـەزراوەکانی موژدەبەری و ڕۆژهەڵاتناسی و پێناوەکانی خوێندنگە و ڕۆژنامەگەرییان ئاشکراکردن.

* نەخـشە بنەڕەتیەکـە: بـەرگریکاری دژ بـە توانـەوەی کەسـێتی ئیـسلامی و جەختکردنەوە لە خودێتی و مۆرکی جیاکاری و ئاشکراکردنی بانگەشەکانی بـێ هیـوا بـوون و ئـەو گومانـەی قەڵـەمڕەوی بیـانی هـەوڵی دەدا لـە نێـو موسـڵمانان دا بـڵاوی بکاتەوە.

دیارترین ئامانجی ڕۆژئاواگەرای و شاڵاوی ڕۆشنبیری چاندنی بیرۆکەی بێ هیوا بوون بوو لە دەروونی مرۆییدا و بەکەم دانانی بەها ئیسلامیەکان بـوو، هـەروەها ئـەو قـسەی دەڵێ شکستی موسڵمانان و عەرەب لەبەر پەیوەست بوونیانە بە ئیسلام. لـە ڕاسـتیش دا بەکەم سەیرکردنی پەیوەست بوون بـە ئیـسلام لای موسـڵمانان هۆکـاری شکـستیان بوو. چونکە بەرنامەی ئیسلامی هەمیشە توانای ئـەوەی هەیـە موسـڵمانان لـە شکـست بپارێزێ و بەرەو بیروباوەڕی شوێنی حەقی خۆیانیان ببات.

لە دیارترین ڕێنماییەکانی ئیسلام بانگکردنی موسڵمانانە بۆ بەرەنگاری خۆچـواندنی بیانی و سوور بوون لەسەر ئەوەی کەسێتی موسڵمان جیاو سەربەخۆ بێت و کۆمەڵگـەو ژیـاری ئیـسلامیش سـەربەخۆ بێـت، بۆیـە جـەنگێکی بێباکانـەی دژ بـە خۆچـواندن و شوێنکەوتەیی ڕاگەیاندووە و ئەو حوکمەی داناوە هەرکەس خـۆی بـچوێنێ بـە خـەڵکی ئەوا لە دەستەی خۆی جیابووەتەوەو لەو دەستەی تـرە کـە خـۆی بـەوان چـوواندووە.

هەروەها بانگەواز دەکات بۆ ڕاگەیاندنی جیاکاری خۆی لە نێوان گەلان دا لەڕووی نەریت و ڕەوشت و ئاکارەوە.

لەبەرئەوەی موسڵمانان ئەڵقەیەکی ناو ژیاری یۆنانی ڕۆمانی نەبوون، ئەو ژیارەی لە ژیاری مەدەنیدا نوێ بوویەوە وەك هەندێ لە بانگخوازانی ڕۆژئاواگەرایی بانگەشەی بۆ دەکەن. کەواتە دەبێ بوترێ ئیسلام جیاکاری نێوان دوو سەردەمی مێژووی مرۆڤایەتیە، چونکە ئیسلامە ژیاری تایبەت و چەمك و واتای سەربەخۆ و مۆرکی ئازاد و جیا لە مەنتیقی یۆنان و بتپەرستی فارس و فرەخودایی هیندی هەیە.

زۆرێ لە مێژوونوسانی جێمتمانە ئەوەیان بۆ جیهانیان سەلماندووە کە ئیسلام هاتووە تا پەڕەیەکی نوێ بۆ مرۆڤایەتی هەڵبداتەوە و چی پێشترە پێشەکیەو ئاگاداربوونە لە مێژووی هەزارساڵی پێش ئیسلام لەنێوان بتپەرستی ڕۆمان و دەستەوسان و بارگرژی پلان و چەمك و واتای مەسیحیەت و تێکەڵکردنی سروشتی ئاسمان بەبیری ساوای مرۆڤایەتی تا بەچاکی هەست بکات بەواتای فەرمایشتی خوای گەورە ﴿لِيُخْرِجَكُم مِّنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ﴾.

بەڕاستی ژیانی مرۆڤایەتی بەتەواوی تاریك داگەڕابوو هیچ دەربازبوونێ لەو تاریکیەو ڕەقی و سەختی و نەزانی ئەو تاریکیە نەبوو. تا ئیسلام بوو بەو ڕۆشناییەی جارێکی تر مرۆڤایەتی گێڕایەوە بەرەو لای خوا، بەرەو فیترەت، بەرەو ئەو بەڵێنەی کە خوا پێش دروستکردنی مرۆڤ لە مرۆڤی وەرگرتبوو.

لەگەڵ پێشکەوتنی عەقڵی مرۆڤ دا ئاینەکان یەك دوای یەك هاتن تا بەهاتنی ئیسلام گەیشتە لوتکە و مرۆڤایەتیش گەیشتە سەردەمی پێگەیشتن، لەم پێناوەدا هەموو کتێبەکانی پێش ئیسلام ئاماژەیان کردووە بەکۆتا پێغەمبەر ئەو پێغەمبەرایەتیانەی پێشوو پێشەکی بوون بۆ ئاینی کۆتا. بۆیە ئەوە ڕاستی یەکخواپەرستیە نەك وەك ئەوەی هەندێ دەڵێن لەگەڵ دەرکەوتنی جولەکەدا بووە. پێغەمبەرایەتی پێش ئیسلام

ناوچەیی بووە و هەر پێغەمبەرێ بۆ گەلی خۆی بووە و شەریعەتیش کاتی بووە و هەر شەریعەتێ بۆ سەردەمی خۆی بووە. کاتێ ئیسلام هات بۆ جیهانیان و شەریعەتێکی هێنا تا ڕۆژی دوایی بەکاربێت و پەیامەکانی پێش خۆی دوای ئەو هیچیان بەکار نەمان بەهۆی بوونی موعجیزەی ناوچەییەوە، بەڵام ئیسلام موعجیزەی گەورەی هەتایی پێبوو. مەسیحیەت وەك تەواوکەری پەیامی موسا و بەتەنها بۆ بەنو ئیسرائیل هات. کاتێ لە چوارچێوە خواییەکەیەوە بەرەو ئاینێکی جیهانی چوو گۆڕاوەو دەستکاری لە کرۆك و ڕوخساریدا ڕوویدا. ئیدی ئەلقەیەك بوو لە ماوەیەك کە بە هاتنی ئیسلام کۆتایی هات. عیسا هات و دانی نا بەڕاستی تەورات دا و موژدەی هاتنی پێغەمبەرێکی دوای خۆی پێبوو کە ناوی ئەحمەدە. کاتێ دژایەتی ئەو ڕاستیەیان کرد و لایان دا جوولەکایەتی بوو بە ئاینێکی دەمارگیری و مەسیحیەتیش بوو بە ئاینێکی لاهوتی بێ شەریعەت بەڵکو تەنها چەند ئامۆژگاریەك بوون. لێرەوە گەلی مەسیحی ڕۆمانی هەوڵیدا شەریعەتێ بۆ خۆی دابنێ و نیزامی ئایدۆلۆژی مرۆیی کرد بە بەرنامەی خۆی. مۆرکی ئەو نیزامەش لیبرالی سەرمایەداری بوو کە خێرا دەستەوسان وەستاو لە نێوەندیدا نیزامێکی دژ دەرکەوت کە ئیشتراکیەت بوو، تا ئێستاش لە دژایەتی یەکتردان و هیچکامیشیان ئەو بەرنامە باڵایان پێشکەشی مرۆڤایەتی نەکردووە کە گەلان هەموو لەنێوەندی ئیشراقی ڕۆح و دادوەری ماددەدا بچن بۆی. ئیسلام پێش ئەو دوو بەرنامە کەوت و ئەو بەرنامە خواییەی پێشکەش کرد کە هیواکانی مرۆڤ بەدیدەهێنێت هەر لە دادپەروەری و ڕەحمەت و ڕاوێژ و برایەتی مرۆڤایەتی. بەڵام ئەو گیانی دەمارگیریەی دوای دەرکەوتنی ئیسلام ڕۆژئاوای داگرتبوو وای لە ڕۆژئاوا کرد دژ بە ئیسلام و ڕێبازەکەی بجەنگێ و گومان بخاتە بەهاکانی و خەڵکی لە ئیسلام دووربخاتەوە. ئەمەش نەبادا لەبەر فراوانی و سادەیی ئاینەکە خەڵکی بەرەو ئیسلام بچن، ئەمە جەنگەش کاتێ دەستی پێکرد کە زانستەکان وەرگێردران و ئەزموونی گەندەڵی هەندێ

بیردۆزەی ناو کتێبە پیرۆزەکان دەرکەوت بەتایبەت سەبارەت بە چالاکی دروست بوون‌و تەمەنی زەوی. تاوانی دادگاکانی پشکنینیش لە بنەڕەت دا پەیوەست بوو بەو زانایانەوە کە فێری زانستی ئیسلام ببوون و دژی واتاو چەمکی کتێبە پیرۆزەکان بوون وەك گالیلۆ و کۆپەر نیکۆس. کاتێکیش پاشماوەی شالاوە خاچیەکان گەڕانەوە بۆ شارو وڵاتی خۆیان و گەورەیی ئیسلام و دادپەروەری فەرمانڕەوایانی موسڵمانانیان دیبوو، کڵێسا بێزاری ئەوە بوو و بەرەو ئاگری دەبردن. بەوە هەڵوێستەکان بۆ یەك شتی تەواو ئاڵۆز چوون:

بەرنامەیەکی ئەزموونی ئیسلامی کە ئەوروپا لە موسڵمانانی وەردەگرت و بانگەشەی ئەوەی دەکرد بەرهەمی خۆیەتی، هەروەها بیروباوەڕێکی پوخت و دروست کە ئەوروپا تیایدا بوو تا گومان بوروژێنێ لەپێناو پاراستنی شوێنکەوتووانی و دەورەدانی ئیسلام تا خودی موسڵمانان لە ئاینەکەیان بێزارین و دەستبەرداری بن.

بانگەشەیەکی بەرچاو بۆ جیاکاری نێوان ئاین و دەوڵەت و ئاین و کۆمەڵگە و ئەخلاق و کۆمەڵگە و بڵاوکردنەوەی ئەفسانە و خورافەو چەند بانگەوازێکی سەر شێوێنەر کە پێی دەوترا زانستەکانی دەروون و ئەخلاق و کۆمەڵگە کە لە تلمود و بیری کۆنی بتپەرستیەوە وەرگیرابوون دواتر هەموو ئەمانە تێکەڵ کران بە بەرزڕاگرتنی ڕەگەزی سپی سازدەری ژیارو سەپاندنی گەلی هەڵبژاردەی خوا بەسەر وڵاتی ئیسلام دا بە دەرکردنی موسڵمانان لە خاکی ئیسلام لەسەر بنەمای چەند ڕاڤەیەکی شێوێنەر بۆ تەورات و بەڵێنی خوا بۆ ئیبراهیم (علیه السلام).

ئیسلام دوو جار قولایی بیری ڕۆژئاوای بڕی: جارێکیان کاتێ ئەو بەرنامە ئەزموونیەی پێشکەش کرد کە ژیاری نوێی لەسەر دامەزرا و ڕۆژئاوای لە بیردۆزەی ئەرستۆ ڕزگار کرد سەبارەت بە تێڕامان و ئەوروپای لە ڕەهبانیەت ڕزگارکرد. جارێکی تریش کاتێ بزوتنەوەی چاکسازی ئاینی لە ئەوروپا سەریهەڵدا و پەیکەرو وێنەکانی

کڵێسا لابران، دکتۆر عومەر فەروج دەڵێت لۆسەر کاتێ بنەڕەتەکانی چاکسازی ئاینی ناو نەسرانیەتی دانان کە ناسراوە بە بزاڤی پرۆتستانتی. لە بەردەمی دا نوسخەیەکی قورئانی پیرۆزی دانابوو کە وەرگێڕدرابووە سەر لاتینی لە نیوەی یەکەمی سەدەی دوانزەهەمی زاینیەوە (ڕۆبەرت ئوف کشتدی ئینگلیزی وەریگێڕابوو) نوسخەکە لە ساڵی ١٥٤٣دا بڵاوکرایەوە. کاتێ تایبەتمەندیەکانی پرۆتستانتی دەبینین سەبارەت بە بەرپەچدانەوەی دەسەڵاتی پاپەوی و لەکارخستنی کەنارگیری و دان نان بە تەڵاق دا سەرەڕای دەستبەرداربوون لە هێماکان وەك وێنەو خاچ و جلی تایبەت بە قەشە و کەسە ئاینیەکان کەلە ئاینە بتپەرستیەکان و مەجوسیەت و جولەکە و مەسیحیەت دا باو بوو، ئیسلام هات تا ئەوە نەهێڵێ، بێگومان ئەو لایەنانەی چاکسازی لە ئیسلامەوە هاتبوون، ئەگەر نا دەبێ لەکوێوە هاتبن؟ پاشان مەسیحیەت هێشتا چەندین سەدە بوو لەبەر چەند هۆکارێکی جیاواز دژایەتی ئیسلامی دەکردو ئیسلامی تۆمەتبار دەکرد بە ڕەقی و توندی لەبەر بوونی تەڵاق. بەڵام هەمان ئەو مەسیحیەتە لە هەموو بەشەکانی خاکیدا و لە ڕۆمای پایتەختی ڤاتیکانیش دا وای لێهات ڕێ بدات بە تەڵاق.

بێگومان لە شۆڕشی چاکسازی ئاینی لە مەسیحیەت دا بەرهەمی ڕێنماییەکانی ناو ئیسلام بوو. کڵێسا دەیوت ئەو تاکە پەیوەندیە لە نێوان مرۆڤ و خوادا و هیچ نزاو نوێژیان داوای لێخۆشبونێ لە ڕێگەی کڵێسا و پیاوانی کڵێساوە نەبێت ناگات بەخوا. ئەوکات پیاوانی چاکسازی ئاینی (لۆسەر و کالڤن) و کەسانی تریش هاتن و وتیان پەیوەندی نێوان خواو مرۆڤ تاکە پێناوی لێخۆشبوون و هیچ رایەکی مرۆیی بۆی نیە تەقدیس حەرام بکات. ئەم واتایەش بە تەواوەتی لە ئیسلامەوە وەرگیراوە. هەروەها دەبینین ئیسلام لە دوو مەیدان دا (پێشکەشکاری هەبووە: مەیدانێکی دیارو ڕوون کە مەیدانی زانستە ئەزموونیەکان بوون کە ڕۆژئاوا تەنها چەند ساڵێکە دانی ناوە بەوەدا) مەیدانی کۆمەڵایەتی و نیزامی سیاسەت و ئابووری کە ڕۆژئاوا پشتی بەست بەو

فەرهەنگەی موسڵمانان کە گوازرا بوویەوە بۆ ئەوروپا و لە نوسینەکانیدا دانرابوون و دەیان بیردۆزەی بوارە جیاجیاکانیان لێ وەرگیرا بەتایبەت لە مەیدانی یاسا و کرین و فرۆش و جموجوڵدا. لەگەڵ ئەوەی موسڵمانان بە دامێنانی بواری زانستیان هەبوو پێشکەشی ڕۆژئاوایان کرد کەچی ڕۆژئاوا چی زانستێکی دەست کەوتبوو موسڵمانانی لێ بێبەش کرد کە لە بنەڕەت دا چەند زیادەکاریەك بوون بۆ ئەو بنەڕەتانەی کە موسڵمانان دایانڕشتبوون.

دیارە موسڵمانان کاتێ بەرنامەی ئەزموونیان داڕشت ژیاری بەرنامەی ئەوکاتی ئەوروپا بوون بەرنامەی تێڕامان- موسڵمانان دەیانڕوانیە بیری پێشووی مرۆڤایەتی ڕۆژئاوا و پشکنینیان بۆ دەکرد و هەندێکیان لێ وەردەگرت و هەندێکیان بەرپەرچ دەدایەوەو هەڵەی زۆری لە زانایانی وەك گالینۆسیان ئاشکرا دەکردن و هەڵەکانی ئەبوقران و ئەرستۆ و ئەفلاتونیان ڕاست دەکردنەوە. چونکە ئەو چەمك و واتایانەی ئەو کەسانە لەلایەن ئەوروپاوە بە پیرۆز سەیردەکران. دواتر موسڵمانان بەرنامەی کردەی زانستیان دامەزراند و دانیان نا بە چاکەی کەسانی پێشودا و ڕایانگەیاند مەعریفە لەپێناو سودی کۆمەڵگەدا بوون و گیانی لێکبوردنیان بۆ ئەو دەستانە هێنایە کایە کە لە سایەی موسڵمانان دا دەژیان و بەرێزەوە بژین. دواتر ڕۆژئاواییەکان هاتن و بەرنامەی زانستی ئەزموونیان دایە پاڵ خۆیان و زانستەکانی موسڵمانانیش هەر لە سەدەی دوانزەهەمی زاینیەوە لە زانکۆ ئەوروپیەکان دا دەخوێنران.

ڕۆگەر بیکۆن ڕایگەیاند ئەو خوێندکاری موسڵمانەکان بووە، بەڵام ماکس ڤانتاگۆ لە کتێبەکەیدا (**المعجزة العربیة**) سەبارەت بە بەخششی ئیسلامی لە بواری جەبرو ژمێریاری و گەردوون و جوگرافیا و هیتر دا نەیتوانیوە بە ویژدان بێ و دەیان کەسی تریش لەتاو ڕقیان لە موسڵمانان ئامادە نەبوون دان بنێن بەو چاکەی موسڵمانان دا. بەڵام کەمینەیەکی زانایانی وەك داریر و.... دانیان ناوە بەڕاستی ئەو ڕۆڵەدا کە

موسڵمانان پێی هەستاون. لەوانەیە مۆنتەگەری وات توانیبێتی دیوی نادیاری ئەو مەسەلەیە ئاشکرا بکات کاتێك دەڵێت: هەستکردن بە کەمی لە ئەورووپای ڕۆژئاوایی دا لەکاتی بەرەنگاربوونەوەی ژیاری ئیسلامی دا لە چەند لایەکی جیاجیاوەبوو. تەکنەلۆجیای ئیسلامی لەزۆر لایەنەوە لەپێشتر بوو لە تەکنەلۆجیای ئەورووپی، دەوڵەمەندانی موسڵمانان زیاتر لە ئەورووپیەکان خۆشیان دەگوزەراند و پێناوی خۆشگوزەرانیان لەبەردەست بوو. بەڵام ئەو ئەورووپیانە لەپێناو قەرەبووی هەستکردنیان بە کەمو کورتی پێویست بوو وێنەی ئیسلام بشێوێنن.

کاتێ ئەمڕۆ هەموو لایەنەکانی بەرەنگاربوونەوەی مەسیحیەت بەرامبەر بە ئیسلام لە سەدەکانی ناوەڕاست دا دەبینین بۆمان ڕوون دەبێتەوە کاریگەری ئیسلام لە جیهانی مەسیحی ڕۆژئاوادا زۆر گەورەتر بووە لەوەی کە گومان دەکرێ. چونکە تەنها ڕۆڵی ئیسلام ئەوە نەبووە ئەورووپای ڕۆژئاوایی بناسێنێ بەزۆرێ لە بەرهەمە مادديەکانی و دۆزینەوە تەکنەلۆجیەکانی و ورووژاندنی گرنگیدانی ئەورووپیەکان بە زانستە فەلسەفیەکان. بەڵکو هاوکات ئەورووپای هان دا تا وێنەیەکی نوێ بۆ خۆی پێکبهێنێ. بەرەنگاربوونەوەی دوژمنانەی ئەورووپیەکان بۆ ئیسلام هۆکار بوو تا لە شان و شکۆی موسڵمانان کەم بکەنەوە لە ڕۆڵ بینینیان لە ژیارەکەیان دا و زێدەڕۆیی لەوەدا بکەن کە فەزڵ و چاکەی کلتوری یۆنانی و ڕۆمانی زیاترە لەسەریان. دواتر ئەرکی ئێمەی گرۆی ئەورووپیە ڕۆژئاواییەکانە ئەو چەمك و واتا هەڵانە ڕاست بکەینەوەو بەتەواوەتی دان بنێین بەو ئاینەدا کە بەرامبەر جیهانی عەرەبی و ئیسلامی قەرزارین.

بەڵام ئەو ڕاستیانە بۆ ڕۆژئاوا ئاسان نین تا دانیان پێدا بنێن مەگەر چەند گۆڕانێکی گرنگ ڕوویدەن، دوای ئەوەی موسڵمانان توانییان پوچەڵی هەوڵی ئەورووپیەکان ئاشکرا بکەن کە هەوڵیان دەدا ئەوەی بەخشش و بەرهەمی ئیسلامە بە بەرهەمی ڕۆژئاوای دابنێن. ئەوکات ڕۆژئاوا ناچار بوون دان بنێن بە هەندێ لە ڕاستیەکان دا.

# باسی سێیەم

## ( پێش ئیسلام: بیرێکی تێکەڵ )

بیری ئەورووپی لەپێش ئیسلام لە چەند چەمك و واتایەکی بتپەرستی و یۆنانی و مەسیحی تێکەڵ بە یەك پێکهاتبوو کە کۆکراوەی چەمك و واتای بێ ڕەوشتی ڕەها و کۆیلایەتی ڕەها بوو کە مەسیحیەت بە شتێ لە ڕۆحیەت و ڕەحمەت هەندێ لە ئاگرەکەی کوژاندەوە بەڵام نەیتوانی زاڵ بێ بەسەر گیانی ڕەقی و توندیدا کە پاشماوەی فەلسەفە یۆنانیەکان و ژیاری ڕۆمانی بوو. بیردۆزە فەلسەفیەکان بە شتێ لەوەی کە لە تەورات و ئینجیلدا هاتبوون و هەندێکیان بە پێنوسی ئەحبار و ڕوهبانەکان نوسرابوون شێوا بوو. فەلسەفەکەش دابەش ببوو لەنێوان پەرستشی جەستە و ڕوهبانیەت (ئەبیقۆری و ڕەواقیەکان) دا کە دوو دیدی دژ بەیەك بوون لەسەر ڕاڤەی چەمکی بەختەوەری. یەکەمیان قەرەوڵی ئارەزووەکان و ئەوی تریش بانگەواز بۆ ڕزگاربوونی تەواوی ئارەزووەکانە. هەرکامیان لەدیدی خۆیدا زێدەڕۆ بوو و هەرکامیان لەگەڵ سروشتی گشتگیری مرۆڤدا نەدەگونجا کە بانگەواز دەکات بۆ جیایی لەوەی خوا حەڵاڵی کردووە بەبێ گەیشتنە قۆناغی دارمان. ئەمەش ئەو هاوکێشە ئیسلامیە ڕاستیەیە کە ئایینی حەق هەموو کاتێ بانگەوازی بۆ کردووە.

چەمکی بێ ڕەوشتی بەسەر هەردوو ژیاری یۆنانی و ڕۆمانیدا سەرکەوت سەبارەت بە هەنگاونان لە پشت ئارەزووەکان و پەرستشی جەستەکان ئەمەش ئەو چەمکەیە کە ژیاری هاوچەرخی ڕۆژئاوایی بە میراتی گرت و زێدەڕۆیی زۆری تیادا کرد. بەتایبەت دوای ئەوەی ئەورووپا کەوتە ئەو بازنەی ڕەهبانیەتەی کە خۆی بۆ خۆی زێدەڕۆیی بوو لەلایەنەکەی تردا. بەو جۆرە ڕۆژئاوا نەیتوانی ئەو پێوانی دادپەروەریە بزانێت کە ئاینی حەق بانگەوازی بۆ دەکات ئەویش قایم و قۆڵ کردنی ویستەکانی مرۆڤە دوو لە

دەرچوون لەو سنورو ڕێکخەرانەی کە پەیامە ئاسمانیەکان دایان ناون. بێگومان بیرۆکەی فەلسەفی یۆنانی سەبارەت بە بێ ڕەوشتی و بەرگ دامالین بنەڕەتی ئەو بانگەوازە بوو کە جولەکە لە سەردەمی نوێ دا لەژێر پەردەی ماسۆنیەت و بە ئامانجی دارماندنی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی بووەتە ئاڵا هەڵگری، ئەمەش بە بیرسەپێنی گەنجان هەر لە منداڵیانەوە بە چەند بنەمایەکی بانگەوازی جنس و لێکهەڵوەشان و پەروەردە کردنیان لەسەر شەرم نەکردن لە بینینی ئەندامی زاووزێیان لە یانە ڕووتەکان یان گەشتەکان دا.

هەروەها مەترسیدارترین شتێ فەلسەفەی یۆنانی ڕۆمانی بانگەوازی بۆ دەکرد بانگەواز بۆ ئەوەی کاروباری دەسەلات لەدەست کۆمەڵێکی هەڵبژاردەی خوادا بێت تا ئەو کۆمەڵە لە نێوان یەك دا هاوسەرگیری بکەن و بەشێوەیەکی بەکۆمەڵ منداڵیان بێ‌و دواتر دەوڵەت پەروەردەیان بکات وەك پاراستنی سەلامەتی ڕەگەزی هەڵبژێردراو، ئەمەش بانگەوازەکەی ئەفلاتونە لەو کۆمارەی دا کە دووجار سەرکەوتوو نەبوو لە هاتنەدی دا کاتێ دەرفەت گونجا بۆ دامەزراندنی حکومەتێك ئەو بانگەزەش مەترسیدارتین پەیامی فەلسەفی یۆنانی ڕۆمانی بوو بۆ ژیاری نوێی ڕۆژئاوا کە تا ئێستاش لە قولایی ناخی فەرمانڕەوایان و فەیلەسوفانی سەردەمیش دا ماوە با لەژێر چەند ناوێکی بریقەداری درۆزنانەش دا شاردرابێتەوە. ئەو بانگەوازە تەواو ستەمکارانەیە وای دەخواست ئیسلام لەناوی ببات. فەیلەسوفانی ئیغریق (ئەرستۆ و ئەفلاتون) داوایان دەکرد کۆیلایەتی ڕەوا بێ و کۆمەڵگە دابەش ببێت بۆ خانەدان و کۆیلەو جەختیان لەوە دەکردەوە بوونی کۆیلە ڕاستیەکی نەبووەو مافی خانەدانە کۆیلە قۆرخ بکات (ئەرستۆ) مەسیحیەت نەیتوانی ئەمە لە کۆمەڵگەی ئیسلامی دوور بخاتەوە. بەڵکو دواتر پاڵپشتی کرد وەك چۆن پاڵپشتی سووی جولەکەی کرد.

بیردۆزەی ڕەگەزەکان کە لە سایەی بیری نوێی ڕۆژئاوایی دا هەوڵ درا ڕابگەیەنرێت مەترسیدار ترین ئەو بانگەوازانە بوو کە ئیسلام دژایەتی کردنی ئەو بانگەوازەی ڕاگەیاند و جولەکەش ئەو بانگەوازەیان قۆستەوە تا بیردۆزەی گەلی هەڵبژاردەی خوا بسەپێنن بەسەر خەڵك دا، ئەمەش بیرۆکەیەکە پێی وایە کۆمەڵێکی دیاری کراو هەن ئاینی خوا تایبەت دیاری کردوون تا ببنە ڕێبەری جیهان ئیسلام ئەوەی چەسپاند کە بەڵێنی خوا لەگەڵ خەڵکدا لەخواترسانە، بەمە ئیسلام ئەو بانگەوازە دەمارگیریەی تێکشکاند کە لەسەر بنەمای خوێن و ڕەچەڵەك دامەزرابوو و ڕێی نەدا بەهۆی ئەو دوانەوە گەورەیی دیاری بکرێ. هەروەها ئیسلام هیچ جیاکاریەکی نێوان کۆمەڵی لەسەر بنەمای ڕەنگ یان ڕەگەز یان زمان دیاری نەکردووە بەڵکو تاکە جیاکاری لەخواترسان و کاری چاکەیە. هەروەها ئیسلام نیزامی خۆ بەزلزانی چینی تایبەتی تێك شکاند و کۆیلایەتی و سوخرەکاری نەهێشت و کۆیلەی ئازاد کردو بە چەندین شێوە دەرگای برایەتی گشتگیری بۆ کردنەوە.

هەروەها زانایانی ئیسلام ئەو مەنتیقەی ئەرستۆیان بەرپەرچ دایەوە کە لەسەر قیاس و بەڵگە خوازی نەزەری دامەزراوەو مەنتیقێکی نوێیان پێشکەش کرد کە تایبەتمەندیەکانیان دەربڕیوە کە ئەویش بەرنامەی ئەزموونی و کەسانی وەك کندی و فارابی و ئیبن سینا و ئیبن ڕوشدیان بە درێژکراوەی گیانی هێلینی ناو جیهانی ئیسلامی و هزری ئیسلامی داناون، ئەمەش بەڕاستی بەرنامەی ئەزموونی و بەرنامەی مەعریفەی خستەڕوو. ئیمام ئیبن تەیمیە دوای تێکشکاندنی هەڵەکانی ئەرستۆ بنەڕەتە عەڵقیە ڕووتەنەکانی مەنتقی قورئانی خستوونەتە ڕوو. لە مێژووی فەلسەفەدا تەواو بە ڕوونی تێکەڵ بوونی بیری یۆنانی ڕۆمانی و بیری جولەکە مەسیحی دەبینرێ، ئەو تێکەڵەیەی کە سەرچاوەکەی دەستەوسانی چەمکە ئاینیەکان بوو لە پێشکەش کردنی خۆیان بۆ خەڵك مەگەر ئەوەی لەڕێی چەند بیردۆزەیەکی فەلسەفیەوە خۆیان

پێشکەش بکەن کە زادەی ئەو تێکەڵیەن یان چەند شانۆگەریەك نیشانی بدەن، ئەمە ئیسلام بەتەواوی خۆی بەرز ڕاگرت لە قبوڵ کردنی چونکە فەلسەفەکان کاتێ وەرگێڕدران نەیانتوانی ئیسلام دەورە بدەن وەك ئەوەی تەنگیان هەڵچنی بە جولەکە و مەسیحیەت، بەڵکو زانایانی ئیسلام قەرەوڵیان بۆ گرت و ساختەکانیان ئاشکرا کرد و ئەو نەگونجانە قوڵەی لەگەڵ بەرنامەی ئیسلام دا هەیبوو خستیانە ڕوو، چونکە ئیسلام ڕوون و سادە و ساکار بوو و هیچ کۆت و ئاڵۆزیەکی نیە کە پێویست بە شێوەی فەلسەفی بکات. ئەمە لە کرۆك دا بەتەواوی جیایە لەو چەمکە بتپەرستی و کۆیلایەتیو فرەخودایی و بێرەوشتیانەی کە دیاردەی ڕوونی هزری تێکەڵی ڕۆژئاواین.

دیارە موسای کوڕی مەیمون (فەیلەسوفی جولەکە) فەلسەفەی ئەرستۆیی بەسەر جولەکایەتیدا جێبەجێ کرد وەك چۆن موسا ئەکوینی فەلسەفەی ئەرستۆیی بەسەر مەسیحیەت دا جێبەجێ کرد، کاریگەری فەلسەفەی یۆنانی لە مەزهەبە فەلسەفیەکانی ڕۆژئاوادا بەڕوونی لەبەرچاوە. دواتریش لە نوسینەکانی بیکون و دیکارت و ئەسینوزا و لینینز و هیگلدا دەبینرێ، ئامانجی فەلسەفەی مەسیحی لەوە گەیاندنی بیردۆزەیەکی تەواو بوو بەجیهان سەبارەت بە گەردوون بوو، بەڵام ئیسلام پێویستی بەمە نەبوو چونکە لەسەر یەکخواپەرستی و پاکێتی وەستاوە. بۆیە ئیسلام لە کرۆکی خۆیدا بڕیاری خوایە بە تاکە دەسەڵاتی خۆی لە هەزموونی سەربوون و گەردوون دا و ئەوانەش هەوڵیانداوە فەلسەفەی یۆنانی و ئیسلام پێکەوە بگونجێنن وەك کندی و فارابی و ئیبن سینا ئامانجیان چەند مەبەستێکی دوور لە خزمەت بە ئامانجە ڕاستیەکانی ئیسلام بوو بەجۆرێ دواجار شوێنکەوتەیی هەندێکیان بۆ بانگەشە باتینیەکان دیارە سەرەڕای شکستی سەختیان لە بەدیهێنانی ئامانجی پێکەوە گونجاندنی بیری کۆیلایەتی یۆنانی و بیری ئیسلامی کە بانگەواز دەکات بۆ یەکسانی و

ئازادی و برایەتی مرۆیی. لەو نێوەندەدا لە نێوان بیری ئەرستۆو بیری ئەفلاتون دا پەکیان دەکەوێ کە هەرکام لەو دووانە دیدی جیای خۆی هەیە.

فەلسەفەی مەسیحیەت هەوڵ دەدات بە چەند چەمکێکی وەرگیراو لە فەلسەفەی کۆنی بتپەرستی بیانوو بێنێتەوە بۆ سیانە خودایی. بەڵام ئیسلام بۆ خستنەڕووی چەمکە ساکارەکانی لە یەکتا پەرستی دا پێویستی بە فەلسەفە نەبوو. بۆ شانۆو گرێی ململانێی نێوان خواوەندەکان و مرۆڤیش هەر وایە. ئیسلام پێویستی بەو پێشکەش کردنە نیە کە لێکۆڵەرانی بەراوردی ئاینەکان دەیڵێن: جولەکە لە سەردەمی فیلون دا (کە لەنێوان سالآنی چلی پێش زایین بۆ چلی دوای زایین ژیاوە) ئاینییان تێکەڵ بە فەلسەفە کرد تا ئەوەی بانگەشەی ئەوەیان دەکرد فەلسەفەی ئیغریقی و ئاینی موسایی لە بنەڕەتێکن. لە هەمان کات دا دەبینین ئەو ئەفلاتونە نوێیەی بە مێژووی ئەفلاتونی کۆچکردووی ٢٧٠ز. دەست پێدەکات تێکەڵە بە ئاینی مەسیحی و ئەو نەساتیرە و یەعقوبیانەی بیردۆزەکانی ئەو خوێندنگەیان بە میراتگرتن (ئەفلاتونی داهێنراو) کە لە وڵاتی فارس و عێراق و سوریا بوون لە کاتی فەتحی ئیسلامیدا. پاڵیان دابوویەوە بە لێکۆڵینەوەی فەلسەفەوە تا ئەوەی نێوەندبوون لە گواستنەوەی ئەو فەلسەفەدا بۆ موسڵمانان. کاتێ فەلسەفەی یۆنانیشیان گواستەوە بە ئامانەتەوە نەیانگواستەوە بەڵکو تێکەڵیان کرد بە چەمك و واتای مەسیحی خۆیان. خوای گەورە ڕاست دەفەرموێت: ﴿وَقَالَتِ الْيَهُودُ لَيْسَتِ النَّصَارَى عَلَى شَيْءٍ وَقَالَتِ النَّصَارَى لَيْسَتِ الْيَهُودُ عَلَى شَيْءٍ﴾

# باسی چوارەم

## ( ڕۆژئاوا چی وەرگرت و چی بەخشی )

ئەمەوێت وێنەیەکی بیر ڕۆژئاوا بخەمە ڕوو پێش ئەوەی تیشکی ئیسلام بگاتە ڕۆژئاوا. ئەو بیرە تێکەڵەی بەڕای لێکۆڵەرانی بیروباوەڕ و فەلسەفەکان تێکەڵەی بیری یۆنانی و بیری ڕۆمانیە. بیرێکی مرۆیی و پاشماوەی ئاینی جولەکەو مەسیحیە. مەسیحیەت ئاینێکی تەواوکەری پەیامی مووسایە بە کتێبێکی جیا لە تەورات کە ئینجیلە، بە شێوەیەکی جیا چەمك و واتاکانی ئەو دوو پەیامە دابەزیوە پەڕینەوە بۆ ڕۆژئاوا پاش ئەوەی ئارەزووی پیاوە ئاینیەکان ڕکەبەریان بوون بەو جۆرەی قورئانی پیرۆز ئاماژەی پێداوە ماوەی چواردە سەدە وابوو. لە دەیەکانی کۆتاییدا لێکۆڵینەوەی گەورە پیاوانی لاهوتی جولەکەو مەسیحیەت جەختیان لەوە کردوەتەوە. دیارترین بەخششەکانی ئەو بیرە لە هەردوو فەیلەسوفی گەورە ئەفلاتون و ئەرستۆدا خۆی دەبینێتەوە جیا لە ڕەوتی یەکەی کە وێنای ناکۆکی فەلسەفەی هەموو جیهان دەکەن. چونکە ئەفلاتون لە چەمك و واتای دا پەیوەستە بە حەدەس و ڕۆح، ئەرستۆش پەیوەستە بە ماددەوە. بۆیە ئەرستۆ بنکەی بنەڕەتی بیری ماددی ڕۆژئاوا بوو، ئەو بیرەی دوای ناکۆکی نێوان بیری مەسیحی لاهوتی کە کورتی هێنا و نێوان بیری زانستیو ئەزموونی کە بیری فەلسەفەی ماددی لێکەوتەوە هەنگاوی نا.

لە هەمان کاتدا کاتێ ئیسلام پەڕیەوە بۆ ڕۆژئاوا و لەگەڵ خۆیدا چەمك و واتاکانی خۆی لەبواری زانستی ئەزموونی یان بەرنامەی مەعریفەدا بردە ئەوێ (بە چەمك و واتاکانی بواری مێژوو و کۆمەلایەتی و ئابووری و پەروەردەوە) ئەرستۆ بەتەواوەتی لێی کشایەوە و وەك چۆن موسڵمانان پێشتر لە سەدەی چوارەمی کۆچیدا هێرشیان بردە سەر بیری ڕۆژئاوایی هێرشی بردە سەر. بەڵام بزاڤی شالاوی هزری و

ڕۆژئاوایگەری خێرا بەرنامەی ئەرستۆی سەپاند بەسەر بەرنامەکانی خوێندن و ڕۆشنبیری جیهانی ئیسلامیدا تا موسڵمانان لە بازنەی بیری تێڕامان دا پەنگ بخۆن و لەو بیرە ئەزموونیە بێبەش بن کە پێشتر خۆیان پێشکەشی ڕۆژئاوایان کردبوو و ژیاری نوێی لەسەر دامەزرا. بیری ڕۆژئاوایی سودمەند بوو لە بیردۆزەکانی موسڵمانان لە زانستەکان دا (لە بوارە جیاجیاکان دا) کە هەندێکیان ئەوە دەزانن (ڕۆجەر بیکۆن و رابرودیکارت) بەڵام فرنیس بیکۆن نکۆڵی لێ دەکات. بەڵام دەقەکان سەرچاوەکانی ئەویان ئاشکرا کردووە کە نوسینەکانی غەزالین لە کتێبی (المنقذ من الضلال) و نوسینەکانی شافعی لە نامەو نوسینەکانی و هیتریش. بەڵام مەسەلەکە ئەمەیە: هەڵوێستی ڕۆژئاوا چی بوو؟ بەڕاستی کاڵای گەنیوی خۆیان فرۆشت بە ئێمە و زیاتر لە نیو ملیۆن دەستنوسی بیری دەست بەسەردا گیراوی موسڵمانانیان لای خۆیان شاردەوە. هەوڵی لادانی موسڵمانان لە بەرنامەی بیری ڕەسەنی خۆیان ئامانجێکی گەورەی ڕۆژئاواگەری و شاڵاوی هزری بوو بەو بڕوایەی ئەوە تاکە پێناوی مانەوەیانە واتە مانەوەی موسڵمانان– لە بازنەی داخراودا و موسڵمانانیش بەردەوام نغرۆ دەبن لە لێکۆڵینەوەی فەلسەفەی کۆن و نوێی ڕۆژئاوا داو بەڕاڤەی ماددی لە مێژووی ئیسلامی تێدەگەن و ئیبن سینا و فارابی بە فەیلەسوفانی ئیسلام دادەنێن.

ئەو کارەش جەختکردنەوە بوو لەو ئاراستەی کە لویسی نۆیەم دوای شاڵاوی نۆیەمی خاچی پێشکەشی کرد (ئەی ئوممەتی مەسیحیەت ئەگەر دەتانەوێ بەسەر ئەم ئوممەتەدا سەرکەون واتە ئوممەتی ئیسلامی– دەی ڕەوشتیان داڕمێنن و با چەند بەدیلێك بۆ هەوادارییان پەیدا بکەن جیا لە هەواداری بۆ خواو پێغەمبەرەکەیان و باوەڕداران. چەند هەوادارییەکی نوێیان بۆ بێننە کایە) ڕۆژنامەی لومۆندیش قسەی لەسەر کردو وتی (بڕوام وایە ئەگەر نەتوانین بەرەبەرە موسڵمانان لە ئاینیان لا بدەین و بەرەو مەسیحیەتیان ببەین ئەوا بە دڵنیاییەوە ئەنجامی دڵنیایی بۆ ئەوە گیانێکی

نەتەوەگەرایی نوێیە کە وا دەکات لە ئیمپراتۆریـەتی داگیرکـەری لـە بـاکوری ئـەفریقادا دەرمان بکات. تاکە پێناوی دەرنەکردنمان لە ئیمپراتۆریەت ئەوەیە دانیشتوانی ئـەوێ بکەینە فەڕەنسی. تاکە پێناوی ئەوەش ئەوەیە بیانکەین بە مەسیحی).

لەو پێناوەدا قەڵەمڕەوی بیانی لە ئاسۆی بیری ئیسلامی دا پێشنیاری دۆسیەیەکی تێکـەڵی بـیری یۆنـانی و ڕۆمـانی و مەسـیحی و جولەکـەی خـستەڕوو تـا گومانـەکان بوروژێنن و دەروونەکان بلەرزێنن و دڵەکان گومانـاوی بکـەن. بـەڵام زانایـانی موسـڵمان بەرامبەر ئەو بیرە وەستان و ساختەکانیان ئاشکرا کردن و گەنـدەڵی خراپـەو لادانـی و دەستەوسانی ئەو بیرەیان لە بەخشینی بەرامبەر پڕاوپڕی و لێکبوردن و ئاسـۆ فراوانـی ئیسلامیان ئاشکراکرد.

ئەو بەرەنگاربوونەوەی زانایـانی موسـڵمان لـە سـەدەی سـێیەمی کۆچیدا بەرامبـەر بیری یۆنانی نواندیان و بەرەنگاربوونەوەی زانایانی موسـڵمان لەلایـەن بـیری ڕۆژئـاواوە لە سەدەی چواردەی کۆچیدا لە بەهێزی و ڕەسەنیەتەوە، ئەگەر هەر واتایـەکی هـەبێت ئەوا واتای ئەوەیە موسڵمان توانای هەیە بەیەکجار بیری ڕۆژئاوا تێبپەڕێنێ بـۆ بیرێکـی مرۆڤانەتر و قوڵتر و بەهێزتر لە چارەسەری کێشەکانی سەردەم لەسـەر بنـەمای ئیمـان بەخوای تاك و تەنها و بە ڕەوشتی ژیان و بەرپرسـیارێتی تاکەکەسـی، ئـەوە بەرنامـەی گشتگیری ئیسلامە.

(ئەو بنەما و بیرو فیکرانەی لە کۆمەڵگاکانی ڕۆژهەڵات یان ڕۆژئاوایشدا گونجاون بـە پێویـست و شـیاونین بـۆ کۆمەڵگـەی جیهـانی ئیـسلامی ئێمـە. کۆمەڵگـەی ئـەورووپیش پێویـست نیـە نمونـە بـێ بـۆ هـەموو کۆمەڵگـەکان و مرۆڤایـەتیش ژیـاری ڕۆژئـاوای تێپەڕاندووە بۆ ژیارێکی باشترو تەواوتر کـە هاوسـەنگی نێـوان لایـەنی ڕۆحـی و لایـەنی ماددی ڕادەوەستێنن و بڕاوبوون بەخوا دەکەنە پاڵپشت و وەستێنەری) ئەمە دەربڕینی دکتۆر غەنیمی تەفتازانیە.

وەرگێڕانی فەلسەفەی یۆنانی بۆ زمانی عەرەبی لە سەدەی سێیەمی کۆچیدا لە پیلانێ دەچوو کە شعوبی و باتینیەکان دوژمنایەتی ئیسلام دایاننابێ و لە ئامانجی حەقیقی وەرگێڕانی زانستەکان دەرچووبێ، ئەو ئاڕاستە مەترسیدارەی کە مەئمون لەسەری چوو و دەیدایە پاڵ زانایانی کەلام و موعتەزیلە کە فەلسەفەی یۆنانی کرد بوونی بە بنەڕەت و لە چەمك و واتای ئیسلام دەریکردبوون یاریدەدەری ئەو پیلانە بوو.

بەلام بەهێزی و توانا و ڕەسەنی ئیسلام توانی هەر لە یەکەم چرکە ساتەوە بدات لەو پیلانە و ساختەی بانگەشەی بیری یۆنانی و مەجوسی و هیندی و فارسی ئاشکرا بکات. بەلام مەترسیەکە ئەوکات سەریهەڵدا کە لە سەردەمی نوێدا لەسەر دەستی بزاڤی ڕۆژئاواگەری و ئەو شالاوە فیکریە سەریهەڵداوە کە هەوڵی دەدا لە ئاسۆی بیری ئیسلامیدا تێکەڵەی چەمك و واتاکانی یۆنان و فارس و کۆمەڵێ لە فەلسەفە شێواوە باتینی و فەلسەفەو ماددی و بتپەرستی و بێ ڕەوشتیەکان پێشنیار بکات بە مەبەستی داڕمانی چەمك و واتای ئەهلی سوننەو جەماعە. ئەمە ئەو جەنگە بوو کە هەر لە سەدەی چواردەی کۆچیەوە بەهێزانە بەرەنگاری بووینەتەوە. زۆرێ لە لێکۆڵەرەوان مەترسیەکانی وەرگێڕانی فەرهەنگی یۆنانیان باسکردووە کە لە سەردەمی نوێدا فراوان بوویێ ئەوەی ڕێنمونیکەرێکی دروست یان توانایەکی پێشوەختی هەبێ بۆ ئاشکرا کردنی ساختەکاریەکانی.

ئەو بزاڤی وەرگێڕانەی کە نەساتیرەکان ئەنجامیان دا کۆمەڵێ چەمکی خراپی فەلسەفی پێشنیار کرد کە بتپەرستیە یۆنانیەکان دەیانهێنان و دەیانبردن و ناویان نابوو زانستی بتەکان و کۆکراوەی بتپەرستی مەجوسی و بوزی و ئەبیقۆری بوو و دواتر فەلسەفەکانی شۆبنهورو بوونکەرایی و سارتەر و خواوەندی کشتوکاڵ و چنینەوە و چاکە و خراپە و ڕازیکردنی خواوەندان بەمەی و بێ بەرگی ناو پەرستگاکانی

دروستکرد. هەروەها کۆکراوەی چەمك و واتای سۆمەری و بابلیەکان و تەموز و ئەدۆنیس و عەشتروت و پەرستشی مانگا لە میسر. چەند فەیلەسوفێ بە چەند ئامانجێکەوە تاویاندایە ئەو گۆماوە کە خێرا دەرکەوتن وەك فارابی و ئیبن سینا و شوێنکەوتوانیان لە هەڵگری پەیامەکانی ئیخوان صەفا و بانگەشەکەرانی قەرامیتە و زنج.

نوسەری (**المقتطف**) بەم دەربڕینە وێنەی ئەو ماوەیە نیشان دەدات:

(حەوزی دەریای ناوەڕاست لە سەدەی یەکەمی زاینیدا سەکۆیەکی شانۆی جەنگێکی گەورەی هزری بوو کە تیایدا دوو ڕۆشنبیری ئیغریقی و عیبری (ئیتالْیا، سوریا، میسر، یۆنان) لەپێش مەسیحیەت خەباتیان دەکرد. جەنگەکە لەسەر ناکۆکی نێوان عەقڵ و ئاین بوو). ئەم دەقە جەخت لەوە دەکاتەوە جولەکایەتی لەبەردەم ئەو بیرە یۆنانیەدا شکاوە کە بڕوای هەبووە بە بێ ڕەوشتی یۆنانی.

چەمك و واتای بیری ئیغریقی کە نزیکی بیری دواتری ڕۆمانیە لە چەند چەمك و واتایەکی بنەڕەت دا پوخت بوەتەوە:

**یەکەم: بەیاساکردنی کۆیلایەتی:** ئەفلاتون خەڵکی بۆ سێ چین دابەش دەکات: یاسادانەران و جەنگاوەران و پیشەسازان. یەکەمیان ئەوانەن جیا لەوانی تر دەسەڵاتیان لەدەستە و بە دەستەی زێڕین ناسراون. جەنگاوەران پاسەوانی دەسەڵاتەکەن و بە دەستەی زیوین ناسراون. پیشەگەران دروست کراون تا گوێڕایەڵی کوێرانەیان هەبێت و بە دەستەی ئاسنین ناسراون. بە کۆیلەکانیش دەڵێت ڕانە ئاژەڵی گەلن و نمونەیان وەك ئاژەڵی بەستراوەیە. ئەمەش ڕای ژیارە کۆنەکانی فارس و هیندو فیرعەونیە سەبارەت بە کۆیلایەتی.

**دووەم: شکستی بیرۆکەی مەدەنیەتی چاکتر:** ئەفلاتوون داوا دەکات لە کۆمارێکی بچوك دا کۆمار بێتە دی پێی وترا تۆ لە بەدیهێنانی کۆمارەکەدا تەواو بارەکەت سپاردووە ئەویش شکستی هێنا، ئەویش بیست ساڵ دانیشت و دوای ماوەیەك

گەڕانەوە بۆ ئەزموونەکە ڕوویدایەوە، دوای ئەوەش جارێکی تر بە تەواوەتی شکستی هێنا.

ئەفلاتوون بانگەواز دەکات بۆ تەناسوخ کاتێ ئەرستۆ باسی ئەزەلیەتی مادده دەکات. بیری ئەفلاتونی بەتەواوەتی زاڵ بوو بەسەر خوێندنگە باتینیەکانی ئیشراق و صۆفیەت دا لەبەر دیدی میسالی کە ئامانجی بەکەم ڕوانینە جەستەی مرۆڤ و ئارەزووەکانیەتی. ئەم فەلسەفەیە لەلایەن هەوادارانی فەلسەفەی ئیشراقیەوە بەکارهات و لای زۆربەی فەیلەسوفەکانی عەرەب دەرکەوت بەتایبەت سەبارەت بە دەروون چونکە لای ئەوان دەروون وەك ئەوەیە کە ئەفلاتون پێی وایە کرۆکێکی ڕۆحیانیە و دەتوانێ جیهانی هەست پێکراو و جەستە تێپەڕێنێ بۆ جیهانی ربوبیەت و صەفا. کاتێ نوسینەکانی فارابی و ئیبن سینا و ئیخوان صەفا و کندی و ئیبن روشد و کەسانێکی تر دەخوێنیتەوە دەبینیت لە دانراوە فەلسەفیەکان دا زۆر باسی ئەفلاتون دەکەن کاتێ قسە لەسەر نەفس دەکەن. چەمك و واتای ئەفلاتون بۆ نەفس جیایە لە چەمك و واتای دروستی ئیسلام، کاریگەری ئەفلاتونی لە نامەکانی فارابی دا (رای ئەهلی شارستانیەتی باڵا) زۆرە. نوسینەکانی ئیبن سینا هەڵگرراوەی ناو و نوسینەکانی ئەفلاتونن، هەروەها چی لە نامەکانی ئیخوان صەفا دا هەن سەبارەت بە فەیز و ئیبداع، ئەفلاتۆنی گوازرایەوە بۆ فەیلەسوفانی ئەسکەندەری فیلون و زمانی عەرەبی، ئینجا وەرگێڕدرا بۆ زمانە ئەورووپیەکان.

نوسەرانی ڕۆژئاواگەری خێرا هەوڵیان دا نوسەرانی عەرەب سەرسام بکەن بە ئەفلاتۆن و ئەرستۆ، سەلامە موسا لە کاتی قسەکردنی لەسەر بیرو گەورەیی بیری ئیغریقی دەڵێت نوێگەری ڕاپەڕیو ناتوانێ وابێ مەگەر ئەوەی لە چەندین کۆت دەرباز بێ چ سەرچاوەکەی شەریعەتەکان بن یان نەریتەکان. کاتێ باسی خەونەکەی ئەفلاتۆن

دەکەن سەبارەت بە کۆماری باڵا ئاماژە ناکەن بە شکستی لە پەیڕەو دا. بەڵام ئاماژە دەدەن بەوەی فارابی بیرۆکەکەی لەوەوە وەرگرتووە.

**سێیەم: ناوداراانی ئافرەت:** ئەفلاتۆن داوا دەکات ژن و پیاو تێکەڵ بن و بە یەك بگەن بێ ئەوەی ئافرەتێ بۆ پیاوێ دیاری بکرێ تا ڕەگەزەکان تێکەڵ بن و کەس دایكو باوکی خۆە نەناسێتەوە و منداڵ نەدرێتەوە پاڵ باوکێکی ناسراو، بەوە منداڵ کە پەروەردە دەبێ تەنها هەواداری بۆ نیشتمانیەتی. داواش دەکات گرنگی بدرێ بە جیاکاری و گەورەو چاك جیاکردنەوەو ڕێ نەدرێ چینەکان تێکەڵی جنسییان بۆ دروست بێ، چونکە هەر چینێ ژن و پیاوی خۆی هەیە و نابێ بچنە چینی تر، هاوکات داوا دەکات هاوسەرگیری و موڵکداری لەنێوان دوو چینی جەنگاوەرو ئەوصیادا نەمێنێ. لەبەرئەوەی ئەو نیزامە دید و ڕوو و شێوەی گەندەڵ و خراپە ئەوا بە سەختی شکستی هێنا بەوە شکستەکە بەسەر هەردوو ئەو ئەزموونەدا دانرا کە ئەنجامی دان، چونکە خۆی وەك یاسا دانەری گەورە دانا و یاسا و تەشریعاتی خۆی دەرکردو پشتی بەستبوو بە بیرو ئارەزووی خۆی. مەبەستیش ئەوە بوو کۆیلایەتی بچەسپێنێ و ڕێ نەدان چینەکانی خواروو هەوڵی گەشە و گۆڕان بدەن.

دکتۆر حەسەن شەرقاوی دەڵێت: مارکس ئەزموونەکەی ئەفلاتۆنی وەرگرت و وایزانی دەکرێ هەڵەکەی ئەفلاتون لەوەدا بێ کە پشتی بەستووە بە چینی بیریاران ئەمە وای کردووە شارەکەی لە پەیڕەودا شکست بێنێ. بۆیە مارکس چینی فەیلەسوفانی گۆڕی بە چینی گشتی و ئەو چینەی کرد بە چینی فەرمانڕەوا و هەموو ئەو دەسەڵاتانەی دایە دەست کە هی چینی فەیلەسوفان بوون، سێگۆشەیەکی کێشاو بنکەکەی کرد بە لوتکە و لوتکەکەشی کرد بە بنکە و بیری ئەفلاتونی هێنا و زیاد لە گرنگیدانی بە عەقڵ گرنگی دا بە گەدە. لینینی خوێندکاریشی یەکەم جێبەجێ کاری شیوعیەت لە ڕوسیا ئەو بیردۆزەی جێبەجێ کرد، دەی ئایا ئەوە بەختەوەری بۆ مرۆڤ بەدی هێنا؟؟!

شیوعیەت مرۆڤی خستە چالأیی شیوو كردی بە كۆیلەی ماددە دوای ئەوەی پێشتر مرۆڤ گەورە و بالاّ بوو. هەروەك لە بیرو عەقلّ و ئاینی پێ ون كرد. هەروەها هیتلەر بیردۆزەی دەسەلأتداری ڕەگەزی وەرگرت و كردی بە بنەڕەتی بانگەوازەكەی و شكستی هێنا وەك چۆن شیوعیەت و كۆماری ئەفلاتۆنی پێشتر شكستیان هێنا، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ لاڕێبوونی مرۆڤ و سەركەش بوونی كاتێ خۆی وەك یاسادانەری بالاّ دادەنێ و هەولّ دەدات بەرنامە یان نیزامێكی پێچەوانەی بەرنامەی خوا دابنێ. بەو جۆرە بیری مرۆیی كاتێ وا دەزانێ دەتوانێ نیزامی خوایی هەلگرێتەوە گەوزاو تێك شكاو دەبێ. هەلّەكانی ئەفلاتوون ئەمانە بوون:

- دەمارگیری بۆ چینی فەیلەسوفان و ستەم لە دوو چینی سەرباز و گشتی.
- هەلّسوكەوت لەگەلّ چینەكانی خوارەوە وەك هەلّسوكەوتی ئاژەلّ.
- هەلّوەشاندنەوەی باوك و فرزەندی.
- لەناوبردنی كەسی نەخۆش و شێواو و پەككەوتە بە كوشتن و پاكتاوكردنی.

ئەرستۆش لە چەمكەكانی بەرز ڕاگرتنی ڕەگەزیدا شوێن ئەفلاتون كەوت بەوەی دابەشیان دەكات بۆ گەورە و هێشتنەوەی كۆیلە و كۆیلایەتی چینەكانی خوارو، ئیسلام هات تا ئەو فەلسەفە مرۆییە سەرشێوێنە بە یەكجارەكی لە هەموو ڕوانگەیەكەوە هەلّبوەشێنێتەوە.

# باسی پێنجەم

## ( ئەرستۆ لەنێوان فارابی و ئیبن سینادا )

هـزری ئیـسلامی بـەرەو ڕووی بیردۆزەکـانی بـیری ئیغریقـی و یۆنـانی و هێلێنـی بوویـەوە. جارێکیـان لـە سـەدەی سـێیەمی کۆچـی و جـاری دووەمـیش لـە سـەدەی چواردەی کۆچی دا. لە جاری یەکەمدا کاتێ وەرگێڕانی ئەو بیرانـە ئـەنجام درا ئـەوکات زانایانی موسڵمان بەرامبەر بیردۆزەکانی ئەرستۆ لە مەنتیقدا وەستان و سـاختەکانیان ئاشـکرا کـردو بەرپەرچـی بیردۆزەکانیـان دایـەوە سـەبارەت بـە (دروسـتکەر) خـالق و ماددەو... هتـد. دوای ئـەوەی فـارابی و ئـیبن سـینا ماوەیـەکی دورو درێـژیان بـڕی لـە قبولکردنی ئەو بیرە و هەوڵی گونجاندنی لەگەڵ یەکخواپەرستی ئیسلامی دا. بەڵام ئـەو هەوڵە بە سەختی شکستی هێناو کاریگەری خراپی هـەبوو لـەبواری کـەلام و ئیعتـزال و تەسەوفی فەلسەفی و بواری تردا. جاری یەکەم لـە سـەردەمی نوێـدا بـوو کـە بڕیـاردرا فەلسەفەی یۆنانی لە زانکۆکان دا بخوێنرێ. ڕۆژهەڵاتناسـان هـاتن تـا ئـەوە ڕابگەیـەنن فەلسەفەی عەرەبی فەلسەفەیەکی یۆنانیە و بە پیتی عەرەبی نوسراوە. دەنگی لـوتفی سەید و تەها حوسەین و کەسانێکی دی بەرزبوویەوە بۆ ناونـانی بـە مامۆسـتای یەکـەم (ئەرستۆ) بەو بانگەشەی ئەو مامۆستای بیری ئیسلامیە. ئەمـەش لـە درۆیـەکی زەق دا کـە بـە زانـستی نەچەسـپا بـەڵام لـە پیلانـێ دەچـوو بـە مەبەسـتی پەیوەسـتکردنی موسـڵمانان بـە بەرنامـەی تێڕامـانی ئەرسـتۆ کـە ئـەوروپا بـە قبـولکردنی بەرنامـەی ئـەزموونی ئیـسلامی دەسـتیان لـەو بـەردابوو. هـەروەها موسـڵمانان کـە بـیردۆزەی ئەرستۆیان لە مەنتیقدا بەرپەرچ دەدایەوە نوسینەکانی ئەرستۆیان سەبارەت بە دراماو ئەو نمونانە هەڵوەشاندەوە کە لە تراژیدیای سوفۆکلیس و ئەسنگیلۆس و یـور بیـدیز و کۆمیـدیاکانی لویـستۆڤاندا خـۆی دەبینیـەوە چـونکە بـە بـارێکی ململانـێ و ڕێبـەری

ئارەزوو و دەستەوسانی و قەرەولگرتوو بۆ خەڵکیان دەزانی کە زیانیان پێ دەگەیەنێ. چونکە ئەوان چەند نەوەیەکی ڕاهاتوو لەسەر یەکخواپەرستی و دژە شیرك بوون بـا پێناوێکی هونەرسازی و جوانکاریش بووبن. بەو جۆرە درۆی بانگخوازانی فەلسەفەکان دارماو ڕۆژێ لە ڕۆژان ئەرستۆ مامۆستای موسڵمانان نەبووە.

وەك وتمان بیری ئیسلامی لە یەکەم ڕۆژەوە ڕاشکاوانە ئەو مەنتیقەی ئەرستۆی بەرپەرچدایەوە کە لەسەر قیاس و بەڵگەخوازی نەزەری وەستا بوو و مەنتیقێکی نوێی داهێنا کە تایبەتمەندی خۆی هەبوو و ئەویش بەرنامەی هەستی ئەزموونی بوو. دانانی کندی و فارابی و ئیبن سینا و ئیبن ڕوشدیش تەنها درێژە پێدەری ئەو گیانە هێلێنیەی ناو جیهانی ئیسلامی بوو کە هەبوو. بیری ئیسلامیش مەنتیقی ئەزموونی ئاشکرا کرد، ئیمام ئیبن تەیمیە بنەڕەتە ڕووتەنە عەقڵیەکانی مەنتیقی ئەرستۆی خستوونەتە ڕوو و بەتەواوەتی بەرپەرچی داونەتەوە.

هەروەها موسڵمانان ڕێبازی قیاسی یۆنانیان بەرپەرچدایەوە و بە چەمك و واتای دەرەبەگی و خۆسەپێنی ڕازی نەبوون کە لە ژیارەکانی ڕۆمان و فارس دا هەبوو. هەروەها دژی سۆفیەتی هیندی و نەعوصی و ئەوەش بوون کە لە فارس و ڕۆمیان وەرگرتبوو، چونکە ئەوانە چەند تەنزیمێ بوون نەك نیزام.

سەبارەت بە سەردەمی نوێ ئەوا زانایانی موسڵمان جەختیان دەکردەوە لەسەر بەدرۆ خستنەوەی بانگەوازی فەلسەفەی ئیسلامی پەیوەست بە کندی و فارابی و ئیبن سینا و ئیبن ڕوشد و ئاشکرا کردنی ئەوەی هەوڵی گونجاندنی ئایین و فەلسەفەکە ئەوان پێی هەستا بوون ساختە بووە. زانایانی ئیسلام بە شەوڕەوانی موسڵمانان (ڕێ تاریك) ناویان دەبردن وەك ڕێ تاریکانی یۆنان. ئەگەر ئیمامی ئیبن تەیمیە هەڵوێستی موسڵمانانی سەبارەت بە مەنتیقی ئەرستۆ یەکلا کردبێتەوە، ئەوا ژمارەیەکی زۆری زانایان پێش ئەو ساختەکاریەکانی فەلسەفەی یۆنانیان تێکشکاندوون. ئیمام فەرابی لە

سێ مەسەلەدا تەکفیری فەیلەسوفانی کردووە. نکوڵی لە زانستی خوای گەورە بە شتە لاوەکیەکان. نکوڵی کردنەوەی جەستەکان و بڕوابوونیان بە قەدەمیەتی جیهان.

شێخ موستەفا عەبدولرەزاق ڕایگەیاندووە فەلسەفەی ئیسلامی لە بەرهەمی ئصولیەکان دایە، ئەو زانایانەی ئصولی فیقە و ئاین کە پەیوەستی ڕێبازی سەلەفن. شیخ موستەفا دەڵێت (دیارترین ڕا و مەترسیدارترین بۆچوون ئەوەیە دەڵێ فەلسەفەی دروستی ئیسلامی دەبێ لە فیقهی ئیسلامیەوە بێ. ئەم مەسەلە بەتەواوەتی ناگونجێ لەگەڵ ئەو ڕای ڕۆژهەڵاتناسانەدا کە دەڵێن موسڵمانان دوورن لە فەلسەفە. ئەو فەلسەفەی چووەتە ڕۆشنبیرییانەوە یۆنانیە، هەیانە پێی وایە زانستی کەلام بنەڕەتی فەلسەفەی ئیسلامیە و زانستی کەلام لای موسڵمانان لە فەلسەفەی یۆنانیەوە وەرگیراوە و کاریگەرە بە فەلسەفەی یۆنانی. بەڵام پرسی ئەوەی فیقە بنەڕەتی فەلسەفەی ئیسلامیە بیردۆزەیەکی نوێیە و بێگومان دەرگایەکی نوێ واڵا دەکات بۆ لێکۆڵینەوە و مشتومڕ و لەسەر دووان. شێخ موستەفا دەڵێت شافعی یەکەم کەسە لە زانستە ئاینیەکان دا لەسەر بنەمایەکی زانستی نوسینێکی داناوە و دانراوەکەی شافعیش (الرسالە)یە، رسالەکەی شافعی لە هێنانی باسەکان و دابەشکردنی بەشەکان دا شێوەیەکی چەسپاوی ناو ئەندێشەی نوسەری گرتووەتە بەر کە هەندێ جار بەلای دوورخستنەوەی دا دەچێ و دیدی شوێنکەوتنی تێدا دەدرەوشێتەوە و هەوڵی دوورخستنەوەی تێدا نیشان دەدات یان دووبارەیی و ناڕوونی بەدوادا دێنێ. بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەدا سەرەتایەکی بەهێزە بۆ نوسینی زانستی ڕێکخراو لە هونەرێکدا کە شافعی بۆ یەکەم جار ڕەگەزە یەکەمینەکانی کۆکردونەتەوە.

### * کتێبەکەی شێخ مستەفا ( تمهید التأریخ الفلسفة الاسلامیة-١٩٤٥ ):

لەو کاتەوەی شێخ موستەفا عەبدولڕەزاق ڕایگەیاند فەلسەفەی ئیسلامی لە ئیمامی شافعیەوە دەست پێدەکات و لەم تێکەڵیەوە عەلی سامی نەشار ئەو کارە گەورەی دەست پێکرد کە توانی بەدیبهێنێ. دواتر دکتۆر موحەمەد موحەمەد حوسەین هات و بانگەوازی کرد بۆ بە ئیسلام کردنی ئەدەبی عەرەبی و ڕزگارکردنی لەدەست ساختە و ژەهرێ کە تەها حوسەین هەوڵیدا ڕەنگرێژی بکات پێی، دواتر دکتۆر موحەممەد عەبدوڵا دەراز هات و ڕێبازی ئەخلاقی لە قورئان دا دانا. مامۆستا حەسەن بەننایش دەرگای لە بەردەم لێکۆڵینەوە سەردەمیەکان دا کردەوە بۆ شەریعەتی ئیسلامی بە بەراورد لەگەڵ یاسای دانراو، ئەمەش ئەو کارەیە کە عەبدولقادر عەودە و عەلی مەنسورو تەوفیق شاوی و مەحمود ئەبو سعود و عیسا عەبدە لەسەری ڕۆیشتن. زانایانی موسڵمان ئاشکرایان کرد مەنتیقی ئەرستۆ نەیتوانیوە حەق و ناحەق لەیەك جیا بکاتەوە.

ئەوروپا لە سەردەمی ڕێنیسانس دا هات و مەنتیقی ئەرستۆی ڕووخاند. ئەو مەنتیقەی کە بە مەنتیقی وێنەیی ناودەبرا (واتە ئەوەی هەموو هەوڵی بۆ ئەوەیە دەق و وێنەگەلێکی کەلامی پێکبێنێ کە بە پێوەر و یاساکانی خۆی بە دروستیان دابنێ با لەگەڵ واقیعی هەست پێکراو دا پێچەوانەبن. مرۆڤایەتی بە سەلامەتی گەڕایەوە بۆ بنەڕەتەکانی خۆی. ئەویش ئەوەیە مەنتیق کۆمەڵێ شتی سەرەتایی و یەکلایی هەموو عەقڵێکە کە بەبێ پێویستی کۆتەکانی ئەرستۆ عەقڵە ساغەکان ملکەچینی).

بە گەورە و شکۆدار دانانی ئەرستۆ لە ماوەی پێشتر لە سەردەمی ڕێنیسانس لە ئەوروپادا ئەوەیە بە مەنتیقە وێناییەکەی– جێی پیرۆز دانانی کڵێسای مەسیحیەت بوو تا ئەوەی هەر کەس بیوێرایە ڕای پێچەوانەی ڕایەکی بوایە خۆی دەخستە بەر مەترسی مردن. تا ئەوەی خەریك بوو کەسێ کە دەیوت زەوی خڕە بەر مەترسی مردن

كـەوێ چـونكە ئەرسـتۆ ڕای وانـەبوو. حكومـەتی باشـوری ئـەفریقاش وەك مامۆسـتا ئەحمـەد حەسـەن دەیگێڕێتـەوە- هـەوڵی دەدا لـە فەلـسەفەی ئەرسـتۆوە سـەنەدێكی شـەرعی بـۆ سیاسـەتی دەمارگیرانـەی خـۆی دابنـێ و بـاس لـە كۆیلایـەتی و چـۆنێتی مانەوەی كۆیلایەتی دەكات نەوەك بیرنەكەنەوە لە ئازادی بەڵكو بیرنەكەنەوە لە كۆیلـە بوونی خۆیـان. نوسـینەكانی ڕۆژئاواگـەران (لـوتفی سـەید و تـەها حوسـەین و سـەلامە موسا و جگە لەوانیش) هەوڵیان دەدا جارێكی دی ژیان بەبیری ئەرستۆ ببوژێننـەوە بـە وەرگێڕانی نوسین و بەرهەمەكانی و بانگەواز كـردن بـۆی. سـەرەڕای ئـەو ڕەوتـەی كـە شـێخ موسـتەفا عەبـدولڕەزاق دایمەزرانـد بـەلام نـەیارانی ئیـسلام جـەختیان لەسـەر دەكردەوە. فەیلەسوف ئیقبال هۆشیاری دا لە بەئاگا بوون لە دەست ڕۆیی و زاڵبـوونی بـیری ئەرسـتۆیی. زۆرێكـیش قـسەیان كـردووە لەسـەر پێویـستی بەرەنگاربوونـەوەی مەنتیقی ئەرستۆ وەك چۆن پێشتر ئیبن تەیمیە بە گەڕانەوە بۆ بنەڕەت ئەنجامی دا.

ململانێی نێوان ئەرستۆ و ئەفلاتون بە درێژایی سەردەمەكان نەوەستاو تا ئێـستاش كاریگـەری ئـەو ململانێیـە بەردەوامـە. ئـەفلاتون ئامـانجی بـوو ژیـانی كۆمەڵایـەتی ڕێكبخات. بەڵام ئەرستۆ هەوڵی دەدا مەعریفە ڕێكبخاتەوە. ئەفلاتون میسالی و شـاعیر بوو. ئەرستۆ زانایەكی تێڕامـانی بـوو كـە دەگەیشتەوە بـە بنەڕەتـەكانی، هاوكـات بـە تێبینـی ئـەو پـەرت بوونـەی كـە ڕۆشـنبیری و ژیـاری ڕۆژئـاوایی هـەر لـە ئەرسـتۆ و ئەفلاتونەوە تا ئەمڕۆش تیایدا دەژیت.

دكتۆر عەلی سامی نەشار لە كتێبەكەیدا (**مناهج البحث**) سـەبارەت بـە بیریـارانی ئیسلام دەڵێت (مەنتیقی یۆنـانی زادەی پاڵـەوانی و هەڵكەوتـەیی زمـانی یۆنانیـە و لـەو مەنتیقەوە میتا فیزیقیای ئەرستۆیی سەریهەڵدا. بۆیە لە جیهانی ئیسلامیدا سـەركەوتوو نابێ و دەبێ مەنتیقێكی تایبەت هەبێ كە لە هەڵكەوتەیی زمانی عەرەبیەوە هەڵقوڵێ).

هەروەها زانایانی ئیسلام بیردۆزەی فارابیان سەبارەت بە شاری باڵا بەرپەرچ داوەتەوە و فیقهناسان ئەم وەڵامانەیان ژماردوون: کتێبی (**الأعتصام ی شاتبی و تبصیرة الحکام**)ی ئیبن فەرحون و ئیبن تەیمیە و ئیبن قەیمیش پێشیان کەوتون. ئەوە نیشان دەدەن فارابی کاریگەر بووە بە خوێندنگەی فەلسەفی جولەکەوە کە سەرەتاکەیان ئیبن جبروولە. ئەوانەش هەوڵیان داوە ئەو بیرەی فارابی بڵاوبکەنەوە و جێبەجێی بکەن قەرەمەتیەکان بوون لە شاری هجری قەرمەتی، حەمدان قەرمەت دامەزرێنەری قەرمەتیەکان صابیئی بوو و گەورەترین خوێندکاری فارابی بوو و وەك چۆن کۆمەڵەی ئیخوان صەفا کاریگەر بوون بە فارابی دەستەی ئیسماعیلیەکانیش پێی کاریگەر بوون.

ئەوەی بە ڕەخنە لە فارابی دەگیرێ داکەوتنیەتی لە کتێبەکەیدا (الجمع بین رأی الحکمین) کە پشتی بەستووە بە چەند کتێبێکی شێواوی فەلسەفەی هەردووکیان تا ئەوەی دەوترێ نازانرێ چ ناکۆکیەك هەیە لە نێوان ئەو سێ فەیلەسوفەدا.

ئەو ڕەوتەی فارابی لەسەری دەڕۆیشت ناروون و گومانـاوی بوو تا ئەوەی لێکۆڵەرانی وەك موحسین مەهدی لە کتێبەکەیدا سەبارەت بە دیدی فارابی لە ڕوانگەی لێکۆڵینەوەکانی و پەیوەندی بە ئیخوان صەفا و خوێندنگە ئیتیشراقیە فارسیەکەیانەوە لای سەهرەوەردی ئەوەیان ئاشکرا کرد بیردۆزەکەی فارابی کاریگەری هەبوو لەسەر نوسینەکانی باتینیەکان.

هەروەك ئیبن ئەزرەق لە کتێبەکەیدا (**بدائع السلك فی طبائع الملك**) ئەوەی ئاشکرا کرد، ئەو بە تەواوی ئاگاداری کارە سیاسیەکانی فرابی بوو بەپێی بڵاوکراوەکەی دکتۆر عەلی سامی نەشار گۆڤاری **دراسات فلسفیة و أدبیة ١٩٧٦**- ئەو ڕەوتە شەخسیەی ژیانی فارابی و بیرەکەی خستووەتە ڕوو و دەڵێت ئەو لە باکورو لەناو هۆزەکانی تورکمان دا کە ئێستا پێی دەوترێ تورکستان لەدایك بووە، دواتر

چـووه بـۆ بەغـداد و لـەوێ لای یوحـەننا بـن جـیلان بـووه. خوێندنگـەی فەلـسەفی ئەسـکەندەریە گوازرایـەوه بـۆ مـەرو و جنـد و سـابور و حـەران و لـەوێوه بـۆ بەغـداد. ڕوهبانێ گواستیەوه کە یوحەننای کوڕی جیلان پێی گەیشتبوو. فـارابی یەکـەم کەسـی موسڵمان بوو لە خوێندنگەکەدا لە بەغداد مامۆستای ئەفلاتۆنی نوێش بـوو لـە جیهـانی ئیسلامیدا. صـابیئەی حـەرنانی ئیلهام بەخـشی گـەورەی یەکـەم فەیلەسـوفی ئیـسلام کندی بوو. هەروەك ئەوان کاریگەریەکی گەورەیان هەبوو لەسەر فەیلەسوف موحەممەد ئیبن ئەبی بەکری رازی. ئەو صابیئە حەرنانیەی کە دەستەیەك بوو لـە ئـەفلاتونی، بـە نەزەری فارابی دەرسی لێوەردەگرتن. دواتر بە کرداری حەمدانی قەرمەت خـۆی بـەوان دەچواند. ئەو کەسە صابیئە حەرانیەی کە شـوێنکەوتەکانی لـە هەجـەر جێبـەجێکاری بوون، بەو جۆرە دەردەکەوێت فارابی صـابیئیەکی حـەرنانی بـووه و تـورك و فـارس و عەرەب نەبووه. صابیئەی حەرنانیش بە بنەڕەت یۆنانین و سـەرقاڵی مۆسـیقا و کیمیـا بوون. مەسعودی وا وەسفیان دەکات کە دەستەی حەشەوی[1] فەیلەسـوفانن. ڕایـەکیش هەیە دەڵێت فارابی عەرەب بووه و لەسەر دەستی صابیئە دەرسی خوێندووه. ئەوه لە کیندیەوه وتراوه، کاریگەری ڕاستی فـارابی لـە زانـستی سیاسـەت و ئـەو بزافـە توندە سیاسیەدا چڕ بووەتەوه کە خەریکبوو نیزامی دەوڵەتی ئیسلامی تێکبشکێنێ. دەبینین ئەو پیاوەی شـوێنکەوتەکانی هـەوڵیان دا شـاری خـوای ئـەفلاتون لـە شـاری هەجـەری قەرمەتی بە سەرکردایەتی حەمـدان قەرمـەت دابمـەزرێنن. لـە کتێبەکەشـیدا (المدینة الفضیلة) کاریگـەر بـووه بـە ئـەفلاتون. ئـەو هەنـدێ تێڕوانینـی ئیـسلامی داوه بـە سـەرۆکی شـارەکه و لـە هەنـدێ کتێبـی دیکەشـیدا ئـەوەی هێنـاوه دوای ئـەوەی بـۆی

---

١- حەشویە دەستەیەکن ڕا جیایی هەیە ئایا موسڵمانانن یان جولەکەن. هەندێك لە زانایان لە جولەکە مەترسیدارتریان دەزانن. وەرگێڕ.

دەرکەوت مەحاڵە لەڕێگەی یۆنانەوە لە جیهانی ئیسلامی دا میتا فیزیق دابمەزرێ. هێرشەکەی ئیبن ڕوشد بۆسەر فارابی تەواو ئەوەمان بۆ ڕاڤە دەکات.

دکتۆر عومەر فەروخ دەڵێت: فارابی شوێنی حەوانەوەی لە شارەکەیدا تەنها بۆ ئەوانە داناوە کە لەگەڵ ڕەوتی بیرکردنەوەی ئەودان. فارابی لەوانەیە بیرِوایان بە فەیز هەیە واتە ئەم جیهانە لەخوا داکەوتووە. ئەمەش بیردۆزەیەکی پوچی یۆنانیە و چەمك و واتای دروستی ئیسلام دانی پێدانانێ. لێرەوە چەمکی فارابی لەگەڵ چەمکی ئەهلی سوننەدا ناگونجێ چونکە چەمکەکەی ئەو نزیکە لە چەمکە باتینی و دەستە گومڕاکان چونکە پێی وایە نەمری ڕۆحیە و جەستەکان زیندوو نابنەوە و پێی وایە پێغەمبەرایەتی تەنها هێزی خەیاڵیە. ئیخوان صەفا کە پێیان وایە ئاینەکان ناتەواون و دەبێ بە فەلسەفە ناتەواویەکەیان پڕ بکرێتەوە. ئەمەیان لە فارابیەوە وەرگرتووە. هەروەها چەمك و واتای ئیبن سینا سەبارەت بە نەفس شێواوە و نازانێ نەفس لە کوێوە هاتووەو چی ڕودەدات ئەگەر جیا بێتەوە لە جەستە. ئەو پێی وایە دانا خوا ویستەکان ئەو نەمریەیان دەوێ کە جیایە لەو نەمریەی ئاینەکان باسی دەکەن.

بەڵکو ئیبن سینا زیاتر لەوە دەڕوات و کاتێ باسی خوای گەورە دەکات ناوی واجبو لوجوبی لێ دەنێ یان (العله الأولى) واتە تەنها بە بونێکی مەنتیقی بێ ویست و بێ مەعریفەی دادەنێ. واجبولوجوب یان عیلەتولئولا ناوی خوای گەورە نین و لە قورئان دا نەهاتوون.

ئیبن باجە و ئیبن توفەیل و ئیبن ڕوشدیش بەم ڕێیەدا دەڕۆن و چەمك و واتاکانیان لە ڕەفەی یۆنانیەوە وەردەگرن. ئیبن باجە پێی وایە بوون کۆتایی نیە، ئیبن توفەیل تاك بە سەرکەوتووی فیترەتی دادەنێ کە خۆی شارەزا بێ و بە عەقڵی خۆی پێویستی بە پێغەمبەرایەتی نەبێ، ئیبن ڕوشد پێی وایە ئەگەر ناکۆکیەك لەنێوان ڕوخساری فەلسەفە و ڕوخساری شەرعدا هەبوو دەبێ ڕووکەشی فەلسەفەکە وەرگرین و بۆ

ڕوکەشی شەرعەکەش بەدوای لێکدانەوەیەکی عەقڵیدا بگەڕێین. هەموو ئەمانەش لە دیدی ئیسلام دا پوچ و بێ بنەمان.

ئەگەر هەندێ لەو فەیلەسوفانە لە چەند شتێکی لاوەکیدا ڕاجیا بووبن لە چەمك و واتای یۆنانی یان ڕاڤەکاری ئەرستۆ، ئەوا لە بنەڕەتە گشتیە سەرەکیەکان دا هەڵەیان کردووە. ئەمە وا دەکات بە تەواوی دیدیان شێوابێ و هیچ پەندێ لەوەدا نیە کە دەوترێ ئیبن ڕوشد لە سیفەتی زانستی خواییدا پێچەوانەی ئەرستۆیە (بەوەی خوای وا داناوە زاتی خۆی بزانێ و شارەزای کائینات بێ بە پێچەوانەی مەزهەبی ئەرستۆوە) ئەوا ئیبن ڕوشد لە ڕوانگەیەکی ترەوە پێی وایە جیهان ئەزەلیەو دوا جاریش ئەبەدیە، هەروەك بڕوای هەیە بە قەدەمیەتی مادده. بەمەش پێچەوانەی دوو بنەڕەتی سەرەکی ئیسلامە. هەروەك بیرۆکەی گونجاندنی شەریعەت و فەلسەفەی لەسەر چەند بنەمایەکی پوچ وەستاوە و چەمکی ئیسلامی ملکەچی جێ عەقڵە بۆ نەقڵ. سروش بە بنەڕەت و عەقڵیش ملکەچی سروشە.

بێگومان گرنگی دانی ڕۆژئاوا بە فارابی و ئیبن سینا و ئیبن ڕوشد لە سەردەمی نوێدا دەگەڕێتەوە بۆ یەك هۆکار کە ئەویش ئەوەیە سەرچاوەی ئەوانە یۆنانیە نەك ئیسلامی پوخت. دواتر ڕۆژئاوا دەزانێ کە ئەوان ئیعتیزال و عەقڵانیەت و تەصەوفی فەلسەفییان گێڕایەوە و گرنگیەکی زۆریان دا بە ئیبن سینا و فارابی لەلایەك و حەلاج و ئیبن عەرەبی لە لایەکی ترەوە. ئەمە ئەو کاڵایەیان کە دەیانەوێت لە ئاسۆی ئیسلامدا ڕەواجی پێ بدەن تا موسڵمانانی ئەم سەردەمە بەد گومان بکەن لە چەمك و واتای ئەهلی سوننە و جەماعە. دواتر توانییان ژمارەیەك لە نوسەرانی ناودارو نوسراو بخەنە کار بۆ نوسین لەسەر ئەوانە وەك عەقاد و ئیبراهیم بیوەی مەکدور و عوسمان ئەمین.

لێرەدا تێبینیەك هەیە چونکە ئێمە نوسینەکانی فارابی و ئیبن سینا لە زانستە ئەزموونی و بیرکاریەکان دا لەگەڵ نوسینەکانیان لە فەلسەفەو لە مەنتیق دا جیا دەکەینەوە، چونکە فەلسەفە و مەنتیقەکە جێی مەترسیە با هەوڵە فێڵبازانەکانیش هەوڵبدەن زانستە ئەزموونی و بیرکارییەکان بەکاربێنن و بۆ ئامانجی حەقیقی کە بڵاوکردنەوەی بیری قەرمەتی و باتینی بوو بەو شێوەی نامەکانی ئیخوان صەفا پێشکەشیان کرد.

پێویستە ئاماژە بدەین بەو گورزە جەرگبڕەی کە ئیمامی غەزالی لە ڕووی فەلسەفەدا وەشاندی کاتێ هەڵەکانی فەیلەسوفانی ئاشکرا کرد لە نکوڵییان لە زیندووبوونەوە و مەعریفە و زانستی خوا بە لاوەکیەکان و هەڵەی وتەی قەدەمیەتی جیهان. ئەمە ئەو گورزەیە کە بانگخوازانی ڕۆژئاواگەری تا ئێستاش ئاماژە دەکەن بە شوێنەوارە مەترسیدارەکانی. گورزی دووەم ئیبن تەیمیە وەشاندی بەرامبەر بیردۆزەی مەنتیقی ئەرستۆیی کاتێ دواتر نوسینەکانی فەیلەسوفان و هەموو تەسەوفی ئیسلامی لەسەری دەڕۆیشت. ئەمەش قۆناغی دوای ئەو ڕۆڵە بوو کە شافعی و ئیبن حەنبەل و زانایانی ئصولی فیقە و ئاین پێی هەستان.

ئیبن تەیمیە ڕەخنەی گرت لە پێناسەی ئەرستۆیی و قیاس و ڕێگەی بەڵگە خوازی ئەرستۆیی و ڕێبازێکی ئیسلامی قورئانی خستوەتە ڕوو بۆ مەنتیق کە لە قورئان و سوننەتەوە وەرگیراوە. ئەمەش ئەو ڕێبازەیە کە دواتر ڕۆژئاوا وەریگرت تا بەوە هێرش بکاتە سەر تێگەیشتنی ئەرستۆ. گرنگیدانی ئیبن تەیمیە تەنها لەوەدا نیە کە پێش بیریارانی ڕۆژئاوا ڕەخنەی زانستی مەوزوعی گرت بێ لە مەنتیقی تەقلیدی. بەڵکو وەك نوسەری (رسالة المنطق عن ابن تيمية) کە دواجار گفتوگۆی لەسەر کرا عەفاف عەبدولعەزیز غەمری دەڵێت ئەو ڕێیەکی نوێی کردەوە بۆ ڕەخنەی مەنتیقی کۆن کە هەندێ لە بیریارانی ئیسلام هەر لە ئیبنولقەیم و صەنعانی و سیوتیەوە لەسەری ڕۆیشتن.

# باسی شەشەم

## ( بەرەنگاربوونەوەی فەلسەفەی یۆنانی )

لە سەدی چواردەی کۆچیدا دوای فراوان بوونی چوارچێوەی ڕۆژئاواگەری و بەدوادا هاتنی پیلانی ڕۆژهەلاتناسان بۆ سەپاندنی چەمکەکانی بیری یۆنانی و فەلسەفەکان و چەمکەکانی تەصەوفی فەلسەفی و بیری باتینی لە ڕوانگەی زیندوکردنەوەی بنەماو بڕیاردەریەکانی ئەو بیرە وە زانایانی موسڵمان لەڕووی ئەمانەدا وەستان. بانگەوازەکەی ڕۆژئاوا مۆرکی گەمە کردن بە قسەی پووچی لەخۆ دەگرت. ئەو قسەی کە گوایە موسڵمانان و عەرەب لە کۆنەوە ئەو بیرەیان قبوڵ کردووە ئەمەش هەر ڕووی نەداوە– بۆیە لەسەر موسڵمانانی ئەمڕۆیە ئەنجامەکەی قبوڵ بکەن کە لەبیری ماددی ڕۆژئاوادا خۆی دەبینێتەوە.

موسڵمانان هەموو گومانەکانی بیری یۆنانیان تێکشکانبوون و شێواوی وەرگێڕانەکانیان لە یۆنانیەوە بۆ عەرەبی ڕوون کردبوویەوە. هەروەك ڕۆڵی نەساتیرەیان لە بڵاوکردنەوەی بانگەوازیان لە نێو وەرگێڕانەکان دا خستبووە ڕوو. هەروەها ڕۆڵی فارابی و ئیبن سینایان لە خزمەتکردنیان بە باتینی و قەرمەتیەکان نیشان داوە.

دکتۆر عومەر فەروخ ئاماژە بەوە دەدات ئەزموونی ئیسلامی لە ئاشکرا کردنی گەندەڵی ئەو یەکلابووە پوچانەدا کە بیری یۆنانی و ئەرستۆ بەتایبەت پێشکەشیان کردبوو پێناوێکی یەکلاکەرەوە بووە. بەوەی کە زیاتر لە چل چەمکی هەڵەی لەوانە دیاری کردووە کە ئەرستۆیان خۆش دەوێ وەك ئەو قسەی ئەگەر دوو جەستە لە شوێنێکی بەرز فڕێ دران یەکەمجار قورس ترەکەیان دەگاتە زەوی. گژوگیا ئەندامی

نێره و ئەندامی مێیەی نیه. هەسارەکان نشینگەی خوداوەندەکانن. ئاوو هەوا و خوڵ و ئاگر ڕەگەزن.

دەمێکە لە زانستی سروشتی فیزیا و کیمیا و زانستی گەردوون و جوگرافیا دا چەسپاو و سەلمێنراوە ئەوانە هەڵەن.

سەبارەت بە زانستە کۆمەڵایەتیەکانی وەك سیاسەت یان زانستە ڕەهاکان دەبینین چەندین بیریار لە چەندین ڕادا پێچەوانەی ئەرستۆن. ئیمامی غەزالی لە کتێبەکەیدا (**تهافت الفلاسفة**) هەستی بەو گرفتە کردووە و دەڵێت: وەرگێڕانی کەلامی ئەرستۆ تالیس دوور نەبوون لە دەستکاری کردن و گۆڕینێکی بەرچاوی ڕاڤەو تەئویل تا ئەوەی ئەمە ناکۆکیەکی لەنێوانیان دا ناوەتەوە. غەزالی بە شێوەیەکی تایبەت لە وەرگێڕان تێکەیشتووە و دەڵێت (بەهێزترینیان لەڕووی قورسی و تەحقیق لە فەلسەفەکەراکانی ئیسلام دا بریتین لە فارابی و ئەبو نەسر و ئیبن سینا. تەنها چەند پاڵەوانێ دێنێ کە ئەوان هەڵیان بژاردوون و بەڕەوتی سەرکردەکانیان لە گومڕاییدا ئەوانەیان بە ڕاست داناون. بەڵام ئەوانەی وازیان لێ هێناون و هیچیان لێ وەرنەگرتوون کەس گومانی نیه لە کەم و کورتیدا. دواتر بێباکانە دوور دەڕوانێتە ئەو پاڵەوانانە کە فارابی و ئیبن سینا لای غەزالی تەنها نەقڵیان کردووە. ڕای یۆنانیان گواستووەتەوە بۆ عەرەب و با ئەرکی گواستنەوەی ئەو ڕایانەیان ل زمانی یۆنانیەوە بۆ زمانی عەرەبی نەگرتبێتە ئەستۆ.

دواتر دەچێتە سەر باسی سفستەکان کە مەزهەبێکی فەلسەفەکەرای یۆنانیە. ئیبن ڕوشد پێی وایە کەسانی ئەو فەلسەفانە لاسارو ترسنۆك و چاوبەست کەرن و قسەیەکی بێ مانا دێن (تهافت التهافت) ئیبن ڕوشد پێی وایە سفستائیەکان تەنها لە لایەکی مەسەلەکان دەکۆڵنەوە. دواتر پرسەکە لە لایەکەوە دەگوازنەوە بۆ لایەکی تر و لە شتانێکدا مشتومڕ دەکەن کە جێی مشتومڕ نین. ئەو مشتومڕەشیان هیچ واتایەکی نیە.

زۆربەی فەیلەسوفانی یۆنان و لەنێویشیان دا ئەرستۆ لەو قسەدە هەڵەیان کردووە کە دکتۆر عومەر فەروخ دەڵێت جیهان لە چوار ڕەگەز پێکهاتووە ماددە و ئاو و خۆڵ و ئاگر. سەبارەت بە ئاو دەڵێن دەبێتە خۆڵ و خۆڵ دەبێتە ئاو یان هەواو هەوا دەبێتە ئاو. هەموومان ئەمڕۆ دەزانین ئاو و هەوا و خۆڵ و ئاگر ڕەگەز نین بەڵکو پێکهاتەن. ئەرستۆ لە هەموویان خراپتر ئەمەی وتووە. هەندێ لە بیریارانی یۆنان ئەو قسەیان تێکشکاندووە و بیردۆزەی گەردیلەیی (ذري) دەڵێن کە نزیکە لەوەی زانستی ئەمڕۆ دەیڵێ. بەڵام ئەرستۆ دوای ئەوەش سوور بووە لەسەر ڕاکەی و موسڵمانان و ڕۆژئاوایش ئەو هەڵەی ئەویان زانیوە.

سەبارەت بە گەردوون ماوەیەکی فراوانی هەڵە هەیە، چونکە ئەستێرەکان لە ئێمە دوورن بۆ گەیشتن و وتن لەسەریان دەروازەیەکی فراوان هەیە. یۆنانیەکان لە بوارە گەردوون دا هەوڵی زۆریان داوە. بەڵام ئەو هەوڵانە لەنێوان زانست و خورافەدا دەستەوسان وەستاون. سەبارەت بە زانست کە دەڵێن زەوی خڕە و بەدەوری خۆیدا دەخولێتەوە و لە گەردونێکی دەوری خۆردایە. سەبارەت بە خورافە لە زۆربەیان دەڵێن لە پێگەی نیزامی خۆردا دووەمە و خۆرو مانگ و ئەستێرەکانیش دەجوڵێن. دواتر دەڵێن کاکێشانە ئاسمانیەکان بێ کەم و کورتین و بوون و فەساد بەسەریان دا نایەت. واتە دروست نابن و ناگۆڕێن و لەناو ناچن. ئەوانەش نشینگەی خواوەندەکانن و چەند دەرونێکیان هەن کە دەیانجوڵێنن و عەقڵیان هەیە کە بەوە غەیب دەزانن و شتێ لەو غەیبە دەگەیەنن بە دەستەیەکی مرۆڤەکان.

ئەرستۆ هەواداری پشتیوانی خورافە بوو سەبارەت بە ڕوانینە ئەستێرەکان. ئەو سوور بوو لەسەر ئەوەی خۆر وەستاوەو ئەستێرەکانیش نشینگەی خواوەندەکانن و ئەوانیش غەیب دەزانن.

کاتێ ئیسلام هات زۆربەی ئەو مەسەلانەی یەکلاکردەوەو بورجکاری پوچەڵکردەوە. ئەوە بۆ مشتومڕی یەکەم یەکلاکەرەوە بوو. ئیبن حەزمی ئەندەلوسی (٤٥٦کۆچی) هات و ڕایگەیاند ئەستێرەکان جەستەی بەردینن و هیچ گیانیان نیە تا پێی بژین و هیچ عەقڵیان نیە تا بیری پێ بکەنەوە و غەیب نازانن. بەتوندی وەڵامی ئەو دێرینانەی داوەتەوە.

سەبارەت بە خولانەوەی زەوی لەڕووی زانستیەوە سجستانی ئیسترلابی زەورەقی دروست کرد کە لەسەر زەوی دانراوە و بەبازنەیدا دەخولایەوەو گەردونیش لەگەڵ ئەوەی تیایدایە جگە لە حەوت هەسارە جوڵاوەکە وەستاوە. دواتر قەزوینی (٦٨٢ کۆچی) هات و وتی (زەوی هەمیشە لەسەر ئەو بازنەی تیایدا دەیبینین لە دەورانی گەردوون دا بەردەوام دەجوڵێ ئەوە کاریگەری خولانەوەی زەویە بەسەر خۆیدا نەك خولانەوەی هەسارەکان).

بەتلیمۆس بە هەسارەکان دەڵێت (الكواكب المتحده) بۆیە گەردوونە تێکشاڵاوەکانی ئاشکرا کرد. ئیبن توفەیلی ئەندەلوسی (٥٨١ ك) درکی بەوە کرد بەتلیمۆس هەڵەی کردووە و ئاماژەی کرد بە نورەدین بەترووجی خوێندکاری تا کار بکات لەسەر چاکسازی ئەو نیزامە، بەڵام ئێمە نازانین بەتروجی ئەوەی کردووە یان نا.

گالینۆس دەڵێت (خۆر نەبوونێتی قبوڵ ناکات) حوجەتولئیسلام غەزالی بەرپەرچی گالینۆس دەداتەوەو وەڵامێکی ژیرانەی لە دوو لایەنەوە داوەتەوە: لە ڕوانگەیەکی زانستی گەردوونیەوە غەزالی دەڵێت ئەو ماوەی گالینۆس باسی کردووە بۆ ئەو مەسەلەیە بەس نیە چونکە خۆر و کێشەکەی (سەدو حەفتا هێندەی کێشی زەویە) ئەگەر هێندەی شاخەکانیشی لێ کەم بێتەوە لەو زەمەنەدا هەستی پێ ناکرێ کە ژیانی مرۆڤ لەسەر زەویە.دواتر غەزالی دەڵێت لەوانەیە بەشێکی زۆر لەخۆر کەم بووبێتەوە بەڵام هەست ناتوانێ بیزانێ، تەنها بەزانستی ڕوانین یان بینین دەکرێ ئەوە دیاری بکرێ. ئەمەش تەنها بە نزیککردنەوە دەبێت.

یۆنانیەکان کە دەڵێن زەوی خڕە گرنگیان بەوە دەدا چواردەوری زەوی بپێون، بۆ ئەوەش هەوڵێکی زۆریان دا بەڵام پێوانەکانیان زۆر دوور بوون لە ڕاستی. موسڵمانان چەند ئەزموونێکی تەواو وردیان ئەنجام دان کە تەنها بەبڕی بیست و ئەوەندە کیلۆمەتر لە پێوانەکانی ئێستا جیاوازن.

هەروەك یۆنانەکانی کۆن پێوانی ساڵی خۆرییان ڕاگەیاند، موسڵمانان بەو ژمارانە ڕازی نەبوون کە یۆنانیەکان دایان نابوون. سابتی کوڕی قەررە ئەوەی حساب کرد و گەیشتە ٣٦٥ڕۆژ و چارەکە ڕۆژێ و دە خولەك و دە چرکە. ئەم ژمارەش نیو چرکە زیاترە لە پێوانی ئێستا. دواتر عومەر خەیام هات و درێژەی دا بەباسەکە تا ساڵی خۆری ڕاست بکاتەوە بەوەی بۆ هەر سی و سێ ساڵێ هەشت ڕۆژ زیاد دەکات. بەوە هەڵەی ساڵی هەتاوی لە هەر پێنج هەزار ساڵێك دا یەك ڕۆژە. بەو جۆرە دەبینین چۆن بەرەنگاربوونەوەی فەلسەفەی یۆنانی لە کۆن و نوێدا ڕەسەنی ئیسلام و ساختەی دارو پەردووی بیری مرۆیی نیشان دەدات لە سەردەمی ساوایی مرۆڤایەتی و کەوتنی تاجی وەهمی سەروو گەورە گومراپانی وەك ئەرستۆ و ئەفلاتون و هەوادارانیان ئیبن سینا و فارابی، لەم گەشتەوە ئەم ڕاستیانە دەردەکەون:

یەکەم: قووڵایی ناکۆکی نێوان هەردوو عەقڵی ئیسلامی و یۆنانی دەرکەوت. فەلسەفەی ئوممەتێ لە ئوممەتان لەو بازنەی سوننەتە دەرناچێ کە ئەو ئوممەتە داینـاوە و هەرکەسیش لەوە دەرچێ تەنانەت لەو بازنەیەشی دا دەرکراوە و تەنها فیکری خۆی نیشان دەدات. ئەمەش بۆ فەیلەسوفانی ئیسلام ڕوویدا.

دووەم: ئەوەی فارابی و ئیبن سینا و جگە لەوانیش نوسیویانە فەلسەفەیەکی مەشائیە لە گشتی و لاوەکیەکان دا. ئەوەش ئاشکرا دەردەکەوێ کە عەقڵی یۆنانی تەواو لە عەقڵی ئیسلامی جیایە و موسڵمانانیش بەتەواوەتی مەنتیقی ئەرستۆیی بەرپەرچ دەدەنەوە و خۆیان مەنتیقێکی ئەزموونیان هەیە لە زانستی ئصولی فیقە دا

بەتایبەت کە پشت دەبەستێ بەو بەرنامە ئەزمونیەی بەهەڵە دراوەتەوە پاڵ فرنسیس بیکۆن. کاتێ موسڵمانان پشت دەبەستن بە بەرنامەی ئەزموونی ژیاری یۆنانی پشت دەبەستێ بە بەرنامەی قیاسی.

**سێیەم:** لەو کاتەوەی بەشە ناوخۆیەکان لە کۆتاییەکانی سەدەی دووەمی کۆچی دا گرو تینی ئیسلامییان تێدەپەڕاند ئیسلام هەڵوێستی ڕوونی بەرامبەریان هەبووە و ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەلیش لە مەسەلەی خەلقی قورئان دا ئەوەی نیشان دا. بەرنامەی ئەزموونی نیشاندەری گیانی حەقی ئیسلامیە. بیری ئیسلامیش بەردەوام بیروڕا دەستوەردەرەکانی بەرپەرچ دەداتەوە تەنانەت ئەو ڕاوبۆچوونە عەقڵیانەش کە ئەهلی کەلام بۆ پاڵپشتی مەزهەبەکانیان دەیانتاشین. هەڵوێستی ئیمامی شافیعی سەبارەت بە زانستی کەلام ڕوونە وەك هەڵوێستی ئیمامی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل لە فیتنەی خەلقی قورئان دا. ئەمە دکتۆر عەبدولوەهاب وتویەتی.

**چوارەم:** فەلسەفەی ناونراو بە فەلسەفەی ئیسلامی لە تایبەتمەندیەکانی بەرهەمی بیری موسڵمانان نەبووە بەڵکو لەڕاستی دا هاوڕێ چوون بووە لەگەڵ بیرکردنەوەی فەلسەفەی یۆنانی دا. لەڕاستی دا هەوڵی فارابی و کندی و ئیبن سینا بوو بۆ پێکەوە گونجاندنی وتەی یۆنان بە سیفەتێکی تایبەت کە لە فەلسەفەیان دا هاتووە لەگەڵ ئەو شەریعەت و بیروباوەڕەی لە عەقیدەی ئیسلامی دا هاتووە. ئەم هەوڵەش لەبەر چەندین هۆکار شکستی هێنا کە گرنگترینیان هەڵە و نادروستی دەقەکان و دانەوە پاڵی دەقەکان بۆ خاوەنەکانیان و زاڵبوونی بیرۆکەی عەقڵ بەسەر نەقڵ دا بوو.

هەوڵێکی نوێش لەمڕۆدا بۆ هەمان ئەو گونجاندنە هەیە تا فەلسەفە هاوچەرخەکان و بیری ئیسلامی پێکەوە ببەستنەوە.

**پێنجەم:** ئەو نادروستی دابەشکاریەی کە فارابی لە کتێبەکەی دا (**احصاء العلوم**) هێناویەتی دەردەکەوێت کاتێ زانستەکان دابەش دەکات بۆ عەقلی و نەقلی. یەکەمیان

دەرفەتێکی داوە بە نەقڵ. بەڵام دووەمیان عەقڵ ڕۆڵی تێدا نابینێ. هەردوو ئەو ڕاسەپاندنانە هەڵەن. مەبەستی فارابی و شوێنکەوتە بیریارەکانی کە بە مەنتیقی ئیغریق کاریگەرن بریتیە لەوەی بەرگری لە فەلسەفە بکەن بە تانەدان لە زانستە ئاینیەکان و وتنی ئەو بانگەشەی کە زانستە ئاینیەکان لەسەر بنەمای عەقڵی نەوەستاون بەڵکو بەرهەمی سروش و ئاینن. لەبەرئەوەی ناکرێ گومان لەمانەدا هەبێ کەوابوو ناعەقڵی و نا مەنتیقی و ناڕەخنەیین. لازمیش نین و چی لەسەر ئەوە بنیاد بنرێ جێ گومانە، بەڵام زانستە عەقڵیەکان لای فارابی و هاوڕێبازەکانی لەسەر بەرهەمی عەقڵ و هەست دامەزراون و ئەو دوانەش هەردووکیان ڕەخنەیی جێ گومانن. بۆیە جێی پێداچوونەوەو ڕاستکردنەوەن. دیارترینی ئەو زانستە عەقڵیانەش بریتیە لە فەلسەفە. بە بەرگری کردن لە فەلسەفە جێ مەبەستەکەیە، چونکە هەر لەسەرەتاوە لەلایەن ئیسلامەوە بەوە تۆمەتبار کراوە کە لەگەڵ بیروباوەڕی سەلەفدا ناگونجێ، ئەو بیروباوەڕەی بەرامبەر بە خوا و قەدەرو ڕۆژی دوایی و خەلق و قورئان هەیە. بەڵکو فەلسەفە چەند ڕایەکی میتا فیزیقی لەخۆ دەگرێ. هەیانە فەیلەسوفان بە زندیق و کوفر تۆمەتبار دەکات (ئیسماعیل راجی فاروقی ئەمەی هێناوە).

**شەشەم:** هەڵوێستی زانایانی ئەهلی سوننە و جەماعە لە ڕەخنە گرتن لە فەلسەفەی یۆنانی و فەلسەفە بە شێوەیەکی گشتی یەکلاکەرەوەیە، ئەوان لەو شوێنە بەرز دانراوەی کە ڕۆژهەڵاتناسان لەوێ دایان نابوو لایانبردووە و گێڕاویانەتەوە بۆ ئەو پایە دووەمینەی خۆی کە شیاویەتی لەچاو گشتگیری فەرهەنگی فیکردا.

ئیمامە ئیبن تەیمیە هەمان ئەم کارەی کردو زانستە شەرعیەکانی لە پلەی بالادا دانان دوای ئەوەی لایەنی ئصولی و پەیڕەوکاریەکانی جیا کردنەوە. ئصولی فیقە و ئصولی ئاینی بە دوو زانستی عەقڵی و ڕەخنەیی دانان کە بەدوای حەقیقەت دا دەگەڕێن و پێی دەگەن و عەقلانیەت و ڕەخنەگرییان لە هیچ فەلسەفەیەک کەمتر نیە

واتە لەهیچ زانستێکی سروشتی یان بیرکاری کەمتر نیە. فەرهەنگیشیان ئەو فەرهەنگە بەرنامەییە ڕووتەنەی ناو بیری ئیسلامیە کە گەورەترو دەوڵەمەندترینە. ئەوەش ئەو هێڵەیە کە شێخ موستەفا عەبدولرەزاق لەسەری چوو و عەلی سامی نەشاری خوێندکاریشی چڕو پڕ بەدوایدا چوو و لە ژماردنی زانستەکان و ڕەخنەی مەنتیقی ئەرستۆیی و دانانی مەنتیقی زمانەوانی عەرەبی لە شوێنیدا و دانانی بیری ئصولی وەك سەرو بەرنامە بۆ فەرهەنگی گشتی بیری ئیسلامی شوێن ڕێبازی مامۆستاکەی کەوت.

# باسی یەکەم

## (ئایینە ئاسمانیەکان و فەلسەفەکان)

لەپێشەکی ئەم باسەدا دوو ڕاستی دەخەینە ڕوو کە تیشکی خستنەڕوو دەخەنە سەر پەیوەندی نێوان ئاینە ئاسمانیەکان و ئەو فەلسەفە مرۆییانەدا کە ئارەزووەکان گەمەیان پێ دەکەن لەڕوانگەی جولەکایەتی و مەسیحیەتەوە کاتێ گوازرانەوە بۆ ڕۆژئاوا و سنوری دەوڵەتی ڕۆمانی کە لەوێ فەلسەفەکانی یۆنان (ئەفلاتون و ئەرستۆ)و دواتریش ئەفلاتونی نوێ دەرکەوتن.

**ڕاستی یەکەم:** حیکمەتی خوای گەورە لەوەدا بوو لەگەڵ گەشەسەندنی مرۆڤایەتیو پێشکەوتنی عەقڵی مرۆییدا پەیامەکانی ئاسمان بێن تا کە گەیشتە لوتکە لەگەڵی دا پەیامی گشتگیری دابەزاند کە ئیسلامە و قورئان کتێبیەتی و موحەمەد (ﷺ) پێغەمبەریەتی کە کۆتایی پەیامەکان و کتێبەکان و پێغەمبەرەکان لەمەدا بووە و لەپێناو ئەمەش دا کتێبەکانی پێشوو ئاماژەیان پێداوەو پێغەمبەرانی پێشوو لەسەر ئەوە بەڵێنیان لێ وەرگیراوە تا ئەوەی بە هاتنی ئاینی کۆتا ئینجا ئامانجەکە هاتە دیو هەموو بانگەواز و پێغەمبەرانی تر پێشەکی بوون بۆ ئیسلام. بەڵێن لە پێغەمبەران وەرگیراوە ئەگەر لەلایەن خواوە پێغەمبەرێکیان بەڕاستی بۆهات شوێنی بکەون و سەری بخەن. کتێبە ئاسمانیەکانیش لەپێش هەموویانەوە تەورات و ئینجیل ئەو ڕاستیەیان تۆمار کردووە و وەسفی پێغەمبەر موحەمەد (ﷺ) کراوە تا ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (**لوكان موسى حيا لما وسعه إلا أن يتبعني**) (ئەگەر موسا زیندوو بوایە چاری نەبوو جگە لەوەی شوێن من بکەوێت).

**ڕاستی دووەم:** بەنی ئیسرائیل نەچوون بەدەم بانگەوازی ئەو پێغەمبەرانەوە کە یەك دوای یەك بۆیان دەنێردران بەڵکو لەدژیان دەوەستان. بۆیە خوای گەورە

پاشایەتی و پێغەمبەرایەتی گواستەوە بۆ نەوەی ئیسماعیل و ئەوەی ئاشکرا کرد کە بەنی ئیسرائیل نەیانتوانی سپاردەکە هەڵبگرن و لەسەر زەوی دا خراپەیان نایەوەو خوای گەورەش دەسەڵاتێکی گەورەی بەخشی بە بنەماڵەی ئیبراهیم. بەڵێنی خواش لە قورئان دا بۆ ئیبراهیم و نەوەکانی بوون لە ئیسماعیل و ئیسحاق نەك تەنها بۆ ئیسحاق وەك ئەوەی جولەکە دەڵێن. پێغەمبەر (ﷺ) لە شەوڕەویدا کە چوویە بەیتولمەقدیس و پێشنوێژی کرد بۆ پێغەمبەران بەڵگەی یەکلا بوو لەسەر دوو شت

١- ئەو ئەمیری پێغەمبەرانە.

٢- ئیسلام هەموو ئەوەی بە میرات وەرگرتووە کە لەدەست پێغەمبەرانی پێشوودا هەبووە.

خوای گەورە هەڵبژاردنی ئوممەتی کۆتای ڕاگەیاندووە ﴿كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ﴾. لێرەوە زۆرجار مێژوونوس و نوسەران چەند شتێ دەڵێنەوە کە پێویست بە ئاماژەیەکی ڕوون دەکات:

یەکەم: ئەو شوێنەواری یەکخواپەرستی و زیندووکردنەوەی کەلای میسریەکان هەیە شوێنەواری ئاینی ئیدریسە (علیه السلام) کە لەمیسر دەرکەوت و خەڵکی فێر کرد بە پێنوس و بانگکردن بۆلای خوای تەنها. میسریەکان پێش ئەوەی ئامون و ئەزۆریس و بتاح و ئاتون بناسن خوایان دەناسی. ئەختانون بە چەمك و واتای ئیسلامی یەکخواپەرست نەبووە، بەڵکو بتپەرستی یەك خستووە بۆ یەك بتپەرستی و خۆریسی بەو تاکە خواوەندە داناوە. خوای گەورەش دەفەرموێت ﴿لَا تَسْجُدُوا لِلشَّمْسِ وَلَا لِلْقَمَرِ وَاسْجُدُوا لِلَّهِ الَّذِي خَلَقَهُنَّ﴾.

دووەم: چی ڕێز و ئاکاری جوان و لێکبوردنێ لەسەردەمی نەفامی دا لای عەرەبی نیمچە دوورگەی عەرەبی هەبوو شوێنەواری بانگەوازی یەکخواپەرستی حەنیفی ئیبراهیمی بوو. حەنەفیەکان یەك دوای یەك بیروباوەڕی خۆیان دەهێشتەوە تا

موحەمەد ﷺ هات. چەمك و واتای ئیسلام جیایە لە چەمك و واتای کتێبە پیرۆزە کۆنەکان و چەمك و واتا هیندۆسی و بوزی و مهبراتا و فیدیا و.... هتدەکان و ئەو چەمك و واتایانەی سەبارەت بە بنەڕەتی بوون و خەلقی مرۆڤ هەن. چونکە ئیسلام سەرچاوەیەکی خواییە و شتی باتڵ و نا ڕاستی پێ نیە.

لێرەوە ئەو بیردۆزە کۆمەڵایەتیانەی باس لە بنەڕەتی ئاینەکان دەکەن وەك ترسی سەرەتایی و ترس لە هێزی سروشتی ناڕوون و بە پەیکەرکردنی ئەو هێزانە یان بیردۆزەکانی زانستی نەفس کە پەیوەستن بە ئان وەك وێنەی ئەو باوکەی کە لە خوادا پەیکەری بۆ کراوە. ئەمانە بەسەر موسڵمانان دا جێبەجێ نابن. موسڵمان بۆ شتێکی ڕێنیشاندەر ناگەڕێ تا لە ترس و بیمی کەم بکاتەوە یان شتەکانی بۆ شیکار بکات. بەڵکو باوەڕێکی بەهێزی هەیە بەڕاستی باڵا. ڕاستی خواو یەکخواپەرستی کە لەو پێناوەدا موسڵمان قوربانی دەدات بە ژیانی.

هەروەها لە ڕۆژئاوا دا دیدی مەسیحیەت بۆ جیهان داڕما کە دامەزراوە لەسەر بنەمای بڕوا بوون بەوەی خوا باوکە و تا ئاستێکی زۆر مرۆڤی خۆش دەوێ تا ئەوەی تاکە کوڕی خۆی نارد بۆلایان. کاتێ گالیلۆ بۆیە یەکەمجار ئەو ڕاستیەی ئاشکرا کرد کە جیهانی ئیسلامی بۆ چەندین سەدە بوو ئەو ڕاستیەی دەزانی ئەو بیردۆزەیە داڕما، ڕاستیەکەش ئەوەبوو زەوی تەنها بە هەسارەیەکی بچوك دادەنرێ کە بە دەوری خۆردا دەخولێتەوە. کاتێ تێبینیە گەردوونیەکان دواتر ئەوەیان ئاشکرا کرد تەنانەت نیزامی هەتاوی لە گەردوونی بەرفراوانی خوادا کە ملیۆنەها کاکێشان و بلیۆنەها ئەستێرە لەخۆ دەگرێت لە گەردیلەیەك زیاتر نیە. بەڵکو لە ڕاستی دا نەك مرۆڤ بەڵکو هەموو زەوی لای خوا ئەو گرنگیەی نیەو ئەو مەسیحیەی زانست دەخوێنێ تەنها یەکێ لەو دوو پێشنیارەی لەبەردەم دایە:

١-یان مەسیحیەت بەرپەرچ بداتەوەو هەوڵ بدات دیدێکی یەکبوو پێك بهێنێ بۆ گەردوون جیا لە ئایین.

٢- یان ئەوەی ببێتە کەسێکی لێکهەڵوەشاو کە بە نهێنی بڕوای هەبێ بە بیروباوەڕەکانی. بەڵام لە بەرچاودا وا هەڵسوکەوت بکات کە ئەو بیروباوەڕانە لەگەڵ ژیانی واقیعدا ناگونجێن. بارەکە دواجار گەیشتە ئەوەی زۆربەی خەڵك لە ڕوسیاو وڵاتانی ئەورووپای ڕۆژهەڵاتی بە یەکجارەکی مەسیحیەتیان بەرپەرچدایەوە و لەبری ئەوە فەلسەفەی ماددییان هەڵبژارد. ئەو فەلسەفە ماددیەی کە کارێکی ساختەی زانستی لەخۆ دەگرێ کە هیگڵ و مارکس دایاننابوو. خەڵکێکی تریش شێوەی دووەمیان گرتەبەر.

بەشیکاری ئەو لێکهەڵوەشانە ڕۆحیەی مرۆڤی ڕۆژئاوایی جولیان هکسلی دەنوسێت: نمونەی باڵای ڕۆژئاواییمان بەر هێرش دەکەوێ چونکە بە پێویست یەکگرتوو نیە تا هەر هێزێکی دروستی بەرگریکاری هەبێ (ئازادیەکەی لە ئازادی بەرگریکاری دیکتاتۆریەتی ئاژەڵانەدا خۆی مۆڵداوە، بەڵام چەندە دابەشبوونی بۆ دوو بەشی نێوان سروشتی و خارق و نێوان خواو مرۆڤ و نێوان ماددەو ڕۆح بەردەوام بێ دواتر هێندە جەنگی ڕۆژئاواییمان بەردەوام دەبێ و بە هەموو واتایەکی ئەو وشەوە بەدەست لەتبوونەوە دەناڵێنێ و دواجاریش نمونەی باڵامان لە زێدە پێدانی هێزی کارا بۆ ئەنجامدانی کارێکی حەقیقی بە ئامانج گیراومان شکست دێنێ. (جولیان هکسلی: دین بلا وحی ١٩٥٧).

چارەسەری هکسلی بۆ ئەو کێشەیە داهێنانی ئاینێکە بەبێ خوا، ئەمەش بە فەلسەفەی پێشکەوتووی مرۆڤایەتی ناو دەبات. ئەوەی لە ڕوسیا بۆ مەسیحیەت ڕوویدا لە چین بۆ بوزی و لە یابان بۆ تاوی ڕوویدا. بێگومان هیندۆسی لە هیند بەر هەمان

سەرەنجام دەکەوێ چونکە دەرکەوتنی ڕاستی ڕێی پێ ناگیرێ و خواوەند و بیرو مەزهەب و ئایینە ساختەکانیش هەردەبێ لێکهەڵوەشێن) (دکتۆر م.م. صدیقی).

## * بیری ڕۆژئاوای مەسیحی چۆن بەرەو ڕووی بەرهەمی زانستی ئەزموونی ئیسلامی بوویەوە:

ئیسلام لە بەخشینی زانستیدا لێبوردە و بەخشندە بووە چونکە دەرگاکانی خۆی بەسەر خەڵك دا دانەخستبوو و ڕێی دابوو بەو خەڵکەی ئەورووپا کە حەزیان دەکرد بچنە زانکۆ ئیسلامیەکانی ئەندەلوس (زانکۆی بلنسیه و قورتوبه و ... هتد) تا زانستەکانی ئیسلام وەرگرن. ئەورووپیە مەسیحیەکان لە بەشە جیاجیاکانی ئەورووپاوە هاتن و لە زانکۆ ئیسلامیەکانی ئەندەلوس دا سەرقاڵی خوێندن دەبوون پێش ئەوەی ئەندەلوس بڕووخێ. زۆرێ لە ناودارانی بیری ڕۆژئاوایی شایەتی دەدەن بۆ ئەو بەخشە ئیسلامیەی کە بیری ڕۆژئاوای لە بەرنامەی تێڕامانی ئەرستۆییەوە گواستەوە بۆ بەرنامەی ئەزموونی ئیسلامی کە تۆوی ژیاری هاوچەرخ بوو. دواتر ڕۆژئاواییەکان بەسەر ئەو زانکۆیانەدا زاڵ بوون دوای ئەوەی دەسەڵاتی ئیسلامی لە ئەندەلوس دەرچوو. هەڵوێستی ڕۆژئاوا لەو مەسەلە بنەڕەتیەدا چۆن بێ و بانگەشەیان بەوەی موسڵمانان هیچیان پێشکەش نەکردووە ئەوا ئەو زانا بەویژدانانەی دواتر هاتن ئەو ڕاستیەیان ئاشکرا کرد و هەوڵیان دا دەربڕینی بەخششی ئیسلام وەڵام بدەنەوە. بەڵام ئەزموونی ڕۆژئاوا لەگەڵ ئەزموونی ئیسلامی دا سادە و ساکار نەبووە چونکە بەرەو ڕووی چەندین مەترسی بوویەوە و کڵێسا جەنگێکی سەختی لەگەڵ دا ئەنجام دا. ئەو ڕۆژئاواییانەی چەمکە ئیسلامییەکانیان وەرگرتن بەرەو ڕووکرانەوە بەرەو دادگاکانی پشکنین بران وەك گالیلۆ و کۆپەر نیکۆس، چونکە کڵێسا بینی زانستی ئەزموونی ئیسلامی لەگەڵ دەقی کتێبی پیرۆزدا ناگونجێ، ئەوەی لە سیفری تەکوین دا هاتووە

سەبارەت بە دروست بوونی گەردوون و تەمەنی زەوی لەگەڵ ئیسلام ناگونجێ. ڕۆژئاوا بیردۆزەی داروینیان وەرگرتبوو لە هەوڵی ئەوەدا بوون بیسەپێنن بەسەر بەرنامەکانی فێرکاریدا تەنانەت لە جیهانی ئیسلامیش دا تا بتوانن بەرامبەر بیردۆزەی حەقی ئیسلامی ناو قورئان بوەستن. ناکۆکیەکانی نێوان پیاوانی ئایینی کڵێسا و زانایانی ڕۆژئاوا گەیشتە ئاستێ کە زانایان بەتەواوەتی دژ بە مەسیحیەت و دواتر دژ بە ئاین بەگشتی وەستان. دواتر بانگەوازیان دەکرد بۆ ئاینێکی مرۆیی بیردۆزە ئەخلاقیەکانی جیا لە ئاین و نکوڵی لە سروش و پێغەمبەرایەتی و پەیامەکانی ئاسمان. ئەو چەمکانە لەگەڵ زانستی ئەزموونی دا بوون. جەنگەکەش لەگەڵ ئەو چەمکە مەسیحیەدا بوو کە قەدیس پۆلس پێشکەشی کرد. لەگەڵ ئەو چەمکە مەسیحیەدا نەبوو کە سەید مەسیح هێنابووی. لێرەوە ئەو جەنگەی ئەوروپا دژ بە ئاین بەخۆیەوە دی و دواتر مارکس و ئەنگلز ڕێبەری بوون لەڕاستی دا دژ بە چەمکی گشتیە کە نەبوو بەڵکو دژ بە مەسیحیەتی ڕۆژئاوایی بوو لە ململانێی لەگەڵ زانستی ئەزموونی لەلایەك و لەگەڵ چەمکە جولەکەیی و چەمکەکانی تریش دا لەلایەکی ترەوە.

ئەو چەمکانەی زانستە ئیسلامیەکان کە لە بەردەم زانایانی ئەوروپادا کۆمەڵێ ڕاستیان نیشان دان پێچەوانەی ئەوە بوون کە لە کتێبی پیرۆزدا هاتبوو، گرنگترینیان (خولانەوەی زەوی). چەمکی کڵێسایی سەبارەت بە بوون وەرگیرابوو لە بیردۆزەکانی بەتلیمۆس و فیساگۆرس کە ئەزموونی جیهانی ئیسلامی هات هەڵەکەی نیشان دا، بەڵام ئەبە مەسیحیەکان سوور بوون لەسەر ڕاستی ئەو بیردۆزانە و مشتومڕ کردنیان لەسەر ئەوە قەدەغە کرد. پیاوانی ئاینی دیدێکی جیاوازیان هەبوو بۆ کۆمەڵەکانی ئاسمان. ئەوان کائینی زیندویان دادەنان و دەوترا نشینگەی فریشتەکانە، دەوترا ئەستێرەکان کائینی ڕۆحین و ئاسمان گومەزیەکی ڕەقە و زەوی و جەستە ئاسمانیەکانیش بە چەند چرایەکی هەڵواسراوی ئاسمان چوار دەوردراون. زانست هات

تا بڕیاری تر بدات. دواتر چەمکی ئیسلامی کاریگەری خۆی هەبوو لە شکستی چەمکی کڵێسا سەبارەت بەوەی تاکە پەیوەندی نێوان خواو مرۆڤە و نزاو نوێژو داوای لێخۆشبوون تەنها لە ڕێگەی کڵێسا و پیاوانی کڵێساوە بەخوا دەگات.

هەر ئەو هەوڵە چاکسازیە ئاینیە هات کە مارتن لۆسەر و کالڤن بۆ بەرەنگاربوونەوەی فرۆشتنی پسولەی لێخۆش بوون ئەنجامیان دا چونکە ئەوەیان بە پێناوێکی دروستی دەوڵەمەندی دانابوو. کالڤن وتی پەیوەندی نێوان خواو مرۆڤ پەیوەندیەکی ڕاستەوخۆیەو هیچ سەرە مرۆڤێ حورمەتی تەقدیسی نیە. بەو جۆرە ئیسلام کاریگەری هەبوو لە ڕزگارکردنی بیری مرۆیی لە ڕێنماییەکانی سەدەکانی ناوەڕاست. ئەو ڕێنماییانەی ڕێیان نەئەدا مەسیحیەکان چێژ وەرگرن لە زانستە سروشتی و ئەزموونیەکان.

ئەمڕۆ ڤاتیکان پاشەکشە دەکات لە دەسەڵاتی دژ بە گالیلۆ و کۆپەر نیکۆس و داندەنێ بەو دەست کەوتانەدا کە ئیسلام پێشکەشی کردن. هەروەك دانپێدانانێکی ڕاشکاوانەی کۆمەڵی قەشەکانی ڤاتیکان دەبینین کە داندەنێن بە گەورەیی ئاینی ئیسلام لە تێگەیشتن و چێژ بەخشی کلتوری مەسیحیەت بەچاکترین شێوە.

مەتران جۆرج خصر دەڵێت ئیسلام بوو مەسیحیەتی لە چەوساندنەوە ڕزگار کرد و دەسەڵاتی ئیسلامی بەرامبەر بە هەڵگرانی ئاینەکانی دیکە بەویژدان بووە و بە ئەهلی زیمە دایناون. مەسیحیەت وەك تەواوکەری ئاینی موسا (علیە السلام) هات و پەیوەست بوو بەو نیزامی موسەوی و تەشریعەی کە تەورات هێنای. نیزامێکی تایبەت بە ئەخلاق و لێکبووردن بووە تا سنوری ماددی کۆمەڵگەی جولەکە دیاری بکات. بۆیە لەو کاتەوەی جیابوویەوە و پۆلس وەك ئاینێکی جیهانی بانگەوازی بۆ کرد پێویستی بە نیزامێکی کۆمەڵایەتی تایبەت بەخۆی هەبوو. ئەم گۆڕانەش وریایی و مەترسی خۆی هەبوو. مەسیحیەت هەندێ بیروڕای ئاینە بتپەرستەکانی کەشوهەوای دەوڵەتی ڕۆمانی

وەرگرت تا شوێنکەوتە بۆ خۆی پەیدا بکات وەك ئەوەی جولەکە وا دەردەکەوێ تەنها واتاو چەمکی ماددی لەخۆ بگرێ و مەسیحیەتیش تەواوی چەمك و واتای ڕۆحی لەخۆبگرێ. دواتر ئیسلام هات و ماددەو ڕۆحی پێکەوەیەکخست بۆیە دەبینین قورئان سەرکۆنەی بەنو ئیسرائیل دەکات کە بەها و ڕۆحانیەتیان پشت گوێ خستووەو سەرکۆنەی ئەهلی ئینجیل دەکات بەوەی دنیایان پشتگوێ خستووە ئەگەر دەتانەوێ ئەم ئایەتە بخوێننەوە ﴿مُحَمَّدٌ رَّسُولُ اللَّهِ وَالَّذِينَ مَعَهُ أَشِدَّاء..........﴾ (الفتح)

کاتێ مەسیحیەت چوویە ئەورووپا بەهێزی دەسەڵاتی بتپەرستی ڕۆمانی سەپێنرا بەسەر خەڵك دا و قوستەنتین کردی بە نیزامی دەسەڵات. کەوتە ڕوکارێکی زێدەڕۆیی ڕۆمانی لە ڕوهبانیەت و کەنارگیریەکی وادا کە جەستەی سزا دەدا و ئەو پاکانەی خوا حەڵاڵی کردبوون حەرامی دەکردن. دواتر ئەو ڕوهبانانە لەبەر ئامانجە شەخسیەکانی خۆیان کڵێسایان بەکاردەهێنا. دواتر ململانێی کڵێسا لەگەڵ ئەو دەسەڵاتدارانە دا دەستی پێکرد.

داربەر لە کتێبەکەیدا (ململانێی نێوان ئاین و زانست) دەڵێت:

(بتپەرستی و شیرك لەڕێی ئەوانەوە بە ڕوپامایی و درۆ خۆیان بە مەسیحی نیشان دەدا چوویە ناو مەسیحیەتەوە، ئەو کەسانە بۆ وەرگرتنی پایە باڵاکانی ناو دەوڵەتی ڕۆمانی بێ ئەوەی بڕوایان بە مەسیحیەت هەبێ دەبوونە مەسیحی، ئیمپراتۆر قوستەنتین وابوو کە بێ ئەوەی دەست هەڵگرێ لەستەم و خراپە بوو مەسیحی، بەناچاری بوو بە مەسیحی دوای ئەوەی مەسیحیەت بەرەو دەسەڵاتی برد بەو هیوایەی پەیوەستی فەرمانی مەسیحیەت بێ و هەوڵی بڵاوکردنەوەی بدات و میکرۆبی بتپەرستی ڕۆمانی لەناوببات. لە ئەنجامی ئەو ململانێیەدا بنەما و بەهاکانی مەسیحیەت لەگەڵ پاشماوەی ئەو بتپەرستیەدا تێکەڵ بوون و لەئەنجام دا ئاینێکی نوێ سەریهەڵدا کە تێکەڵەی مەسیحیەتی ڕەسەن و بتپەرستی یۆنانی و ڕۆمانی بوو). قوستەنتین هەوڵیدا

لەپێناو پتەوکردنی پایەکانی دەسەڵاتی دا هەردوو دەستەی نەیاری نێوان بتپەرستی و مەسیحیەت پێکەوە بگونجێ بێ ئەوەی ڕاستگۆیانە هەڵگری حەقیقەتی ئاین بێ. مەسیحیەکان وایان دانا قبوڵکردنی ئەو بارە تەنها بۆ قۆناغێکە و دەوەستێ و دواجار مەسیحیەت لە پیسی بتپەرستی ڕزگار دەبێ. مەسیحیەت ئاینێکی ئاسمانیە، بەڵام وەك بیروباوەڕێکی تەواوکەری جولەکایەتی و ڕاستکەرەوەی ئەو ئاینە وەك شۆڕشێکی ئەخلاقی لە کۆمەڵگەی گەندەڵی جولەکەدا. بۆیە شەریعەتە بنەڕەتیەکەی تەورات بوو لەگەڵ چەند گۆڕانکاریەکی شادەدا کە لە ئینجیل دا هەبوون. بۆیە چەمکی سروشتی مەسیحیەت ئەوە بوو بەو شەریعەتە خوایە دابەزیوە کاریکات کە لە تەوراتی ئەسلێدا هەیە لەگەڵ ڕەچاوی ئەو گۆڕانکاریانەدا کە لە ئینجیل دا هەن. بەڵام ئەوەی ڕوویدا وانەبوو. بەڵکو مەسیحیەت لە کۆمەڵگەی جولەکەوە گۆڕا بۆ کۆمەڵگەی ڕۆمانی و یاسای ڕۆمانی بەو نەزانی و بتپەرستیەوە پەیڕەو دەکراو مایەوە. کاتێ ململانێی نێوان ئاین و ژیان دەرکەوت کلێسا دەسەڵاتی خۆی بەسەر دڵ و هەستەکان دا هەبوو. بەڵام یاسای ڕۆمانی لە واقعی ژیان دا دەسەڵاتی خۆی دەچەسپاند.

ئەم تێکەڵەی لەبیری ڕۆمانی و بیری مەسیحی پێکهاتبوو لە دەرکەوتنی چەند چەمکێك دا کاریگەری هەبوو کە ژیانی شێواند. لەپێش هەموویانەوە بیروباوەڕی سیانە خودایی کە نەوە یەکەمینەکانی مەسیحیەت ئەوەیان دەزانی. ئەو سیانە خودایە لە کۆمەڵگە بتپەرستیەکان دا باوبوو، یەکەم کەس بانگەوازی بۆ کرد ترتلیان بوو لە سەدەی دووەمی زاینیدا کە هێنرایە ناو مەسیحیەتی حەقی یەکخواپەرستی. ئەو بڕوایە زاڵ بوو بوو بەسەر زۆربەی ئاینەکانی پێش مەسیحیەت دا. لە هیند سیانەی بەرهەمی (براهما و فیشنو و سیفا) هەبوو. لە ئاینی جولەکەدا سیانەی بوزی خواوەند (ترافانا، بوزای کوڕ، ڕوحولقودس) هەبوو. لە وڵاتی چین سیانەی چینی (تی ین) خواوەندی گەشەسەندوو و (تی سمین) خۆر و (تشانج) ڕۆحی باوك و فەرمانڕەواکان هەبوو. لە

ولاتی کلدان سیانەی پێکهاتوو لە بەعل (خواوەندی خۆر) و عشتروت (خواوەندی جوانی) و تەمووز (خواوەندی پیت و گەشە و نما) هەبوو. لە فیرعەونیەت دا (ئاتون ئامون رەع) بوون و حیکەمت و ژیان. (لێکۆڵینەوەی مامۆستا محمد عزت الطهطاوي) لە (قاموس الكتاب المقدس) دا هاتووە:(گەورە زانایانی لاهوت دان بەوەدا دەنێن وشەی سیانە خودایی لە کتێبی پیرۆزدا نەهاتووە و گومان هەیە یەکەم داهێنەرو بەکارهێنەری ترتلیان بووبێ لەسەدەی دووەمی زاینیدا. زۆریێ دژی ڕاکەی بوون بەڵام ئەنجوومەنی نیقیە لە ساڵی ٣٢٥ز.دا بڕیاری سیانە خودایی دا و دواتر لە کڵێسە مەسیحیەکان دا لەسەر دەستی ئۆگەستیۆس لە سەدەی پێنجەمی زاینی دا چەسپا).

ئەدۆلف هرنك مامۆستای مێژووی کڵێسا لە زانکۆی بەرلین دەڵێت:

سیفەتی سیانە خودایی کە باس لە باوك و کوڕو ڕوحولقودس دەکات باسکردنی لەسەر زمانی مەسیح نامۆیە و لەسەردەمی پێغەمبەران دا بوونی نەبووە، ئەمەش ئەگەر لە خودی مەسیحەوە دەربچوایە ئەوکات بەشیاوێتی دەمایەوە.

دیاری ئاریۆس و هاودەمە یەکخواپەستەکانی زیاتر لە نیو سەدە (٣٢٥–٣٧٩ز) دژ بەبیری سیانە خودایی وەستان تا ئەسناسیۆس زاڵ بوو بەسەریان دا و لە ساڵی ٣٧٩ز. دا سیانە خودایی سەپاند، شوێنکەوتە یەکخواپەرستەکانی ئاریۆس تا سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) مانەوە و پێغەمبەر (ﷺ) لە نامەیەك دا بۆ هیرقلی ئیمپراتۆری دەوڵەتی ڕۆمانی باسی کردوون (من بانگت دەکەم بۆ ئیسلام موسڵمان بە پارێزراو دەبیت و خوا دوو جار پاداشتت دەداتەوە ئەگەر وا نەکەیت ئەوا تاوانی ئەریسیەکان لەسەر شانتە)ئەو ئەریسیانە شوێنکەوتەی ئاریۆس و پشتیوانانی بیروباوەڕی تەواوی ئەو یەکخواپەرستی یە بوون کە سەید مەسیح و حەواریە دڵسۆزەکانی بانگەوازیان بۆ دەکرد.

بیری سیانە خودایی بە مەترسیدارترین هۆکاری لەرزەی بیروباوەڕی مەسیحی دادەنرێت و تا ئێستاش کاریگەری قوڵی هەیە. چونکە لەسەر بیروباوەڕێکی بتپەرستی کۆن دامەزراوە کە عەقڵ قبوڵی ناکات، ئەویش بریتیە لە تاوان و هەڵە و فیداکاری. سەید مەسیح هات و لەبەر دان نەنان بە هەڵە و تاوانی ئادەم (علیە السلام) بەسەرکەش بوون لەخوا لەخاچ درا. ئەوان دەڵێن سەید مەسیح هات تا لەبەر تاوانی ئادەم خۆی بکاتە قوربانی بۆ مرۆڤایەتی. ئەمەش بیروباوەڕێکی کۆنی بتپەرستیە کە قورئانی پیرۆز ڕاستی ئەو مەسەلەی خستووەتە ڕوو بەوەی ئادەم کاتێ لە درەختەکەی خوارد لە فەرمانی خوا دەرچوو بەڵام تەوبەی کرد و خواش لێی خۆش بوو. ئیتر تاوانێ نەما و ئیسلامیش دان بەوەدا نانێ تاوانی کەس بگوازرێتەوە بۆ کەسی تر ﴿وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ﴾ هەروەها ئیسلام دان نانێ بە بیردۆزەی (باوك و کوڕ و ڕوحولقودس)دا، سەید مەسیح بەندەو نێردراوی خوایە و خوای گەورەش بەرزو شکۆدارە ﴿لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ وَلَمْ يَكُن لَّهُ كُفُوًا أَحَدٌ﴾ سەبارەت بە لەخاچ دانی مەسیح بانگەشەیەکی پوچەڵەو قورئانی پیرۆز بڕیاری دا ئەوە ڕووی نەداوە ﴿وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ وَلَـٰكِن شُبِّهَ لَهُمْ﴾.

سەبارەت بە خاچ ئەوا لە بنەڕەت دا دروشمێکی خاچپەرستیەو بەکارهێنانی لە زۆربەی شارە بتپەرستیەکانی ڕۆژهەڵات دا باو بووە و مەسیحیەکان لە سەرەتاکانی سەدەی چوارەمی دوای زاین دا ئینجا خاچیان کرد بە دروشمی ڕەسمی خۆیان.

مەسیحیەت لەو گۆڕانەیدا کە پۆلس پێی هەستا کۆمەڵێ بیری پووچی کۆکردەوە کە لە چەمکی ئاییني دابەزیو دەریکرد، یەکەمیان هەڵەو تاوان. دووەم ڕەبانیەت و کەنارگیری. سێیەم سیانە خودایی.

سەبارەت بە هەڵە و تاوان ئەوا ئیسلام بڕیاری ئەوەی داوە مرۆڤ بەرپرسە لە کاریو لەسەری نیە تاوانی کەسی تر لە ئەستۆ بگرێ. هیچ تاوانێکیش نیە با هەرچەندە و

چۆنێ بێ کە هەموو مرۆڤایەتی بگرێتەوە. بەڵکو ئیسلام بەپێی هەڵسوکەوت و کاری هەر کەسێ دەڕوانێتە کەسەکە. ئیسلام ئازادی هەڵبژاردن و بەرپرسیارێتی تاکە کەسی داناوەو کارەکانی بەدوایدا دەچن. ئیسلام بڕیاری داوە لە بنەڕەتی مرۆڤدا چاکە هەیە پێچەوانەی ئەوەیکۆمەڵێ ئاینی تر دەڵێن مرۆڤ بە هەڵە و تاوانکاری دروست بووە یان سەرەتای کاری مرۆڤ پیسە، بەڵکو قورئان بڕیاری داوە مرۆڤ بە تەواوی دروست کراوەو تاوانیش لەپێش لەدایك بوونی مرۆڤ دا بەمیرات نامێنێتەوە و پێویست نیە تاوانێ لە ئەستۆی هەمووان دا بێ. گۆستاف گرونیام دەڵێت مرۆڤی ئیسلامی پێچەوانەی خەڵکی تر لەژێر فشاری تاوانی بنەڕەتیدا ناناڵێنێ. ئەو تاوانە بنەڕەتیەی زاڵە بەسەر تاکدا و خراپەی لەسەر نوسرابێ.

بیری تاوانی بنەڕەتی تا ئەمرۆش لە بیری نوێی ڕۆژئاواییدا لە پشت هەموو فەلسەفەکانەوە وەك شمشێری سەر گەردن کارایە.

سەبارەت بە کەنارگیری ئەوا ئیسلام بەوە قایل نیە کە لە ژیان کەنار بگرێت. دنیا نەویستی واتای حەرامکردنی حەڵاڵەکان نیە بەڵکو زوهد ئەوەیە ئەوەی لەدەست خوایە لای تۆ لەوە بەهێزتر بێ کە لەدەست خۆتە. بەهێزترین شێوەی زوهد لە ئیسلام داقوربانیدانەب ە گیان لەپێناو کۆمەڵدا. کەنارگیری ئیسلام جیهادە. ئیسلام هەموو نەوەکانی بانگ دەکات تا تێکەڵی کۆمەڵگە بێ و ناچاری کردوون سود ببینن لە هەموو سودبەخشیەکانی دنیاو هەر وەستانێ لە ژیان لەسەر بنەمای پەرستش و زوهدو کەنارگیری پێچەوانەی چەمك و واتای ئیسلامە. ئیسلام موسڵمانان بانگهێشت دەکات تا لەنێو ئارەزو و کێشەکانی ژیان دا زوهدی هەبێ نەك لە ژیان کەنار بگرێ. ئیسلام داوا دەکات ئاگاداری دنیا بیت و گەشەی پێ بدەیت لەچوارچێوەی لەخواترسی و ئاراستە کردنی بەرەو لای خوای گەورە.

ئەگەر بڕوانینە مێژووی ڕەهبانیەت دەبینین قورئان لەبارەیەوە دەفەرموێت ﴿وَرَهْبَانِيَّةً ابْتَدَعُوهَا مَا كَتَبْنَاهَا عَلَيْهِمْ﴾(ڕەهبانیەتێ کە دایانهێنا و ئێمە لەسەرمان نەنوسیبوون).

گۆلز لە کتێبەکەیدا سەبارەت بە ڕوهبانیەت لە ڕۆژهەڵات دا دەڵێت کڵێاسی قیبتی کاریگەر بوو بە بیروباوەڕی میسریە کۆنەکان لەکاتێ جەستەیان بە فەوتاو و گیانیان بە ماوە و لەناونەچوو دادەنا، ئیدی خۆشی دنیایان بەسوك سەیر دەکردو بەهیچیان دەزانی و دەبێ لەدەستی ڕزگار بیت تا بەریەستی ڕێی هەمیشە مانەوەیان لەبەردەم ا نەمێنێ. ئەمە ڕاڤەی ئەوەیە کە زاهیدانی جیهانی ئێمە دەچنە بیابان و لە گۆڕستانی میسریە کۆنەکان دا ژیانیان دەبەنەسەر و کردویانە بە پێگەی کەنارگیری. هەروەها دەڵێت کەنارگیری بەرهەمێکی ڕۆژهەڵاتیە کە لە میسر و فەلەستین دەرکەوت و دواتر بەرەبەرە بەرەو بەشە جیاجیاکانی تری جیهانی مەسیحی گوازرایەوە، ڕاهیبانیش لەزۆربەی ڕووداوەکانی مێژوودا ڕۆڵی گرنگیان هەبووەو هەندێکیان سامانێکی ناڕەوایان هەبووە دێرەکانیان بەڵگەی خۆشی و خۆشگوزەرانیانن و ئەوە دەگەیەنن چەمکی دروستی ڕەهبانیەتیان لەبیرکردووە).

چەندین لێکۆڵینەوە ئاماژە بەخراپە و مەی و بێ ڕەوشتی ناو دێرەکان دەدەن. لیکی لە کتێبەکەیدا (مێژووی ئەخلاقی ئەوروپا) دەڵێت: ڕەهبانیەت نەیتوانی ڕێ بە شەپۆلی ماددی بگرێ و زێدەڕۆیی و لادان لە ئەخلاقی خەڵك دا گەیشتنە لوتکە و بێ ئابڕویی و خراپە زاڵ بوو و کۆمەڵگە بۆ دوو چینی دوور لە یەکی ڕەهبانیەتی زێدەڕەوو خراپەکاری زێدەڕەودا باش بوو. خەڵکی ڕەهبانیەتی سلبیان بە دوژمنی فیترەتی مرۆیی دادەنا. ئەو فیترەتە ماوەیەك دەستەوسان مایەوە دواتر ئەویش پێناوەکانی فەسادی ئەخلاقی دزەی کردە ناوی و بەرەو تاوانە گەورە و کارە خراپەکان چوو. ئەو نەگبەتیەی توشی بیری ئاینی بوو تاوانی پیاوانی ئاینی بوو بە زانیاریە مرۆییەکانی

ئەوکاتیان وەك ڕاستی چەسپاو سەپاندن بەسەر بیری خەڵك دا بەبەشێ لە ئاینیان دانان و درۆ و تەنانەت کوفریشیان بەکاردەهێنا دژ بە هەر کەسێ پێچەوانەی ئەوە بڵێ‌و سەختترین سزایان بەکاردەهێنا. دواتر کاتێ ڕێنیسانسی نوێ هات و چەمکە زانستیەکان بەرەبەرە گۆڕان و گەشەیان سەند ململانێی نێوان زانست و کڵێسا ڕوویدا و ئاین بەسەختی شکستی خواردو پیاوانی ئاینیش شکان و نەیانتوانی سەرپێ کەونەوەو بیری ئاینی لە ئەوروپا شۆك داماو کاریگەری خۆی لەسەر ویژدان و دەروونەکان لەدەست دا و ئەوروپا بوو بە ڕاپەڕیوێکی نا ئیاینی کە ڕاشکاوانە بەرامبەر مەسیحیەت‌و هەموو ئاینە ئاسمانیەکان وەستا. ئەو بیرە زاڵ بوو کە بیری ئاینی و بیری زانستی نەیارو دژی یەکن. بڕوابوون بە یەکێکیان بەدڵنیاییەوە بڕوابوونە بەوی تریان. بەمجۆرە ئەو وریایی لێبووەی کە ئەوروپای بەرەو ماددیگەری برد بە هەموو واتاکانیەوە زاڵ بوو وئاینی لەژیان جیا دەکردەوەو دەیوت ئەگەر ئاین هەشبێ شتێکی تاکە کەسیە و پەیوەستە بە خودی مرۆڤ و ناچێتە سیاسەت و کۆمەڵگەو دەوڵەت. لە هەموو ئەمانەوە ئەوە چەسپا ئایینی ماددی بەسەر ئەوروپا و ئەمریکای ئەمڕۆدا زاڵە نەك مەسیحیەت. هەموو چاکەکان لە سودی زانستیدان و بەها باڵا و بنەما سیاسیەکانیش تەنها سەرکەوتنی ماددین و هیچی تر. ئەمە وایکرد جۆن جنتزی ئەمریکی بڵێ ئینگلیزەکان لە هەفتەیەك دا شەش ڕۆژ بانکی ئینگلتەرا دەپەرستن و ڕۆژی حەوتەمیش دەچن بۆ کڵێسا.

سەبارەت بە بیروباوەڕی سیانە خودایی ئەوا بیری زاڵی ناو کڵێسا ئەوە بوو مەسیح خواوەندێکە لە شێوەی مرۆڤدا تا مرۆڤ پێی بگات. دابەزینی ڕەحمەت و ڕزگاریە بۆ مرۆڤایەتی، مەسەلەی شێوەگیری مرۆڤ مەترسیدارترین پرسێکە کە دوای دەه سەدە لە دەرکەوتنی مەسیحیەتەوە تا ئێستاش ماوە. مەسەلەی شێوەگیری چوو تا شێوەیەکی مرۆیی لەخۆگرت و لەدیدی ئەوان دا خواوەندێکی تەواو و مرۆڤێکی تەواوە.

تەنها ئەو دوو سیفەتە کە بە واتای تەواوی خۆی لەخۆ دەگرێ و عیسا لە بیروباوەڕی سیانە خودایی دا ئەقنومی دووەمەو لەو ڕێگەیەوە دەگەیتە خواوەندی سیانەو ئەوەش ڕێگەیەکە کە گەیشتن بەخوا لەڕێگەی عیسای مەسیحەوە دەبێ وەك پەروەردگاربێ.

لە ئینجیلی یوحەننا ١٤/١ دا هاتووە (وشەکە بوو بە جەستەو لەنێومان دا دەرکەوت واتە ئەو لە شێوەی مرۆڤدا خواوەندێکە).

بێگومان مەترسیدارترین مەسەلەی بیری هاوچەرخی مرۆیی کە ئیسلام بەرەنگاری بووەتەوە مەسەلەی سیانە خوداییەو ئێستا جێی لێکۆڵینەوەی وردە و لە بازنەی لاهوت دا دەردەکەوێ و کاریگەری قوڵی هەیە بۆ سەر دەروونی زۆرێك لە خەڵك.

نوسەری (التأريخ الحضارات اليوم بەرگی چوارەم) بە سەرپەرشتی موریس کروز یەمی ٥٣٨ دەڵێت: وتە سیانە پیرۆز عەقڵ بەرامبەری دەستەوسان دەوەستێ و ناکرێ لەدەستی دەرباز بێ و شتێ نیە ئەندێشە وێنای بکات. ئەوە بیروباوەڕێکە هەمیشە بەردی بەردەم عەقڵە و زۆرێ یان وەری دەگرن یان بەردەوام نابن لەسەر وتنی. بە پێچەوانەوە بیروباوەڕی یەکخواپەرستی ئیسلام وایە کە کائینی هەمیشەیی ئەزەلی لەناونەچووە، ئەم هەستکردنە بە یەکخوایی لە ڕێنمایی ئیسلامیدا ڕەگی داکوتاوە و بەسەر ژیانی باوەڕداران دا زاڵەو هەژموونی هەیە بەسەر هونەردا بەتایبەت هونەری بنیادو وێنەکێشان).

مەترسیدارترین بیردۆزەیەك کە لە ئاسۆی مەسیحیەت دا خراوەتە ڕوو مەسەلەی (کوڕێتی بوونی خوایی مەسیحە) رینان لە کتێبەکەیدا (حياه المسيح) دەڵێت کوڕی خوابوونی مەسیح کە مەسیح دەیلێن لە واتادا پێغەمبەرایەتیەکی مەجازیە کە خوا وا هەڵسوکەوت لەگەڵ مەسیح دەکات کە باوکێ لەگەڵ کوڕەکەی سۆز و چاکە نیشان دەدات. شێخ موحەمەد عەرفە دەڵێت کوڕایەتیەك کە مەسیح باسی دەکەن کوڕایەتی ڕێز و گەورەیی نەك کوڕێتی و لەدایك بوون. ئەگەر مەسەلەکە لەو ڕووەوە بێ خەڵکی

دەگەڕێنەوە بۆ یەكخواپەرستی پوخت ڕووەو ئاینی حەق. قورئانیش لە هێرشیدا بۆسەر مەسەلەی كوڕێتی و ڕەچەڵەك و لەدایك بوونی لەگەڵ مەسیحیەت نەجەنگاوە، بەڵكو دژی داهێنراوێكە كە مەسیحیەت خۆی لەپێش هێرشی ئیسلام دا دژی جەنگاوە.

ئەو مەسەلانە پێویستیان بەوەیە هەوڵێكی زۆریان بۆ بدەیت تا عەقڵەكان پێی ڕازی بن، لێرەوە ئەو فەلسەفە مەسیحیە دەركەوت كە هەوڵ دەدات مەنتیق و تەئویل بەكاربهێنێ لەپێناو خزمەتی چەمكی سیانە خودایی و خۆبەخشی و شێوەنوێنی و تاوان و حەوت نهێنیەكە بەو جۆرەی ئۆگەستین و قدیس تۆما ئەنجامیان دا دواتر بەلاهوتی مەسیحی ناسرا.

گەورەترین وریاخوازیەكان لەڕووی دامەزراوەی مەسیحی كڵێسا دا بریتین لە:

**یەكەم: قبوڵكردنی چوونە نانەوەی بتپەرستی بۆ ناو مەسیحیەت:**

كڵێسا وایزانی بۆ نزیك بوونەوە لە پیاوانی كۆشكی ڕۆمانی ڕێ بدات بە بتپەرستی تا بەوە ڕۆ بچنە بنەڕەتەكانی مەسیحیەت كە لەسەر یەكخواپەرستی دامەزرابوون. بتپەرستی و شیركیش بە كاریگەری ئەو دووڕوانە چوویە ناو مەسیحیەت كە بە خۆنیشان دانیان وەك مەسیحی توانیان پایە باڵاكانی ناو دەوڵەتی ڕۆمانی بگرنە دەست. لە ئەنجامی ئەمەدا ئاینێكی نوێ دەركەوت كە مەسیحیەت و بتپەرستی تیایدا یەكسان وەستان، لێرەوە بیروباوەڕی سیانە خودایی (باوك و كوڕو ڕوحولقودس) سەریهەڵدا و بتپەرستی فشاری لەسەر مەسیحیەت دانا، دوای ئەوەی ئەو گومانەی بۆ دروست كردن مەسیح كوڕی خوایە، خوای گەورەش دوورە لەوەی ئەوان دەیڵێن.

**دووەم: وەستانیان لەڕووی زانستە ئەزموونیەكاندا:**

دژایەتیان بۆ ئەو زانایانەی زانستیان لە موسڵمانان وەرگرتبوو بەڵكو كڵێسا فردریكی دووەمی فەرمانڕەوای صقلیەی دەركرد كە لە ساڵی ١٢١٥بوو بە ئیمپراتۆری ئەڵمانیا لەبەرئەوەی وەرگێڕانی كتێبە فەلسەفی و زانستیە ئیسلامیەكانی پێشكەشی

زانكۆكانی پۆلۆنیاو پاریس كردبوو و لـه سـاڵی ١٢٤٤دا زانكـۆی نـاپۆلی دامەزرانـدبوو و كردبوونی بە ئەكادیمیایەك تا زانستە ئیسلامیەكان بباتـە نـاو ڕۆژئـاوا. پاپـا گریگـۆری نۆیەم بە تۆمەتی نیشاندانی هـەواداری بەرامبـەر ئیسـلام لـە كڵێسا دەریكـرد. بوهـان رامسكەش كە لە ساڵی ١٧٧٤ز. دا مردووە هەمان سەرەنجامی هەبوو و پیاوانی لاهـوت بە زندیق تۆمەتباریان كرد چـونكە ئامـادە نـەبوو بـە خراپـە وەسـفی پێغەمبـەر (ﷺ) بكات و ئامـادەش نـەبوو مێـژووی جیهـان دابـەش بكـات بـۆ مێـژووی پـیرۆز و مێـژووی ناپیرۆز. بۆ ئەمەش ئازارو ناڕەحەتی زۆری توش بوو و بە مایە پووچـی و پەككەوتـەیی لە تەمەنی پەنجا و هەشت ساڵی دا مرد.

سێیەم: خراپ ڕوانینی پیاوانی كڵێسا بۆ ئافرەت:

ئەوان پێیان وابوو ئافرەت لەكاری شەیتانە و پیسە و لە ڕەگەزێكی جیا لە ڕەگـەزی مرۆڤە. ئەوەی لەو بارەوە جێی باسە ئەوەسە كۆڕی باكوسی مەسیحی لە ٥٨٦ و دوای لە دایكبوونی پێغەمبەر (ﷺ) بەماوەی شانزە ساڵ قسەی لەسـەر ئـەوە دەكرد ئایا ئـافرەت مرۆڤـە یـان شـەیتان. لـە هـەمان كـات دا لـە مەككـە ڕادەگەیـەنرا ئافرەتـان هاودەمـانی پیـاوانن و ئـافرەت ئـەو مـاف و ئەركـەی هەیـە كـە پیـاو هەیـەتی و دەبـێ فێربێ‌و بخوێنێ و نوێژبكات و خواپەرستێ.

چوارەم: قبوڵكردنی بیری بانگەوازی جیهانی بۆ مەسیحیەت:

مەسـیحیەت بانگـەوازێكی سـنورداربوو بـۆ گـەلی بەنوئیـسرائیل و تەواوكـەری جولەكایەتی بوو بەو جۆرەی لە ئینجیلی مەتا ئیصحاحی پێنجـەم ١٧دا هـاتووە سـەید مەسیح دەڵێت (وا نەزانن من هاتووم تا ناموس یان پێغەمبـەران هەڵبوەشـێنمەوە. مـن نەهاتووم تا هەڵبوەشێنمەوە بەڵكو تا تەواوی بكەم).

خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت ﴿وَإِذْ قَالَ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ يَا بَنِي إِسْرَائِيلَ إِنِّي رَسُولُ اللَّهِ إِلَيْكُم مُّصَدِّقاً لِّمَا بَيْنَ يَدَيَّ مِنَ التَّوْرَاةِ وَمُبَشِّراً بِرَسُولٍ يَأْتِي مِن بَعْدِي اسْمُهُ أَحْمَدُ﴾.

حەواریـــەکان بانگەشـــەی ســـەربەخۆیی مەســـیحیەت لـــە جولەکـــەیان نـــەدەکردو بانگەشەی جیهانبوونی مەسیحیەتیشیان نەدەکرد. بەڵام پۆلس کە مەسیحی لەژیانیدا نەدیبوو و هیچی لێ نەبیستبوو هات و مژدەی دەدا بـە خـەڵك و سـەرەتا بیروبـاوەڕی یەکخواپەرستی هەڵوەشاندەوە بە وتەی سیانە خوایی و بیرۆکـەی هەسـتانی مەسـیح و کوڕێتی بۆ خوا تا بە گیانی تاوان و هەڵەی مرۆڤایەتی بسڕێتەوە، پاشان بە نەهێشتنی خەتەنە. دەیوت دەبێ مەسیحیەت لەناو گەلانی بتپەرستی ناوچەکانی دەوڵەتی ڕۆمانی دا بڵاوبکرێتەوە. پۆلس یەك بەڵگەو یەك قسەشی پێنەبوو لـە مەسـیحەوە کـە بـاس لـە جیهانبوونی مەسیحیەت بکات.

**پێنجەم: فرمیی ئینجیلەکان:**

ئەو کتێبانەی دەدرانەوە پاڵ مەسیح (**علیه السلام**) گەیشتنە زیاتر لە حەفتا کتێب یان ئینجیل کە هەندێ دەڵێن سەد کتێب بوون. هەموویان جیا بوون لەو ئینجیلـەی کـە دابەزیە سەر مەسیح و لـەنێو ئـەو ئینجیلانـەدا ئـەو ئینجیلـە نـەبوو کـە قورئـان باسـی کردووە دابەزیوە بۆسەر عیسای کوڕی مەسیح (**علیه السلام**) بەڵکو هـەموو دراونەتـە پاڵ خوێنـدکارەکانی مەسـیح و تیایـدا ژیاننامـەو ئامۆژگاریـەکانی مەسـیحیان هێنـاوە. ئەگەر بمانەوێ ئەوە لەگەڵ کتێبەکانی سیرەدا بەراورد بکـەین. کاتـێ لـە سـاڵی ٣١٥دا ئەنجوومەنی نیقیە بیروبـاوەڕی سـیانە خـودایی و خـودایی بـوونی مەسـیحی چەسـپاند سوتاندنی هەموو ئەو کتێبانەشی کردە بڕیـار کـە دان نـانێن بـە خوایـەتی مەسـیح دا و چوار کتێبە دەساو دەست پێکراوەکانی (مەتا و مـرقص و لۆقـا و یوحـەننا)ی بـەپیرۆز دانا.

ئەو کۆڕانە مافی دانان و حەرامکردنیان دا بە کڵێسا و بڕیاری پاکی پاپا و مەعصوم بوونیان داو مەعـصومیەکەی ئـەویش مـافی پێـدەدات بیـسڕێتەوە و یاسـا دابنـێ، ئـەو ئینجیلانەش وا بنووسێتەوە کـە مەسـیح لـەخاچ دراوە (قورئـان نکـۆڵی لـەوە دەکـات) خۆیشی بێئاگا بکات لە موژدەدان بـە موحەممـەد (ﷺ) (کـە قورئـان بڕیـاری ئـەوەی

داوە ئەو ئینجیلە موژدەی پێبووە) پاپا ڕێی دا بەوەی ئینجیلەکان بەشێوەیەك لە شێوەکان باسی خوایەتی مەسیح بکەن کە قورئان نکوڵی لەمەش دەکات.

خاچی مەسیح لای مەسیحیەکان پەیوەستە بە بیروباوەڕی ڕزگاربوون. ئەوەش واتە مەسیح بە سیفەتی خوداوەندی هاتووەتە سەر زەوی تا بەو خاچە سزا بچەژێ تا مرۆڤایەتی لەو تاوانە بۆماوەییە یەکەمیە بسڕێتەوە کە ئادەم لە بەهەشت دا بەرامبەر خوا نواندی. قورئانیش ئەو بڕیارەی داوە ﴿وَلاَ تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى﴾ ئینجیلی بەرنابا بە تەنها لەو خاڵانەدا لەگەڵ بیروباوەڕی ئیسلام دا دەگونجێ، ئینجیلی بەرنابا باسی بەرزکردنەوەی مەسیح دەکات بۆ ئەوەی لەخاچ بدرێ و یەهوزاش لە دەربڕین و ڕوخساردا دەستەوسان بووەو شێوەی لە یەسوع چووە، لە ئینجیلی بەرنابا دا سیفەتی پێغەمبەر (ﷺ) چەندین جار باس کراوە کە دەگاتە پانزە جار باسکردن. ئەو ئەفسانەشی ڕوون کردووەتەوە کە دەڵێت مەسیح کوڕی خوایە و ئەوانەش بەرپەرچی خەتەنە کردن دەدەنەوە. بەڵکو جەخت دەکاتەوە لەسەر سوننەتی خەتەنە کردن و دەڵێ خەتەنە کردنی مەسیح دوای هەشت ڕۆژەی تەمەنی ڕویداوە. جەخت دەکاتەوە لە پیسی خەتەنە نەکراو. بەرنابای خاوەنی ئەو ئینجیلە یەکێکە لە حەواریە هەوادارەکانی مەسیح لە پێشەکیەکەیدا ڕایدەگەیەنێت پۆلس بە تەنها ڕێنمایی پێچەوانەی ئەوەی هەبووە کە حەواریەکان لە مەسیحیان وەرگرتووە. بەڵام ڕێنماییەکانی پۆلس بڵاوبوونەتەوەو زاڵ بوون بەسەر بیروباوەڕی مەسیحیەت دا. ئینسکلۆپیدیای فەرەنسی پێی وایە ئینجیلی مرقس و ئینجیلی یوحەننا دانراوی پۆلس.

# باسی دووەم

## ( لایەنە جیاوازەکانی نێوان مەسیحیەت و ئیسلام )

پەیامی ئیسلام خۆی لە چەند ئاینێکی ناوچەییدا دەنوێنێ بۆ هۆزەکانیان. پەیامی موسا (علیەالسلام) بۆ بەنی ئیسرائیل بوو بە بوونی کتێبی یەکەمیەوە (تەورات) دواتر پەیامەکانی ئاسمان بۆ بەنی ئیسرائیل هاتن تا بە پەیامی عیسا (علی السلام) کۆتایی پێهات بە هاتنی کتێبی کۆتایی (ئینجیل) هەموو کتێبەکانی ئاسمان ئەو پەیامە کۆتاییە دێنن کە بەڵێن لە هەموو پێغەمبەران وەرگیراوە بیگەیەنن و بڵاوی بکەنەوە. ئەوەش پەیامی موحەممەدە (ﷺ).

ئەمەش لەوەدا بەڕوونی دەردەکەوێت کە لە ئیصحاحی یەکەمی ئینجیلی یووحەنا و ١٧ ئینجیلی مەتادا هاتووە ئەوان چاوەڕێی سێ شت بوون: ئیلیا و مەسیح و پێغەمبەر. ئەوەش کە یەکەمجار دێ ئیلیا دواتر مەسیح دواتر پێغەمبەرە. ئەوەی سەید مەسیح وتوویەتی سەبارەت بە بوونی (معزی) کۆتایی لەدوای خۆی (بەرزی ڕادەگرێ و شایەتی بۆ دەدات و چی دەڵێ بیری خەڵکی دەخاتەوە و چەندین شتیان فێردەکات و بانگیان دەکات بۆلای هەموو حەقێ) ئەمەش بەسەر گەورەمان موحەممەددا جێبەجێ دەبێ.

لە ئینجیلی بەرنابادا دەقێکی ڕاشکاوانە بەو واتابە هاتووە و دەڵێت: (خوا ڕەحم بە جیهان دەکات و ئەو پێغەمبەرەی خۆی دەنێرێ کە مێزەرێکی سپی لەسەر سەری دەوەستێ و یەکێ لە هەڵبژێردراوانی خوا دەیناسێ و بۆ هەموو جیهان نیشانی دەدات و هێزێکی گەورە دێنێ بەسەر خراپەکاران و نێوان بتپەرستان دا. بەهێز دێتە باشوور و بتەکان و بتپەرستان تەفرو تونا دەکات، وتیان ئەی مامۆستا ئەو پیاوەی تۆ باسی دەکەیت دێت بۆلای جیهان دەبێ کێ بێ؟ یەسوع بە دڵخۆشیەوە وەڵامی دایەوە ئەوە

موحەممەدی پێغەمبەری خوایە و هەر کە هات بۆ جیهان دەبێتە چێنەری کاری چاکە لە نێوان مرۆڤ دا بەو سۆزە زۆرەی کە پێیەتی وەك چۆن باران بەزەوی دەکات بەرهەم دەبەخشێ دوای ماوەیەك لە نەبوونی باران ئەو هەورێکی سپیە کە بەڕەحمەتی خوا پڕبووە و ڕەحمەتێکە خوا دایدەبارێنێتە سەر باوەڕداران وەك غەیب. وتیان بۆچی مژدە دەدەیت بە مامۆستایەکی نوێ و خۆت بە پایەدارتر لە مسیا دادەنێیت؟ سەید مەسیح وتی: من بە هاوشانی ئەوە نازانم کە ئێوە دەیڵێن، چونکە من شیاو نیم پەتێکی جرموق یان قایشی نەعلی ئەو پێغەمبەرە بم کە ئێوە پێی دەڵێن مسیا کە لەپێش من دروست کراوە و دوای من دێ و قسەی حەق دێنێ و ئاینەکەی کۆتایی نیە و ڕزگاری و ڕەحمەت بۆ ئەو گەلانەی سەر زەوی دێنێ کە فێرکاریەکەی وەردەگرن. چونکە خوا وا بەڵێنی داوە بە ئیبراهیم، بڕوام پێبکەن چونکە من حەقتان پێ دەڵێم بەڵێن بۆ ئیسماعیل دروست کراوە نەك بۆ ئیسحاق. من هاتوم تا پێخۆشکەری بکەم بۆ ئەو پێغەمبەرەی خوا کە بە ڕزگاری جیهانەوە دێ، بەڵام وریابن نەخڵەتێن چونکە دوای من پێغەمبەرانێکی درۆزنی زۆر دێن کە قسەی من دەبەن و ئینجیلەکەم دەشێوێنن. ئەو پێغەمبەرە لە سەردەمی ئێوەدا نایەت، بەڵکو بە چەندین ساڵ دوای ئێوە دێ کاتێ ئینجیلی من لەکار دەکەوێ و لەوانەیە لەو کاتەدا سی باوەڕدار نەبن).

ئەمە ئەو وێنەیەیە کە سەرە ئاینیەکان دایانشاردووە و لەکاریان خستووە تا مەسیحیەت بکەنە ئاینێکی جیهانی لەبری ئەوەی کۆتایی پەیامی بەنو ئیسرائیل و مژدەدەری پەیامی کۆتایی موحەممەد (ﷺ) بێ. لێرەوە ڕێگەکە جیا بوویەوە و دەرکەوت لەنێوان ئیسلام دا (کە بە قورئانەوە هاتووە بەو دەقە دڵنیایەی کە ساختەی تیا نیە و خوا پاراستویەتی) و نێوان جولەکایەتی و مەسیحیەت دا چەندین جیاوازی و ناکۆکی هەن ئەگەر ئەڵقەکانی نێوان ئاینەکانی پێش ئیسلام بەڕێی ڕاستی خۆیان دا بچوونایە دەگەیشتنە ئەو چەمکە دروستە خواییەی کە فیترەت قبوڵی دەکات، بەڵام

کاتێ ئەو ناکۆکیە ڕوویدا جولەکایەتی و مەسیحیەت لەوپەڕی لارێبوونەوە بەرەو ڕەگەزو هەوڵی خۆ گەورە دانانی ڕەگەزی گۆڕا. بانگەوازی موحەممەد (ﷺ) گەڕایەوە تا جارێکی تر پەیوەستی بنەڕەتە چەسپاوەکە بێ (ئاینی ئیبراهیم = حەنیفیەتی دروستو نەوازشی) وەك لە قورئاندا هاتووە ﴿ثُمَّ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ أَنِ اتَّبِعْ مِلَّةَ إِبْرَاهِيمَ حَنِيفاً﴾.

ئەو ناکۆکیانەی تەواو ڕێی ئاینی خواییان وەستاند و کاریگەری قوڵیان هەبوو لە بزاڤی زانست و فەلسەفەکان و چەمکەکانی کۆمەڵگەو ژیارەکان بەو جۆرەی کۆمەڵگە ڕۆژئاواییەکان و ژیاری ڕۆژئاوایی لارێبوون بەرەو لای. بەوە هاواری ئاشکراکردنی گەندەڵیەکەی لەلایەن بیریارانێکی گەورەوە بەدرێژایی سەدەکان هەبووە هەر لە برناردشۆ و خالید شلدریك و لۆرد هدلی یەوە. بەم زوانەش تیان دینیە و لیوپۆلد فایس، دواتر گارودی و بۆکای و مۆریسۆن. قورئانلا پیرۆز ئەمانەی لەسەر ئەهلی کیتات تۆمار کردووە:

یەکەم: لاڕێکردنی بیروباوەڕو بڕینی پەیامی موساو عیسا (علیهما السلام) لەو ڕەوتە ئاینیە خواییەی هەبوو و کردنی بە بانگەوازێکی ڕەگەزی کە مەبەست لێی خۆ بێئاگا کردن و داننەنان بوو بە ئاینی کۆتادا.

دووەم: دەستکاری کردنی تەورات و ئینجیل و لابردنی هەرچیەك کە پەیوەندی هەبوو بە پێغەمبەرایەتی کۆتا پێغەمبەرەوە.

سێیەم: جیاکردنەوەی پەیامی مەسیح لە ڕەوتی خۆی لەناو ئاینەکانی بەنی ئیسرائیل و بانگەشەی ئەوەی مەسیحیەت ئاینێکی جیهانیە.

چوارەم: خستنە ڕووی چەندین بیردۆزەیەك کە ئاینە بتپەرستیە کۆنەکان هێناویانو لە قسەی پێغەمبەران دا نەبوون وەك بانگەوازی خواوەندی تایبەت (یەهوە) لای جولەکە و بانگەوازی بەڵێنی خوا بۆ ئیبراهیم کە بەڵێنی بە ئیسحاق و

یەعقوب نەك ئیسماعیل داوە، دواتر بانگەوازی خاچ و سیانە خودایی و تاوان و هەڵە لە مەسیحیەتدا.

**پێنجەم:** نیسبەتی ئایین لای جولەکە بۆ نەتەوەیە و لە مەسیحیەت دا بۆ کەسێتی پێغەمبەرە.

**شەشەم:** دەرکەوتنی چەمك و واتای ڕەهبانیەت و دەست بەردان لە دنیا.

ئەو گۆڕانانەو چەندێکی تریش کە جولەکەو مەسیحیەتیان لە ڕێی ئاسایی خۆی دەرکرد لە زنجیرەی ئاینەکان وەك ئاینگەلی بەنی ئیسرائیل و بەس کاتێ گوازرانەوە بۆ کۆمەڵگەی ڕۆمانی بتپەرستی لەگەڵ چەمکەکانی دا تێکەڵ بوو و ململانێیەکی سەختی لە قەوارەی دەروونی دا هێنایە کایە. مەترسیدارترینیان تاوان بوو کە مرۆڤی ڕۆژئاوایی خستە ئەو بڕوایەی مرۆڤ لە مەسیحیەت دا لە لەدایك بوون و فیترەتەوە تاوانبارە و تاوانی فیتری لەسەر شانە و لەژێریدا دەناڵێنێ سەرەڕای بانگەوازی بۆ بڕوابوون پێش گەڕان و بیرکردنەوە (بڕوا بێنە دواتر بیربکەرەوە). ئیسلام هات تا ئەو هەڵانە ڕاست بکاتەوە و دیدی ڕاستی مرۆڤ بۆ مرۆڤ بخاتە ڕوو سەبارەت بە پەیوەندی لەگەڵ خواو لەگەڵ ژیان دا، چۆن مافی ویستی تایبەتی خۆی و بەرپرسیارێتی تاکەکەسی هەیە کە لەسەری لێپێچینەوەی لەگەڵ دەکرێ، بۆیە ئیسلام نکوڵی دەکرد لە مەسەلەی شێوە نوێنی (تجسید)ی مەسیحی و مەسەلەی خوای تایبەتی جولەکە و مەسەلەی سیانە خودایی و هەڵەو تاوان و خاچ و مەسەلە ئەفسانەیی و خورافاتیەکان و پەرستشی هەسارەو میراتی باتینی و هەجوسی و فەلسەفەی یۆنانی، هەروەك گەورەترین پایەی ژیاری بتپەرستی تێکشکاند کە مەسەلەی کۆیلایەتی بوو. ئەوەشی بەرپەرچ دایەوە کە لە ژیاری فارس و ڕۆم و فیرعەون و هیندەکان دا هەبوو و باسی گەورەیەکیان دەکرد لە لوتکە بێ و کۆیلەش مافی نەبێ، ئیسلام کۆیلایەتی مرۆڤی بۆ مرۆڤ لەکار خست و کۆیلایەتی مرۆڤیش بۆ بتەکان نەهێشت. پێغەمبەر (ﷺ) یاسای یەکلاکەرەوەی خۆی

ڕاگەیاند (بڕوا مەکەن بە ئەهلی کیتاب و بەدرۆشیان مەخەنەوە. بڵێن بڕوامان هێناوە بە خواو ئەوەی دابەزیوە بۆ ئێمە و ئەوەش دابەزیوە بۆ ئێوە. پرسیار لە ئەهلی کیتاب مەکەن سەبارەت بە شتێ چونکە ئەوان هەرگیز ڕێنموویتان ناکەن و خۆیان گومڕابوون. ئێوە وا بکەن یان بڕوا بە پوچی دێنن یان ڕاستیەك بەدرۆ دەخەنەوە، سوێند بەخوا ئەگەر موسا لەناویان دا زیندوو بووایە هیچی بۆ ڕەوا نەبوو ئەوەنەبێ شوێن من بکەوێ، ئەگەر موسا و عیسا زیندوو بوونایە هیچیان پێ نەدەکرا جگە لە شوێنکەوتنی من).

کاتێ چەمك و واتای جولەکەو مەسیحیەتمان بۆ مەسەلەی ژیانی دنیا زانی بینیمان لە یەك خاڵ دا بەیەك دەگەن (بەپێی دەربڕینی دکتۆر کەمال جەعفەر) ئەویش ئەوەیە ژیان یەکپارچە بۆ ئەوەیە جەخت بکاتەوە لە مەلەکوتی خواو دەسەڵاتی هیچ شتێ لە دیدی ئیسلام دا بەرەخنە ناگیرێ لەمە. بەڵام ڕەخنەکە لەسەر ڕاڤەی ئەو ڕوانینەیە، لە ڕوانینی جولەکە دا مەملەکەتی خوا مەملەکەتی گەلی جولەکەیە بەتەنها فەزڵ و چاکەی خوای بۆ خۆی بردووە و لەسەر زەوی دا بە تەنها خوا تەمکین و دەسەڵاتی پێداوەو بەتەنها ئەویش هێزو دەسەڵاتی خوا دەنوێن، جا مەبەست لە ژیان لە دیدی ئەوان دا ئەوەیە ئەو مەملەکەتەی خوای گەورە تیایدا پاشا دیاری دەکات ئەوان شتێ لە خوا داوادەکەن لەپێناو ئەوەیدا شتێ بکەن بکەن بۆ خوا، جێی سەرسوڕمانە کتێبەکەیان بانگەشەی ئەوە دەکات ئاسمانیە کەچی یەکجارەکی دوورە لە بیرۆکەی ڕۆژی دوایی.

سەبارەت بە مەلەکوت لە مەسیحیەت دا لەبری ئەوەی تایبەت بێ بە گەلی جولەکە هەندێ شتی فراوان کردووە و هەندێ کەسی لێ دەرکردووە و بە مەملەکەتی خوا ناسراوە، ئەوە ئەو جیهانەیە کە تیایدا ڕوداوێکی سەرەکی ڕەگی داکوتاوە ئەویش حلولی لاهوتە لە مەسیح دا. پێش ئەمە بە پێشەکی و ئامادەسازی دادەنرێ و هەر

کەسێ بەشداری خوێنی نەسرانی بێ بە بەشداری بۆنە ئاینیەکان ئینجا لە ڕۆژی دواییدا بەو مەلەکوتە دەگات.

ئیسلام چەمك و واتایەکی تەواو جیای هەیە و چۆن خوای گەورە ژیان و مردنی دروست کردووە تا تاقیمان بکاتەوە کاممان کارمان چاکترە تاقیمان دەکاتەوە بە چاکە و بە خراپە و دەگەڕێینەوە بۆلای خۆی و جێی تاقیکردنەوەین و قورئان ئاماژەی داوە بە ڕاستیەکی گەورە کە بەڵێنە، ئەو بەڵێنەی لە ئادەمیزاد وەرگیرا ﴿وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِن بَنِي آدَمَ مِن ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَأَشْهَدَهُمْ عَلَى أَنفُسِهِمْ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ قَالُواْ بَلَى﴾ لە ئیسلام دا هیچ ڕەشبینی و بێ هیواییەك نیە. ژیان تێپەڕین و پەڕینەوەیە، ئیسلامیش ژیانی دنیای وەلا نەناوە.

هەروەك ئیسلام چەمکێکی دروست و ساغی بۆ ژیان پێشکەش کردووە و دەرفەتی هەموو خۆشیەکی ژیانی پەیی چەند ڕێکخستنێکی دیاری کراو بە مرۆڤ داوە، ئەوەش بۆ پاراستنی خۆی و کۆمەڵگەو بەپێی نێوەندگیری نێوان زوهد و خۆشی و عەقڵ و دڵ. دژی دەسەڵاتی سەرە ئاینەکانە و ڕایگەیاندووە شتێکی نیە بەناوی پیاوی ئاینی. بۆ دەستەیەکی خەڵك نیە مافی دەسەڵاتداری ببەن. لە ئیسلام دا نهێنیەك نیە هەموو کەس نەیزانێ و کەسێ جیا لە خەڵك بیزانێ، لە نێوان مرۆڤ و خواش دا میانگەرێك نیە. ئیسلام دژی جادووی نادیار (کەهانە)یە پێغەمبەر (ﷺ) ڕێی نەداوە بە هاوەڵەکانی جیا بکرێنەوە ﴿قُلْ إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَى إِلَيَّ﴾ ئەرکی پێغەمبەر زانینی غەیب نیە ﴿إِنَّمَا الْغَيْبُ لِلَّهِ﴾ قورئانیش بەرهەمی ئەو نیە چونکە ئەو واتاو دەقی وەرگرتووە. کاتێ ڕۆژی مردنی ئیبراهیمی کوڕی خۆرگیرا ئەوەی خستە ڕوو خۆر و مانگ نیشانەی خوان و بەمردن و لەدایکبوونی هیچ کەسێ ناگیرێن.

ئیسلام جیایی خوای لە بوون ڕاگەیاندووە و خوا لەناو گەردوون و بوون دا نیە وەك بەرپەرچدانەوەی بانگەوازی حلول و وەحدەتولوجود. هەروەها ئیسلام چەمکی

چەسپاو گۆڕاوی ڕاگەیاندووە و دەڵێ چەسپاوی بەها بنەڕەتییەکان و لەوانەش دا ئەخلاق هەیە. کۆیلایەتی لەکار خست و مافی دا بە ئافرەت. دەمارگیری خێڵایەتی لەکار خست و پەیوەندی نێوان جیهانی غەیب و بینراوی ڕاگەیاند و وتی خوا پەروەردگاری هەموو جیهانیانە و بانگەوازی موحەممەدیش جیهانییە. خوا فرۆشتنی حەڵاڵ کردووەو سووی حەرام کردووە و داوا دەکات لاواز و هەژاران بپارێزرێن، زەکاتی بە مافێکی دیاری کراوی نەدارو بێبەشان داناوە و بانگەواز دەکات بۆ پاکیەکانی ڕزق و ڕۆزی و دادپەروەری و یەکبوونی مرۆڤایەتی و ئازادی ژیرانەی فیکری، ئیسلام ئازادی بەخشیووە بە زانایان تا لە دانانی حوکمەکان دا بەپێی هێڵە سەرەکیەکانی شەریعەت ئیجتیهاد بکەن لە شتێکدا کە هیچ دەقێکی لەسەر نیە. کەسی موسڵمان بڕوای هەیە بە کتێب و پێغەمبەر و فریشتەکانی خواو ڕۆژی دوایی ئیسلام ڕێزی گەورەمان عیساو مەریەمی دایکی گرتووە و پڕوپاگەندەی جولەکە لەدژ ئەو دوانە بەرپەرچ دەداتەوە. ئیسلام دەڵێ عیسا پێغەمبەری نێردراوەو لە ئاینیش دا هیچ زۆر کردنێ نیە ﴿فَمَن شَاء فَلْيُؤْمِن وَمَن شَاء فَلْيَكْفُرْ﴾.

مافی ئەهلی زیممەی لە هەموو مافەکانی کۆمەڵگەی موسڵمانان دا ڕادەگەیەنێت و مافی پەرستش و پاراستنی کڵێسا و پەرستگای خۆیانیان هەیە. ئیسلام دان دەنێ بە ئاینی یەکەمجار دابەزیویان دا. هەروەها خواردنی ئەهلی کیتاب بۆ موسڵمانان بە حەڵاڵ دادەنێت.

مامۆستا یەعقوب ریمون ناکۆکیە ڕیشەییەکانی نێوان ئیسلام و مەسیحیەت نیشان دەدات:

یەکەم: مەسیحیەت لەو کاتەیدا دان دەنێ بە هەموو پێغەمبەرانی پێشوودا عیسا لە پێغەمبەرایەتی دادەڕنێ و بەرزی دەکاتەوە بۆ پلەی خوایەتی وەك چۆن نکۆڵی دەکات لە پێغەمبەرایەتی موحەممەد.

دووەم: مەسیحیەت بانگەواز دەکات بۆ ئەو بیردۆزەی دەڵێت عیسا کوڕی خوایەو بەشێکە لە سیانە خودایی پیرۆز و بەوەش عیسا لە دیندی ئەوان دا خواوەند و کوڕی خواوەندیشە، ئەمەش تێگەیشتنی سەختە. هەروەك ئەو بیردۆزەیە لەگەڵ ڕێنماییەکاندا ناگونجێ کە موسا و ئیبراهیم بانگەوازیان بۆ کردون. ئەوان خەڵکیان فێری ئەوە کرد یەك خوا بپەرستن و هیچ هاوەڵێکی بۆ دانەنێن.

سێیەم: مەسیحیەت کڵێسا دەکاتە میانگەرای نێوان خەڵك و پەروەردگاریان و دەڵێت چی تاوان هەیە بیکە کڵێسا لێت خۆش دەبێت و زامنە بۆ ڕزگاریت. لێرەوە لە دیدی مەسیحیەت دا خالق ئازادنیە چی بکات. بەڵکو هەر دەبێ کڵێسا لەڕۆژی دوایی دا ڕێبەری بکات. لە ئیسلام دا ڕاست کردنەوەی ئەو بیرۆکەیە هەیە کە خوای گەورەی بێ هاوەڵ بۆی ڕوون کردووەتەوە. لەڕۆژی دوایی دا خوای گەورە حوکمی کارەکان دەدات بەپێی دەستکەوتی خەڵك لە دنیادا بە نێرو مێیانەوە بێ ئەوەی لە هیچ لایەکەوە دەست تێوەردان یان قەڵەمڕەوی هەبێت.

# باسی سێیەم

## (بیری ڕۆژئاوایی لە لاهوتەوە بۆ زانستەکان)

گۆڕانی بیری ڕۆژئـاوایی لـە فەلـسەفەی مەسـیحی جولەکـە (یۆنـانی ڕۆمانیـەوە) بـۆ زانـستەکان دوای دەرکـەوتنی چـەمك و واتـای ئـەو زانـستە ئەزموونیـە ڕوویـدا کـە موسڵمانان دایانهێناو هۆکارێکی گرنگی پێکدادان و تێکـەڵ بـوون و ئـەو لێکهەڵوەشـانە بوو کە دواتر توشی ڕۆژئاوا بوو، گەورەترین کاریٚ ڕۆژئاوا ئەنجامی دا بریتی بوو لە:

یەکەم: جیاکاری نێوان بیردۆزە و پەیڕەو.

دووەم: جیاکاری نێوان زانستی سروشتی و پێناوی خوایی.

سێیەم: جیاکاری نێوان زانست و ئەخلاق.

چوارەم: جیاکاری نێوان ئاین و کۆمەڵگە.

هەموو ئەمەش لە قۆناغێکی پێش سەردەمی ڕێنیسانس دا بوو. سەرەتا بـە ڕاسـتی دەستی پێکرد لەڕێی گواستنەوەی چەمکی بەرنامـەی ئـەزموونی ئیـسلامی بـۆ ڕۆژئـاوا جیا لە بنەماکانی لە دیدی خوایی بۆ خەلق و کۆمەڵگە و ژیار، دواتریش جیـا لـە دیـدی ئـەخلاقی و بەرپرسـیارێتی تاکەکەسـی و پاداشـتی دواڕۆژ. ئـەم جیاکاریـەی نێـوان زانستو چەمك و واتـای دیـدی خـوایی لـە ئـەنجامی ئـەو ناکۆکیـە دا بـوو کـە لـەنێوان کڵێساو زانایانی ئەزموون دا ڕوویـدا و گەیـشتە قۆنـاغێکی مەتریـسدار و بـە لـەناوبردنی یەکجارەکی پەیوەندی نێوان زانست و ئاین کۆتایی پێهات، دواتر بـەرەو لایەنەکـەی تـر چوو کـە بنیادنـانی دیدێکی فەلـسەفی بـوو بـۆ پەیوەندیـەکانی کۆمەڵگـە کـە چـەمکی فەلسەفەی ماددی و بیروباوەڕ و سەرمایەداری و ئیشتراکیەکانی لێکەوتەوە.

ئەو ڕۆڵەی زانایانی ئیسلام لە دانـانی بـەردی بناغـەی بنیـاد زانـستی ئـەزموونی لـە هەموو جیهان دا هەیان بوو لەبەرچاوی کەس دا شاراوە نیە هەرچەندە هەندیٚ نـەیاری

ئیسلام بانگەشەی پوچی خۆیان دەڵێنەوە بەوەی نکوڵی دەکەن لەو ڕۆڵە کاراو دیارە بەو بانگەشەی موسڵمانان تەنها ککلتوری یۆنانیان گواستوەتەوە بۆ زمانی عەرەبی. ئەم مەسەلەش چەندین زانای بەویژدان یەکلایان کردووەتەوە وەك درابەر و سارتۆن و هۆنکە و دەیان زانای تر، جۆرج سارتۆن لە کتێبەکەیدا (مێژووی زانستەکان) ماوەی سێ سەد و پەنجا ساڵی بەردەوامی موسڵمانانی لە ٧٥٠-١١٠٠ز. هێناوە کە تیایدا ناوی جابری کوڕی حەیان و خوارزمی و رازی و مەسعودی و بەیرونی و ئیبن سینا و ئیبن هەیسەم دەردەکەوێ. دوای ساڵی ١١٠٠ز. یەکەم ناوە ڕۆژئاواییەکان دەردەکەون، بەڵام لە ماوەی دوو سەدە و نیودا شەرەفی زانستی لە ڕۆژئاوادا بوو بە هاوبەشەکی لەگەڵ زانایانێکی موسڵمان دا. بەخششی زانستی موسڵمانان لە بەشە جیاجیکان دا بوو:

١- زانستی بیرکاری (خۆی لە خۆی دا زانستێکی بێباکەو ژمارەکان لەپێش هەموشیانەوە سفر لە نێوەندی ئەو زانستەدان).

یەکەم کەس ژمارەی بەکارهێنا و واتای بە سفر بەخشی خوارزمی بوو، ئەو دەستکەوتەش تا ئەمڕۆ بەسودو بەردەوامە تا ئەوەی ژمێریاری ئەلیکترۆنی پشت بە دوو ژمارە دەبەستێت بۆ بەجێهێنانی کاری ئەوانیش سفر و یەکن.

٢- زانستی جەبر کە ئەویش پەیوەستی خوارزمیەو پێش ئەوەش هەڵوەشانێکی تاك بوو بۆ چەند مەسەلەیەکی دیاری کراو.

٣- زانستی سێگۆشەکان: عەرەب بەم شێوەی ئێستای زانیویەتی. یۆنانیەکان شتێکیان لێ دەزانی. کتێبی (النقوصی) تا سەدەی حەڤدەهەمیش سەرچاوەیەکی گرنگ بوو.

٤- گەردووناسی کە موسڵمانان پێش گالیلۆ چەندین لێکۆڵینەوەیان لەسەر ئەنجام داوە.

٥- زانستی کیمیا (جابری کوڕی حەییان): ئەزموون و بینین و ئەنجامگیری.

٦- زانستی سروشت و بینراوەکان (حەسەنی کوڕی هەیسەم) کتێبەکەی (المنارة) لە ناودارترین ئەو کتێبانە بوو کە لە ئەورووپا ناسراون و ئەویش سروشتی تیشکی ڕاست کردەوەو چۆنێتی چالاکی و کاری بینینی ڕوون کردەوە.

٧- زانستی پزیشکی: ئەورووپیەکان یەکدەنگن لەسەر پێشڕەوی موسڵمانان لە پزیشکیدا.

مامۆستا عەبدولمەقسود حەبیب دەڵێت موسڵمانان لەڕێی وەرگرتنەوە یان بۆ مشتومڕو بەدواداچوون و لێکۆڵینەوە زانستیان وەرنەگرتووە، چونکە ئەوان پشتیان بەستبوو بە مەوزوعیەت و وردەکاری زانستی، بۆیە ڕەخنەیان دەگرت لە زانستی یەکەمیەکان و تێکیان دەشکاندن و هەڵەکانیان ڕاست دەکردنەوە و ڕەخنەیان دەگرت لە نوسینەکانی ئەرستۆ و بەتیلمۆس و کەسانی تر و زیادەکاری و تێبینیان لەسەری هەبوو. واقیعیەتی زانستی پاڵنەریان بوو بۆ ئەوە. لە زانستی گەردوون دا چەند بنەمایەکی نوێیان دانان جیا لەوەی پێش خۆیان و زیاتر گرنگی دەدرا بە بینین (مرصد) و گەشەیان دەدا بە دەزگاکانی و خشتەی حساباتە گەردوونیەکانی. ئەو خشتانە لەلایەن ڕۆژئاواوە برانە ناو مرصادەکانیانەوە. گرنگترینیان خشتەی خوارزمی‌و بەتانی و ئیبن یونس. یەکێ لە جەمسەرەکانی زانستی ئەورووپی دان بەوەدا دەنێ و دەڵێت (زانستی گەردوون (ئەستێرەناسی) لە بەغداد لە کۆتایی سەدەی دەیەم دا گەیشتبووە لوتکەی هەوڵی مرۆڤ لە بەدواداچوونی هەسارە و ئەستێرەکان بەچاوی موجەررەد).

ئەبولعەبباس ئەحمەدی فەرغانی نوسەری کتێبی (الكامل في الاسطرلاب و جوامع علم النجوم) چەند پێوانیەکی بەدرێژایی هێڵی ڕاستی زەوی ئەنجامدان. یەکەم کەس ئەو بوو زانی ڕێڕەوی خۆرو هەسارەکان بە بەردەوامی بە ئاراستەیەکی پێچەوانە

دەڕوات. لەسەر دەستی ئەو چەند خوێندکارێکی تری بـواری گـەردوون پێگەیشتن کـە چەندین بەرەو پێشچوونیان لەو بوارەدا پێشکەش کرد.

ئیبنولهەیـسەم چـەند ڕێگەیـەکی نـوێی هێنایـە مەیـدان بـۆ پێوانـەی خـستنەڕووی شوێنەکان هەر لەو بیردۆزە ناودارەیەوە کە لە بواری زانستی تیشکدانەوە دا دێت. ئـەو بوو بە مامۆستای ڕۆژئـاوا لـە سـەدەکانی ناوەڕاسـت دا دوای ئـەوەی کتێبەکـەی (علم المناظر) وەرگێڕدرایە سەر زمانی لاتینی و تیایـدا بـیردۆزەی جوڵـەی هەسـارەکان لـە چینەکانی کەش و هەوادا کە چینی نـەبینراون هەیـە. لەسـەر ئـەو بیردۆزەیـە زانایـانی ڕۆژئاوایی گەردوون کەوتنە کار (ڕۆجەر بیکۆن ١٤٩٤ز. لیونـارد دافنـشی ١٥١٩، گـالیلۆ ١٦٤٢) ئەمانە بە دامەزرێنەرانی لێکۆڵینەوەی نوێی زانستی دادەنرێن.

ئیبنولهەیسەم یەکەم کەس بوو لەڕێی جۆرێ ئامێری کونکردنـەوە کـە لـە ڕاسـتی دا وێنەیەکی ئامێری وێنەگرتن بوو بۆ دواتر چەند ئـەزموونێکی ئەنجامـدان. ئـەو خـاوەنی زانستی سوننەتە کائینیەکان بوون و مامۆستاکانی وەك زانایەکی ئەزموونکار سەبارەت بـە ڕێـرەوی خـۆر ڕایـان چەسـپاند و بیردۆزەکانیـشی لـە فیزیـا و بەرچـاویەکان دا تـا ئەمڕۆش زاڵن بەسەر زانستەکانی ڕۆژئاوادا.

بەردەوام ئەو مەسـەلە بیرکاریـە سروشـتیەی ئیبنولهەیـسەم شـیکارەکەی دانـاو بـە مەسەلەی هەیسەمی ناسرا تـا ئـەمڕۆش لـە زانـستی ڕۆژئـاوادا بەردەوامـە، بـەو جـۆرە دەبیـنین بـیردۆزە و ئامێرەکـانی موسـڵمانان و ئـەو دۆزینەوانـەی پێـی گەیـشتن و ڕەخنەیان لە بیردۆزەکانی پێش خۆیان گەورەترین کاریگەری و چاکەی هـەبوو بەسـەر ژیاری نوێی ئەوروپیدا.

دەکرێ بڵـێین بەخششەکانی زانـستی ئـەزموونی ئیـسلامی بـەرەو ڕووی ئـەو بـارە بوویەوە:

**یەکەم:** بیردۆزەی ئەرستۆ دارماو ئەورووپای لە تێڕامانی ڕوانینەوە بەرەو ئەزموونگەری برد.

**دووەم:** ئەورووپای لە سەردەمی ڕەهبانیەتەوە بەرەو سەردەمی بیناسازی برد بەهۆی ئاراستە کردنی قورئانەوە.

**سێیەم:** ئەورووپا ڕاشکاوانە ڕۆڵی موسڵمانان ڕادەگەیەنێت و گەمەی پێ دەکردو هەوڵی دەدا نکوڵی لێ بکات و هەموو ئەو بەرهەمە زانستیە بە بێدەنگی و چاو داخستن بەڕێ بکات جگە لە ژمارەیەکی کەمی نوسەرانی بەویژدان لەماوەی زیاتر لە سێ سەدەدا.

**چوارەم:** ئەورووپا لە ڕێبازی ئیسلام لە زانست دا گۆڕا بۆ ڕێبازی یۆنانی کۆن بەوەی بەخششەکانی زانستی لەنێوەندی چەمکی بەرزڕاگری دەمارگیری ئەورووپی و ڕۆمانی کۆن دا دابنێ و هەوڵ بدات خۆی لەو دیدە ڕاستە ئازاد بکات کە زانست زانست بۆ خزمەتی هەموو خەڵکە و دەبێ ئەوەش ئەخلاقی بێت. بیرۆکەی سروشتی دانا تا لەبری وشە دروستکەری حەقیقی دابنێ کە ئەویش خوای گەورەیە. لایەنی خوایی بەتەواوەتی لابردو شانوشکۆی لایەنی ماددی ڕاگەیاند و وا سەیری جیهانی دەکرد کە کۆن بێت و پێچەوانەبوونێکی تەواوی بۆ چەمکی دروستی ئاین نیشان دا. ئەو چەمکەی کە بڕیار دەدات جیهان دروست کراوەو کۆتایشی پێ دێ. لە ئەنجامی ناکۆکی لەگەڵ کڵێسادا بیرۆکەی عەلمانیەت سەریهەڵدا کە بوویە هۆی ئەوەی بە یەکجارەکی ئاین کەنار بخات و زانست بەرز ڕاگرێ و هەوڵ بدات بانگەشەی ئەوە بکات کە دەتوانی ڕێبەری مرۆڤایەتی بکات. ئەگەر چی ئەو بیردۆزەیە تەواو شکا بەڵام ئەو زانستە ئەزموونیەی توانی بڕوا بێنێ بە خوا بەهۆی هێزی ملهوڕەو بتپەرستی و زیندووکەرەوانی بیری کۆنی مەجلوسی باتینیەوە (کەجولەکەن) فەلسەفە ماددیەکانی لێ لەدایك بوو کە هەوڵیان دەدا خۆیان بکەنە خاوەن هێزی زانست و پیرۆزی لە کاتێکدا

بەتەنها چەند سەپاندن و بیردۆزەیەكی مرۆیی بوون كە ڕاست و هەڵەشیان هەبوو. مەیدانی زانستە كۆمەڵایەتی و مرۆڤایەتیەكان مەترسیدارترین مەیدان بوون بۆ دەرچوون لە چەمكی دروستی زانست. ئەو چەمكەی كە ئیسلام پێی بوو.

چەندین لێكۆڵەر ئاماژەیان داوە بەو لاڕێبوونانەی پاڵنەری ڕێكردەی زانستی ناو ڕۆژئاوا بوون، لەوانە ئەو بیرۆكەی كە هەندێ زانا دایاننا و ناویان نا (بێلایەنی زانستی سروشتی) هەندێكیان دەڵێن هیچ پەیوەندیەك نیە لە نێوان زانستی سروشتی و ئاین و ئەخلاق دا، واتە هیچ كاریگەر نیە بە ئاین و ئەخلاق. هەندێكیش دەڵێن كە باسی ئابووری كرا باسی ئاین ناكرێ، مەسەلەی جیا كردنەوەی ئاین لە زانست و دواتر جیاكردنەوەی ئەخلاق لە زانست لەو هەوڵە مەترسیدارانە بوون كە بانگخوازانی ڕۆشنگەری جوولەكە بۆ هەوڵی لەناوبردنی چەمك و واتای پەیوەندی نێوان ڕۆحیەت و ماددیەت و بەرزكردنەوەی ئەوەی پێی دەوترێ عەقڵانیەت ئاڵاكەیان هەڵگرتبوو بە مەبەستی گەیشتن بە ملهوڕی و بێ ڕەوشتی.

ئەورووپا پێوەرەكانی ئیسلامی لە ڕێكخستنی زانست و ژیاردا بە یەكجار بەرپەرچ دایەوە. ئەو پێوەرانەی لەسەر بنەمای داننان بە چاكەی كەسانی تردا و ویژدانی دەروونی و ئاستی بەخششی زانستی خاوەنەكان و ئاراستەی زانست لەپێناو خزمەتی كۆمەڵگەدا وەستابوو نەك لەپێناو داڕماندنی كۆمەڵگەدا. هەروەها تا دەستكەوتەكانی زانست بۆ هەموو مرۆڤایەتی بن نەك بۆ دەستەیەك، چینە جیاجیاكانیش بتوانن لێی سودمەند بن لەوانەش پاراستنی هەژاران و نەخۆش و پیرو بەتەمەنەكان پێچەوانەی نەریتی چەسپاوی ڕۆژئاوا بۆ لەناوبردنی نەخۆش و بەكەم ڕوانینە پیرو پەككەوتە و بەرزتر دانانی ڕەگەزی سپی و دانانی بە ژیارسازان و بەرزڕاگرتنیان بەسەر گەلانی تردا بەتایبەت ئەو گەلە هەژار و كەم دەستانەی كە قودی قەڵەمڕەوی بیانی بیانوویەكی فەلسەفی بەخشی بۆ تاڵانكردنی سامانیان و داڕمانی ئابووریان.

ئەو گۆڕانە مەترسیدارە بەرهەمی ململانێی نێوان دەستكەوتەكانی زانست و چەمكەكانی ئاین بوو. ئەوەش گۆڕانێ بوو نەیتوانی هاوسەنگی یان تەبایی نێوان بنەڕەتە سەرەكیەكانی ئاین و چەمكەكانی زانست ڕابگرن. بەڵكو زانست وەك قەڵای بەرهەڵستكار بەرامبەر هەموو شتێ وەستا كە پەیوەست بێ بە ڕۆح و مەعنەویەت و غەیبەوە. چەمكی ماددیەت زاڵ بوو بەسەر زانستە سروشتیەكان دا دوو شتی مەترسیداری زۆر سەختی سەپاند. ئەزەلیەتی ماددە و وزە و دانەوە پاڵی هەر شتێ لە بوون دا بۆلای سروشت و یاساكانی و قبولكردنی بنەمای گەشەسەندنی ڕەهاو بنەمای ڕێژە بەوەی هەموو شتێ ڕێژەییە. گواستنەوەی چەمكی گەشەسەندن لە زانستە بیۆلۆجیەكانەوە بۆ زانستە كۆمەلایەتیەكان بەوە دانی نەدەنا بە چەمكی چەسپاوەكاندا. بەوە بیری ڕۆژئاوایی لەو چەمكە چەسپاوەوە كە ئەرستۆ هێنابووی گەیشتە چەمكی گۆڕانی بەردەوام و گەشەسەندنی بەردەوام كە داروین و سبنسەر و هیگل هێنایان.

بیرۆكەی بەرهەڵستكاری زانستی نوێ بەرامبەر بە ئاین وەرگیراو بوو لە چەمكی ئاینی مەسیحیەوە ئەوەش بیرۆكەیەك بوو لە ئەوروپا بلاوبوویەوە گوایە ئاین لەگەڵ زانست نایكرێ. بەرهەڵستی ئاینیش لە ئەوروپا لە بنەڕەت دا دژ بە مەسیحیەت بوو كە ئازادی بیرو كاری لە خەڵك زەوت كرد بوو. ململانێی نێوان مەسیحیەت و زانست ململانێیەكی خوێناوی بوو و ژمارەیەكی بێشوماری خەڵك بە تۆمەتی پاڵپشتی نەكردنی كلێسا بەرەو مەیدانەكانی سێدارەدان بەڕێكران. جۆن ولیەم درابەر لە كتێبەكەیدا (التأریخ النهضة الفكرية فی اوروبا دام) دەڵێت دادگاكانی پشكنینی كاسۆلیكی لە ماوەی ١٤٨١ تا ١٨٠٨ز. نزیكەی سێ سەد و چل هەزار كەسیان لەسێدارە دان كە لە نێویان دا سی ودوو هەزاریان بە تۆمەتی بیدعە و دەرچوون لە ڕێنماییەكانی كلێسا سوتێنراون. بەو جۆرە ئاین و زانست لە ئەوروپا پێكەوە نەدەگونجان. دوژمنانی

ئیسلامیش هەوڵیان دا ئەو بیرۆکەیە بگوازنەوە بۆ ئاسۆی ئیسلامی و وشەی ئاین لە دیدی مەسیحیەت و جولەکەوە گشتگیر بکەن بۆسەر ئیسلامیش. ئەم هەلە دزێوەش لە ئەنجامی وەرگێڕانی وشەی ئینگلیزی(Religion) بوو بۆ وشەی ئاین. بەڵام ئیسلام ئاینێك نیە بەو چەمکە لاهوتیە. بەڵکو بەرنامەی ژیانیشە کە مەسەلە ڕۆحی و ماددیەکانیش دەگرێتەوە، ئیسلام ئاینێك نیە تەنها مەسەلە ڕۆحی یان تەنها مەسەلە ماددیەکان لەخۆ بگرێ، بەڵکو گرنگی دەدات بە دنیا و دواڕۆژیش.

ڕۆژئاوایی و ماددیەکان و جولەکە و هاودەمانیان هەوڵیان دا ئیسلامیش بەو داوە تووش بکەن و هەمان واتای پێبدەن، بەڵام ئیسلام لەوان جیایە و لە بنەڕەت و حەقیقەتی خۆیدا لەگەڵ ئیسلام ناتەبا نیە بەڵکو دەرگا و ئاسۆی حەقیقی لەبەردەم زانست دا کردووەتەوە تا بگات بە ڕێبازێکی ئەزموونی کە بووە بە بنەڕەتی ژیاری نوێ. قورئان ئەو کانگا بنەڕەتیەیە بیردۆزەی مەعریفەی ئیسلامی و ڕێبازی ئەزموونی لێوەرگیراوە. ئیبنولهەیسەم لە قورئانەوە بیردۆزەی تیشکی وەرگرت. ئیبن خەلدون لە قورئانەوە یاسای دامەزران و داڕمانی گەلان و ژیارەکانی وەرگرت. قورئان بوو خەلیلی کوڕی ئەحمەدی ڕێنمونی کرد بۆ دانانی یاساکانی زمان و مۆسیقا و شیعر.

ئیسلام جیاکاری نەکردووە لەنێوان زانستی دنیایی و زانستی ئاین دا بەڵکو وەسیەتی کردووە هەوڵ بۆ هەردووکیان بدرێ بەوەی هەموو زانستەکانی بوون لە یەك ئایەت دا کۆبوونەتەوە و هانی داون و زانستی بە پێناوی لەخواترسان و ڕێگەی ناسینی خوا داناوە. خوا دەفەرموێت ﴿ أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ أَنزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً﴾ وەك ئاماژەیەك بە هەیئەت و گەردوون و پەیوەندی ئاسمان بە زەویەوە ﴿فَأَخْرَجْنَا بِهِ ثَمَرَاتٍ مُّخْتَلِفاً أَلْوَانُهَا﴾ ئەمەش ئاماژەیە بە زانستی وەك گژو گیا ﴿وَمِنَ الْجِبَالِ جُدَدٌ بِيضٌ وَحُمْرٌ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَانُهَا وَغَرَابِيبُ سُودٌ﴾ ئاماژەیە بە زانستی جیۆلۆجیا و ماوە قۆناغەکانی ﴿وَمِنَ النَّاسِ وَالدَّوَابِّ وَالْأَنْعَامِ مُخْتَلِفٌ أَلْوَانُهُ﴾ ئاماژەیە بە زانستی بیۆلۆجیا بە هەموو شێوەکانیەوە.

ئیسلام هەر زانستێکی بە فەرزی کیفایە داناوە کە موسڵمانان پێویستیان پێی بێ، فەرزی کیفایەش ئەوەیە کۆمەڵێك ئەو ئەرکە لەسەر شانی ئوممەت لابەرن و پێویستیەکانی دابین بکەن (حەسەن بەننا) ئیمامی غەزالی دەڵێت ئەگەر لای نا موسڵمانان زانستێ یان داهێنانێ هەبوو کە لای موسڵمانان لەوە چاکتر و باشتر نەبوو ئەوا موسڵمانان لەسەر ئەو کەمتەرخەمیەیان تاوانبارن و لێپێچینەوەیان لەگەڵ دەکرێ.

بۆ تێگەیشتن لە مەترسی ئەو گۆڕانەی تووشی ئەوروپا بوو بەهۆی دەستەوسانیان لە قبوڵکردنی چەمکی زانستی ئیسلامی و لادانیان لێی هەر دەبێ ئەو دۆخە گشتیە بزانین کە ئەزموونی ئیسلامی تیایدا سەریهەڵدا، ول دیورانت دەڵێت: ئەوەی لەبیری نوێی مەسیحی دا باو بووە ئەوە بووە هەر دەبێ بەم زووانە دنیا کاول ببێت و زەوی و چەند ئاسمانێکی نوێ شوێنی ئەم زەویە دەگرنەوە کە ئێمەی تێدابین. زانستی گەردوونیش وەك زانستەکانی تر پووچە، ئەو زانستانەی کە کڵێسا سەرکۆنەی کردن و لەکاری خستن، ڕوانین بۆ زانستی گەردوون بەگشتی قەڵب و بێ سودە چونکە مشتومڕی لێکۆڵینەوەی نیزامێکی گەردوونی بەناتەواوی کە خێرا نیزامێکی باشتر و بەسودتر جێی دەگرێتەوە چ گرنگی و چاکەیەکی هەیە.

قدیس ئۆگەستین (٤٣٠ز) بە جوانترین شێوە ئەمەی دەربڕیوە کاتێ پێی وابوو ئایا زەوی جەرگەی ئاسمان بێ یان لەملاو لەولای ئاسمان بێ هیچ سود و زیانێکی نیە، دیدی پیاوانی ئاینی بۆ ئاسمان و ئەستێرەکان جیاواز بوو. هەیان بوو پێیان وابوو کائینی زیندوون، هەندێکی تر دەیانوت نشینگەی فریشتەکانن، هەندێکی تر دەیان وت ئەستێرەکان کائینی ڕۆحین فریشتەکان بەڕێوەیان دەبەن. ڕێنماییەکانی ئاین لای ئەوان دەڵێت ئاسمان گومەزەیەکی ڕەقی دەوری زەویەو پەیکەرە ئاسمانیەکانیش چرای هەڵواسراوی ناو گەردونن. ئەمەش بەگشتی ڕێنمایی ئاینی پیاوانی کڵێسا بوون کە تێکئالاوی بیردۆزەکانی پەتلیمۆس. لەو پێناوەش دا کڵێسا نەیاری بیردۆزەی

کۆپەرنیکۆس و هاودەمی گالیلۆ ١٦١٦بوو، خوێندنەوەی کۆپەر نیکۆس وایکرد نیکۆس بەر نەفرین و ڕاوەدوونان بکەوێت. چەمك و واتاکانی زانایانی ئیسلام لەگەڵ چەمك و واتای بەتلیمۆس دا نەیار بوو بەوەی خولانەوەی زەوی و هەسارەکانی بەدەوری خۆردا چەسپاند کە لەگەڵ ڕێنماییەکانی کتێبی پیرۆزدا پێچەوانە بوو، بۆیە بە کوفر و ملهوڕی دادەنرا. هەرکەس بیوتایە بیردۆزەکەی کۆپەر نیکۆس ڕاستە ڕاوەدوو دەنرا و لە ساڵی ١٦٠٠ز برۆنۆ گیرا و بەزیندوویی سوتێنرا، ئەوان پێیان وابوو زانستی ئەندازیاری کاری شەیتانە و بیرکاریش بەرهەمی بیری ملهوڕانە.

هەروەها گالیلۆش برایە بەردەم دادگاکانی پشکنینی ڕۆما و دووجار لەپێناو بیدعەی جوڵەی زەوی دا دادگایی کرا. پەرچەکرداری توندی دژ بە زانست و هۆکار بوو تا لە ماوەی سەدەی نۆزدەدا بیردۆزە ملهوڕیەکان دەریکەون وەك تۆڵەسەندنەوەیەك لە ئاین تا ئەوەی بیکۆن دەڵێت ئاین بەربەستێکی بەردەم پێشکەوتن و کۆتێکە کە دەبێ بشکێنرێ. ئەم ئاراستەیە بەردەوام سەردەکەوت تا هەندێ لە فەیلەسوفان نکوڵییان دەکرد لە بوونی خوا وەك هیۆم و میل و جولیان و هکسلی و براتراند.

گەرمەی ناکۆکی نێوان زانایان و کڵێسا بۆ جیاکردنەوەی ئاین گەیشتە جیاکاری تەواو لە ڕێبازی ژیان، ئەمەش دوای ئەوەی قەڵەمڕەوی خۆی فراوان کرد و پێنوسەکانی شکاند و زمانەکانی بەستەوە. ئەمە وای لە بیریاران کرد لە دەسەڵات ڕاپەڕن و ئەو چاودێرییە قبوڵ نەکەن. دواتر فێربوون و خوێندن لە ئاین جیا کرایەوە و ئەو عەلمانیەتە سەریهەڵدا کە پەرچە کرداری تۆقاندنی ئاینی و دەستێوەردانی کڵێسا بوو بۆ کاروباری بیرو لێکۆڵینەوەی زانستی و پەروەردەی منداڵ و گەنجان و پێگەیاندنیان.

لێرەوە گۆڕانی قەڵەمڕەوی زانستی بەرەو ئەوە چوو ڕێبازێکی فەلسەفی دابنرێ کە هەوڵ بدات بە دیلێ لەبری ئاین پێشکەش بکات. بەداخەوە ئەو بەدیلە ماددیگەری تەواو بوو.

# باسی چوارەم

## (بیری ڕۆژئـاوا و پیلانی دژبە بیری ئیسلامی)

بیری ڕۆژئاوایی کە خۆی لە دەسەڵاتی مەسیحیەت ڕزگار دەکرد کۆمـەڵێ بـیردۆزەی دانان کە فەیلەسوفانێ بانگەوازیان بۆ دەکردن کە لەڕاستی دا بەرهەمی ئـەو ململانێیـە بوو لەنێوان کلێسا و زانا ئەزموونیـەکان دا بەرێوەچـوو و دواتـر ئـەو فەلـسەفە ماددیـە سـەریهەڵدا کـە هـەوڵی دا بەرنامەیـەك بـۆ ژیـان و کۆمەڵگـەو ژیار لـە دەرەوەی ئـاینی مەسیحیەت دا دابنـێ. ئەوانـەی زاڵ بـوون بەسـەر ئـەو بزووتنـەوەدا کـە پێـی دەوتـرێ بزوتنەوەی ڕۆشنگەری کۆمەڵێ فەیلەسوفی جوولەکە بـوون کـە لـە بنـەڕەت دا لەسـەر داڕماندنی مەسیحیەت کاریان دەکرد وەك سەرەتایەك بۆ داڕماندنی هەموو مرۆڤایـەتی. لەبەرئـەوەی مەسـیحیەت کۆمـەڵێ وەسـیەت بـووەو مەنهـەج و ڕێبـازێکی ژیـان و ڕێکخستنی کۆمەڵگـە نـەبوو بۆیـە ڕۆژئـاوا کـە بـەهۆی بەرنامـەی ئەزموونیـەوە بـەرەو پێـشکەوتنی بـواری دۆزینــەوە جوگرافیـەکان چـوو و کەوتـە هـەوڵی گرتنـی ناوچـە ئیـسلامیەکان –دوای دەرکردنـی موسـڵمانان لـە ئەنـدەلوس– لـەپێناو لـەناوبردنی قەڵـەمڕەوی سیاسـی ئابوریـان دا. کـاری یەکـەمیان دەسـتگرتن بـوو بەسـەر بەنـدەرو دەریاکان دا دوای پێشڕەوی لەو بوارەدا لەڕێی ئەو ئەزموونەوە کـە زانایـانی موسـڵمان دایاننـابوو و هەنـدێکیان لـە خزمـەتی غـەزای ئـەوان دا بـوون بـۆ دەسـتگرتن بەسـەر کەنداوادا و گەیشتن بە کەناراوەکانی هیند تا کانتون لەچین.

ئـەم بـیرە ڕۆژئاواییـە داگیرکاریـە لـەڕێی دەسـتگرتن بەسـەر ناوچـەی خـام و دامەزراندنی نیزامی سەرمایەداری و قۆرخکردنی بیردۆزە جیاجیاکـان بـۆ خزمـەتی ئـەو

ئامانجە ئەو بیرەی خۆی داڕشت تا دەستبگرێ بەسەر ناوچە ئیسلامیەکان دا و داهاتی تالآن بکات و دواتریش لەڕێی تێکشکاندنی بنەرەتەکانی بیری ئیسلامی و تەنگپێهەڵچنینی لەناو بازنەی بیری ڕۆژئاوایی لیبرالی دا ئەزموونی لەگەڵ ئەو ناوچە ئیسلامیانەدا پەیڕەو بکات کە دەکەوتنە بازنەی قەڵەمڕەوە داگیرکاریەکەی ڕۆژئاواوە تا بەتەواوەتی ببنە پاشکۆ و شوێنکەوتەی ڕۆژئاوا.

لەناوبردنی ئیسلام ئامانجی سەرەکی ڕۆژئاوا بوو کە لە پشت چالاکی نزیککاری و شالآوی ڕۆشنبیری و موژدەبەریەوە خۆی داشاردبوو تا چەمك و واتا بنەڕەتیەکەی ساختە بکات و نەوە نوێکانی موسڵمانان لەدیدی ئیسلامی داماڵێ و ئەو نەوانە بە بریقەی ژیاری ڕۆژئاوایی و قەڵەمڕەوو دەسەلآتی ئەو ژیارە هەڵبخەڵەتێنێ.

مەترسیدارترین بانگەوازی ڕۆژئاوایی بریتی بوو لە:

یەکەم: وێرانکردنی یەکبوونی ئیسلامی بە بڵاوکردنەوەی گیانی نەتەوایەتی و کەمینەکان.

دووەم: سەپاندنی قەڵەمڕەوی ڕۆژئاوایی بەسەر خوێندن دا و دەرکردنی لە چەمك و واتاکانی ئیسلام.

سێیەم: سەپاندنی بانکی سووخۆری و تێکشکاندنی ئابووری ئیسلامی.

چوارەم: وەستاندن و کۆتکردنی شەریعەتی ئیسلامی و سەپاندنی یاسای دانراو.

ڕۆژئاوا ئایدۆلۆجیا و ئەو زانستانەی خۆی پێشکەش کردن کە لە کەشێکدا پەیڕەوی کردبوون کە بەتەواوەتی دوور بوو لە ئاین بەهۆی ناکۆکی نێوان سەرکردەکانی بیری ڕۆژئاوایی و مەسیحیەت کە کڵێسا ڕێبەری دەرکرد. ئەمەش بەبێ ڕەچاوکردنی بیردۆزەیەکی فراوانتری سەبارەت بە چەمکی ئاین کە بتوانێ بچێتە دەرەوەی

چوارچێوەی مەسیحیەت. پاشان ئەو زاڵ بوونەی ڕێبازی ماددی ڕۆژئاوا هات کە خۆی لەبیری سەرمایەداری لیبرالی دا دەنواند. لەو نێوەندەدا بیردۆزەی داروین دەرکەوت سەبارەت بە گەشەسەندنی بیۆلۆجی. دواتر لەسەر دەستی سبنسەر و کەسانی تر گۆڕا بۆ گەشەسەندنی ڕەهای کۆمەڵایەتی بیردۆزەی فرۆید سەبارەت بە نەفس و بیردۆزەی دۆرکایم سەبارەت بە کۆمەڵایەتی و بیردۆزەی دیوی سەبارەت بە پەروەردەو بیردۆزەی میکیافیلی سەبارەت بە سیاسەت. بیردۆزەی برگماتیزم سەبارەت بە ئەخلاق– هەروەك بیردۆزەی ماددی لە ڕاڤەی ژیان دا دەرکەوت (هیچ خوایەك نیە و ژیانیش ماددەیە) بیردۆزەی راڤەی ماددی بۆ مێژوو دەرکەوت، ئایین بە تلیاکی گەلان دانرا. بەهاکان وا سەیر دەکران تەنها ڕەنگدانەوەی باری ئابووری بن، ئەخلاق بەپێی گۆڕانی کۆمەڵگەی پیشەسازی دەگۆڕێ. پەروەردە و ئەخلاق بەهای نابنەڕەتی ژیانن.

ئایدۆلۆجیای بیری ڕۆژئاوایی (سەرمایەداری) و پەرچەکردارەکەشی (مارکسیەت) لەپێناو یەك ئامانج دا بوون کە ئەویش زاڵ بوون بوو بەسەر هەموو گەلان دا بەپێی چەمك و واتایەکی داگیرکاری کە لە وردەکاری دا جیا و لە ئامانجدا یەك بوون. بیردۆزەی بەرز ڕاگیری جنس و ڕەگەز لە لە هەموو ڕۆژئاوا و لە ئەڵمانیا و لە صەهیۆنیەتدا ڕوون و دیار بوو. بیرۆکەی پەرستشی هێز و ئارەزووش دیار بوو. پاڵنەری پێچەوانەی ڕەهبانیەت ڕووەو شۆڕشی جنس کاریگەری خۆی هەبوو لە دەرکەوتنی چەند مەسەلەیەکی دواتری مرۆڤدا. ئیمپراتۆریەتی سوو و پەرستشی زێڕ و نکوڵی لە ڕۆژی دوایی و زیندووبوونەوە. نەهێشتنی غیرەت بەرامبەر ئافرەت، نەمانی سۆز بەرامبەر باوك و گەورە و پەرستشی جەستە و بێ بەرگی و بیردۆزەی جنسی کە فرۆید پێشکەشی کرد. شوعیەتی سەرمایە و ئافرەت، ئەمە گەڕانەوە بوو بۆ چەمك و

واتاکانی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی و کۆماری ئەفلاتون و ڕەوایی کۆیلایەتی کە بە پەردەی هەڵخەڵەتێنەر داپۆشرا بوو.

دۆرکایم چەمك و واتای مارکسی لە باسی ئابووری و سیاسەتەوە گواستەوە بۆ باسی کۆمەڵایەتی و ئەخلاق، پوختەی ڕەوتەکەی ئەوەیە تاك هیچ بەهایەکی نیەو هیچ واتایەك نیە بۆ خاوەنێتی ئازادی تاکە کەسی بەڵکو هەموو بەها بۆ کۆمەڵگەیە کە ئایین و بەها ڕۆحی و بیروباوەڕیەکان دروست دەکات و ئەگەر نیزامێکی ڕێکخەری کۆمەڵایەتی نەبێ هەموو ئەوانە هەروا و بێ بەهان (عەقاد).

بیردۆزەی ماددی جەدەلی (هیگل) هات تا بیردۆزەی میتا فیزیقی لەناو ببات. پێی وایە لەکاتی گۆڕانی بەردەوام و بزاڤی بەردەوام و نوێگەری بەردەوام و گەشەسەندن دا بە پێچەوانەی بیردۆزەی میتا فیزیقی کۆتایی نایەت. لە بیردۆزەکەی هیلگەوە ئەو بیردۆزە ماددیە مێژووییە دەرکەوت کە مارکس ئاڵاکەی هەڵگرت و شەپۆلی ماددی ملهوڕیش دەرکەوت کە نکوڵی لە ئایینەکان و دروستکەر (خالق) دەکرد و بیری خەڵکی بەند دەکرد لە مەسەلە ماددیەکانی ژیان دا و ڕاڤەی ئایینی بۆ مێژوو و جموجوڵەکانی دەوەستاند و وای لە مرۆڤ دەکرد قەناعەت بکات بە ژیانی لەسەر زەوی دا تا پێویستیەکانی جەستە وەك هەر ئاژەڵێکی تر دابین بکات بەبێ ناودانە گرفتەکانی بیرو بیروباوەڕ. ماسۆنیەتیش ئەمانەیان دەوتەوە وەك برنسو دەڵێت دوژمنی یەکەممان ئەرستۆقراتی و پاشا و کڵێسا نیە، بەڵکو یەکەم دوژمنمان ئایینە.

دواتر ئەو دیدە بێ ڕەوشتیە لە نوسینەکانی هافلون ئەلیس و نیتشەو ڤۆڵتێر و بیکاسۆ دا دەبینین کە بە نمونەی بیری جیهانی دادەنێن لەکاتێك دا تەنها چەند چیرۆکێکی جنس و دەست درێژیی و بیرکامۆ و سارتەر و فرەنسۆساجان سومرست

مـوم نوسـیویانن لەگـەڵ چـیرۆکی گوڵـە خراپـەکان و وێنـەی دۆن گـرای و لۆردشـترلی شەیدای. بانگەوازی بوونگەرایی لەسەر دەستی سارتەر بوو کـە داوای دەمـەوە چـوونی ڕەهای ویستی دەروونی دەکرد تا ویژدانی خەڵکی هەست بە تاوان نەکات.

نوسینەکانی جولەکەش لەبواری زانستە ئیسلامیەکان و زانـستە کۆمەڵایەتیـەکان دا لە قۆناغەکانی کۆتاییدا مەترسیدارترین هەوڵی بەدیهێنانی ئارەزووەکـانی ماسـۆنیەت و لهۆن بوو بۆ داڕماندنی کۆمەڵگەکان.

شتە مەترسیدارەکە ئەوە بوو هەموو ئەمەی گوازرایەوە بۆ ئاسۆی بیری ئیـسلامی و بریقەیەکی پێدرا. نەوەیەك بـۆی پێکهێنـران کـە بڕوایـان پێـی بـوو و بانگـەوازیان بـۆ دەکـرد، بـەڵام خێـرا بزاڤـی بێداریخوازی ئیـسلامی خراپـە و گەنـدەڵی ئـەو ڕێبـازەی بەتەواوەتی ئاشکرا کرد و هەر دەبێ بەرەو ڕووی ببنەوە.

# باسی پێنجەم

## (چەند تێبینیەك لەسەر بەرنامەی ڕۆژئاوا لە لێكۆڵینەوەی زانستیدا)

پیاوانی بیری ڕۆژئاوایی بانگەشەیەك دەخەنە ڕوو كە گوایە ئەوان مەنهەجین و پەیوەستن بە عەقڵانیەت و زانستی بوون دوور لە ئارەزووی ویژدان و هەست و سۆزی مرۆڤ. بیروڕای خۆیان لە بازنەی مەوزوعیەت دا دەخەڕوو. مەوزوعیەتێ كە چەندین دەق و مەرجەعی پێوە پێچراوە. لەگەڵ ئەمەش دا ڕێبازی ڕۆژئاوا لە لێكۆڵینەوەی زانستی دا لە ڕاستی دا لەسەر گومان و ئارەزووی دەروون وەستاوە ﴿إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا الظَّنَّ وَمَا تَهْوَى الْأَنفُسُ﴾ چونكە كاتێ وازیان هێنا لە ڕێباز و ئەخلاقیاتی ئایین ڕێیان لەبەردەم دا كرایەوە بەرەو ئارەزووەكانی مرۆڤ. ئەوە لەگەڵ بیری یۆنانی و ڕۆمانی كۆنی بتپەرستی دا یەكیخستن كە لەسەر ساوایی منداڵ و داروپەردووی فەلسەفە كۆنەكان وەستاوە. چاكترین بەڵگەش بۆ ئەوەیە بریتیەیە لەوەی زانایەك لەوپەڕی ئاستی مەوزوعیەت دا وەك فرۆید پشت دەبەستێ بە ئەفسانە كۆنەكان تا بیردۆزەكانی خۆی لەسەر بنیاد بنێ، بێگومان ئەو بیردۆزە مرۆییەی بیری ڕۆژئاوای لەسەر دامەزراوە لە سێ بنەڕەتی پێویست دا دەبینێتەوە:

**یەكەم:** بێتوانایی لە وەرگرتنی سەردەم دۆخ و كەش و كۆشكە بەردەوامەكان دا بەرامبەر قۆناغێكی سەردەمی یان دۆخ و كەشێ.

**دووەم:** دەستەوسانی لە بەخششی بەردەوام دا چونكە خێرا بیردۆزەكە بەهۆی گۆڕانەكانی سەردەم و دۆخ و كەشەوە پەكی دەكەوێت.

**سێیەم:** دەركەوتنی مۆركی ئارەزوو و چاوچنۆكی تایبەتی مۆریی.

له كاتی بەراوردی بیری مرۆیی ڕۆژئاوا كه مەنزومەی یاساو بەها و بنەماكانی ئاسۆی كۆمەڵگه و سیاسەت و ئابووری لە ڕۆژئاوادا پێشكەشی كردووه- لەگەڵ چەمك و واتای بیری ئیسلامی دا كه لە قورئان و سوننەتی پاكەوە وەرگیراوە كۆمەڵێ جیاوازی قوڵ و فراوان دیاری دەكرێن:

یەكەم: دامەزرانی بیری ڕۆژئاوایی لەسەر چەمك و واتای ملكەچی بۆ گیانی سەردەم.

دووەم: ملكەچ كردنی زانستە مرۆڤایەتیەكان بۆ چەمك و واتای ماددە.

سێیەم: ئینشیتاری و لێكهەڵوەشانی تەواوێتی چەمكی مرۆیی كۆكەرەوەی ڕۆح و ماددەو دامەزرانی فەلسەفەی ماددی لە بنەڕەت دا.

چوارەم: بیرۆكەی گەشەسەندنی ڕەهاو ملكەچی ئەخلاق بۆ گەشەسەندن لەكاتێكدا چەمك و واتای ئیسلام لەسەر بنەمای چەسپاو و گۆڕانەكان وەستاوە.

پێنجەم: بیرۆكەی پێشكەوتنی ماددی بە تەنها، لەكاتێك دا ئیسلام كاریگەرە بە چەمكێكی گشتگیر بۆ پێشكەوتن ماددی و مەعنەویش، لە هونەریش دا جوانی پێش ئەخلاق بخات.

شەشەم: بیرۆكەی ئازادی جنس و ڕەواكاری و زێدەڕۆیی لەكاتێك دا بیری ئیسلامی لەسەر ئەخلاق و پاك داوێنی و ڕێكخستنەكان وەستاوە.

حەوتەم: بیرۆكەی بەرپرسیارێتی بەكۆمەڵ لە كاتێك دا ئیسلام لەسەر بنەمای بەرپرسیارێتی تاكەكەسی وەستاوە.

هەشتەم: ناتەبایی بیری ڕۆژئاوایی ڕوونی نێوان دوو مەزهەب یەكەمیان لە ویستی مرۆییەوە لێدەنەوێ تا دەگاتە ئاستی بانگەشە بۆ ویستی ڕەهای مرۆیی بۆ هەموو بوون. دووەمیان لە خۆسەپێنی كۆمەڵایەتیەوە لێدەنەوێ تا دەگاتە لەناوچوون و لێكهەڵوەشان.

هەڵخەڵەتاندنی موسڵمانان بەوەی پێی دەوترێ مەنهەجیەتی لێکۆڵینەوەی زانستی لە ڕۆژئاوادا مەترسیدارترین باسی ناو هەموو بابەتەکە بوو. چونکە ئیسلام خۆی بنەڕەتی لێکۆڵینەوەی زانستی دانا، بۆیە لەسەر بنەمایەکی پاکی دوور لە ئارەزوو و گومان دامەزرا. یەکەم بنەما و بنەڕەتیشی داننان بوو بە چاکەی ئەوانەی پێش خۆیدا لە مەیدانی زانست و نرخاندنی هەوڵیان و لەبەرچاوگرتنی چاکەیان، بەڵام ڕۆژئاوا کاتێ ئەو بەرنامەیان گواستەوە بیرۆکەی ویژدان و داننان هەوڵیان لێ لابرد. دواتریش کەوتنە بردنی بیری ئیسلامی بەرەو چەند بەرنامەیەکی پڕ دەمارگیری و کینە و خۆ بێئاگا کردن لە دادپەروەری سەبارەت بە ئیجابیەتی بەخششی ئیسلامی و لەبەرچاوگرتنی بە ڕوونی. ئەمەش لەسەر بیرێکی پێشوەخت وەستاوە کە دوژمنایەتی و حەزی شێواندنی ڕاستیەکانە.

دادگاییکردنی مێژوو بیری ئیسلامی لەلایەن ڕۆژئاواوە بەپێی بەرنامەی خۆیان کارێکی بەمەبەست بوو تا ڕۆڵی ئیسلامی پشت گوێ بخرێ، ئەو ڕۆڵەی کە ناکرێ بە ڕێبازێکی ماددی سەیر بکرێ. هەروەها هەوڵی کوژاندنەوەی تیشك و ڕوناکی مێژوو کە ئیمانی حەق لە دەروونی موسڵمانان دا زیندوو دەکاتەوە، لەم بارەوە ئیتیان دینیە دەڵێت: ئەوەی ئەگەر مەحاڵ نەبێ ئەوا زۆر سەختە ئەوەیە ڕۆژهەڵاتناسان سۆز و کەش و دیدی جیای خۆیان داماڵن، بەڵکو لەبەر ئەوە کەوتوونەتە لادان بە ژیاننامەی پێغەمبەر (ﷺ) و هاوەڵان تا وێنە ڕاستیەکەی بەهۆی زۆر دەستکاری کردنیەوە دەرئەکەوێ، ئەمەش سەرەڕای بانگەشەی ئەوەی گوایە شێوەی ڕەخنەگری پوختیان گرتووەتە بەرو ملکەچی لێکۆڵینەوەی پوختی زانستین.

ئەو لادانەی بیری ڕۆژئاوایی بەرەو فەلسەفەی ماددی توشی بوو مەترسیدار بوو بەهۆی ڕاڤەی ماددی بۆ بوون، ڕاڤەی ماددی بۆ مێژوو، ڕاڤەی ماددی بۆ ژیان. هاتنەدی کتوپڕ و خۆبەخۆ. پێوانی ئەزموونی هەستی بەتەنها، هیچ دەرفەتێ نیە بۆ ئەو بیرەی هەوڵ دەدات جیهانی هەست تێپەڕێنێ بۆئەودیو جیهانی هەستپێکراو.

مەترسیدارترین تووشبوونی بیری ڕۆژئـاوایی ئـەو دوورگیریـە زۆرەی نێـوان عـەقڵ و ڕۆح بـوو لەلایەکـەوە. لـە لایـەکی تریـشەوە چـوون بـە ئاراسـتەی ئارەزووەکـان، زانـا ڕۆژئاواییـەکان خۆیـان بەرپەرچیان داوەتـەوە. لەوانـە ولیـەم جـیمس کـە نکـوڵی تـاک دەکات لە بیروباوەڕە ئایینیەکەی یان ئەوەی پێی دەڵێ غەریزە ئایینیەکەی بە مـاف و سروشتیەوە و پشتگوێ خستنی لەبەر گرنگی و ئەو ڕۆڵەی کە لە ئاکاری مرۆییدا هەیە.

زۆرێك جەخت لەوە دەکەنەوە ملهوڕی لـەو بیروبـاوەڕەوە سـەر هەڵـدەدات کـە دژی فیترەتە و لەگەڵ عەقڵ ناگونجێ و لەگەڵ سروشتی شتەکان دا پێکدا دەدات. ملـهوڕی لە بیری ڕۆژئاوایی دا بەپێی ڕای چەندین بیریاری ڕۆژئاوا دەگەڕێتەوە بۆ کۆت و بەنـدی لاهـووتی مەسـیحی و مـەحاڵی قبـوڵکردنی لەلایـەن عەقڵـەوە هـەر لـە چـەمکی سیانە خودایی و خاچ و هەڵە و تاوانەوە، ئەو بیردۆزە ماددیەش کە ئـەو شـیکارە دەروونیـەی هێنایە کایە کە لەسەر جنس وەستاوە کاریگەری خۆی هەبوو لەسەر ئـەدەب و چـیرۆك بەتایبەت و بڵاوکردنەوەی چەمکی بێ ڕەوشتی و ئاژەڵگەری. مەسیحیەتیش لـە دیـدی تاکگەرایی بۆ مرۆڤدا ڕۆڵی خۆی هەبوو، لەسەر ئەو دیدەش بەرنامەی لیبراڵی و ئـازادی تاکەکەسـی و ئـابوری سـەرمایەداری دامـەزرا. هەڵـە بنەڕەتیەکـە سەرچـاوەی بـیری بوونگەرایی بوو. چەمکی گەشەسەندنی ڕۆژئاوایی بەها ئەخلاقیەکان و بیروباوەڕی کرد بە کۆمەڵێ بنـەمای ڕێـژەیی واتـە ئیـدی حەقیقـەتی ڕەهـا نـین و گەشـە دەکـەن و بـێ بوونی کۆتاییەك گەشە دەکەن.

هـەروەها لێکۆڵـەران (بوونگـەرا نوێکـان) پێیـان وایـە دەربڕینـی بۆشـایی شـاراوەی دەروونـە کـە خـەڵکی لـە ڕۆژئـاوا دەیـبڕن. هـەروەها مەترسـیدارترین ڕوانگـەی بـیری ڕۆژئاوایی ئامانجی جیاکاری نێوان مەنهەج و پەیڕەوە.

# باسی شەشەم

## (بەرنامەی ئیسلام لە زانست و مەعریفەدا)

سەبارەت بە ئیسلام ئەوا بەرنامەی بنەڕەتی گشتگیری خۆی هەیە لەبواری زانستو مەعریفەدا جیا لە بەرنامەی ڕۆژئاوا، بەڵكو لە دەیان بابەت دا لەو جیاوازە. دیارترین تایبەتمەندی گشتگیری ڕوانین بۆ مرۆڤ بەو پێوەرەی لەخۆڵ دروست كراوە و ڕۆحی بەبەردا كراوە. بە چاوپۆشی لە ڕەگەز و ڕەنگ و ئاینی. هەروەها یەكخستنی تاكگەرایی و كۆمەڵ و كۆكردنەوەی نێوان خوایەتی و مرۆیی و ئەو زاتە تایبەتیەی كە جیایی ڕادەگرێ لە ئاین و بەرنامەو ئایدۆلۆجیاكان. ئیسلام مەعریفە و ڕۆشنبیری جیا دەكاتەوە. مەعریفە جیهانیە و ڕۆشنبیریش تایبەتیەو هەر گەلێ ڕۆشنبیری خۆی هەیە. شورا دیموكراتیەت نیەو دادوەری كۆمەڵایەتیش ئیشتراكیەت نیە.

چەمكی پێشڕەوی لە ئیسلام دا چەمكێكی گشتگیری ماددی و مەعنەویشە نەك ماددیەكی تەواو، ئیسلام ڕازیە بە سەركەوتنی ماددی بەڵام لای خۆیەوە بە ئامانجی نازانێ. ئیسلام دژی پێشڕەوی نیە بەڵكو پاڵنەرێتی، ئیسلام لەگەڵ دەمارگیری ڕەگەزی یان هەرێمچیەتی نیە، هاوكات لەگەڵ بیرۆكەی گەشەسەندنی بەردەوام و ڕاڤەی ماددی یان ئابوری یان ڕەگەزی نیە بۆ مرۆڤ، بۆ لێكۆڵینەوە لە مرۆڤیش دان نانێت بە نموونە هێنانەوەی ئاژەڵ و كردنی بە بەڵگە.

ئیسلام لەگەڵ بیرۆكەی ڕەهبانیەت و ڕاكردن لە ژیان نیە. ئیسلام دەیەوێ زانستە مرۆییەكان لە پێوەرە ماددیەكان ڕزگاربكات چونكە دەروونەكان ملكەچی ئەوە نابن كە زانستی ئەزموونی ملكەچیەتی. ئیسلام داوای لەبەرئەوە نیە بیانوو بێنێتەوە بۆ باری ژیار و كۆمەڵگەكان، بەڵكو داوا لە كۆمەڵگەكان دەكات پەیوەستی ئەو ڕێكخستن و سنورانە بن كە ئیسلام داینـاون. ئیسلام دان دەنێ بە ویستەكانی مرۆڤ دا و لە

چوارچێوەی ڕێکخستنی شەرعی و ئەخلاقیدا بەپێی ئاستی توانارەوای کردون، خوا دەفەرموێت ﴿لاَ يُكَلِّفُ اللّهُ نَفْساً إِلاَّ وُسْعَهَا﴾

ئیسلام باس لە هەڵەو گەڕانەوە بۆ حەقی کردووە هەرکات ڕاستی بۆ ڕوون بوویەوە، موسڵمانیش هان دەدات بۆ ئیجتیهاد کردن و بڕیاری داوە کەسێ هەڵە بکات پاداشتێکی بۆ هەیە ئەگەریش ڕاست بێ دوو پاداشتی هەیە. داوا دەکات بە خەون هەڵنەخڵەتێیت یان گومان قبوڵ نەکەیت. عەقڵ بەکاربێنیت و پرسیار لە شارەزایان بکەیت.

ئیسلام داوا دەکات بەڵگە هەبێ و دوورە پەرێزی دەکات لە دەسەڵاتدار کردنی ئارەزوویان دەمارگیری لە کاتی گەڕان بۆ حەقیقەت. ئەرك و سنور و توانای داوە بە عەقڵی مرۆیی و ملکەچی سروشتی کردووە. فەرمانی کردووە زانست نەشاردرێتەوە بەڵکو لەناو خەڵك دا بڵاویکرێتەوە، زانستخوازی بە فەرزی سەرشانی هەموو موسڵمانێ داناوە و ئوممەتیش دەبێ خەڵکانێ دابنێ بۆ فێرکاری خەڵك و فەزڵی زانستی داوە بەسەر پەرستش دا.

ئیسلام دەڵێ هەموو بەهایەك دوو دیدی تەواوی هەیە، ماددی و مەعنەوی، ئەو دوانەش لە یەك جیا ناکرێنەوە. عەقڵیش پێناوێکە کە بە ڕووناکی سروش ڕێنموونی دەکرێ.

دەکرێ جیاوازی نێوان ڕێبازی ئیسلام و ڕێبازی مرۆیی ڕۆژئاوایی بخەینە ڕوو. ئیسلام بەم مۆرکانە جیاوازە: خواپەرستی، مرۆڤێتی، جیهانبوون.

هەروەها جیاوازی هەیە لەنێوان تەواوکاری تەواوی ئیسلام و ئینشیتاری بیری ڕۆژئاوایی و جیاوازی فەلسەفە و زانست و جیاوازی ئەخلاق کە لە بەهاکانی بیروباوەڕە لەگەڵ داب و نەریتەکان کە لە گۆڕانکاریەکانی کۆمەڵگە مرۆییەکانن.

ئیسلام دوور لە سوو و ململانێی چینایەتی بەرنامەی ئابووری خۆی دادەنێ و لایەنەکانی هەڵسوکەوت بەجۆرێ نوێ دەکاتەوە کە کۆمەڵگە لە خراپە و بێڕەوشتی

بپارێزێ و نەوەکان لەسەر بنەمای پەیوەستی و توانای پاراستنی جڵەو و بەرەنگاری بەرامبەر و سەنگەرگیری سەر سنور و پەیڕەوی چەمکی جیهاد و فەرمان بەچاو ڕێگری لە خراپە سەرپێ بخات. لەوانەش پاراستنی خۆیی ئیسلامی لە تێکەڵ بوون لەگەڵ بیرە هاتووەکان و وەستان بەڕووی ژیاری ڕۆژئاوادا و قبوڵنەکردنی نموونەی ڕۆژئاوایی بە هەردوو کەرتەکەیەوە. ئەمەش دوای ئەوەی ژیاری ڕۆژئاوایی نەیتوانی سپاردەی دادپەروەری و ڕەحمەت و برایەتی مرۆیی هەڵگرێ و هەموو ئەوەی گۆڕی بە ترس و بیمی ناو دەروونی خەڵك و هەر ڕێگایەکی گرتەبەر لەپێناو پێشکەش کردنی بەرنامەی مرۆیی لە ئایدۆلۆجیای تاکە کەسی و بەکۆمەڵ دا کە حەز و هەڵپەی دەروونەکان سەرکوت نەکات. دەستەوسانیش بووە لە بەخششی حەقیقی. دوای خرانە ڕووی چەمك و واتای بیری ڕۆژئاوایی و بەها شێواوەکانی لە ئاسۆی کۆمەڵگەی ئیسلامی دا بیری ئیسلامی دەبوو ئەو ساختەیە ئاشکرا بکات و فەرهەنگی پێغەمبەرایەتی دیاری بکات و ژەهری قادیانیەت و بەهائیەت و ماسۆنیەت و مەهاریش‌و بانگەوازە سەرشێوێنەکانی تریش لەناو بەرێ.

دەبێ ئەوە ڕوون بێ بیری ئیسلامی پێوەری تایبەتی خۆی هەیە لە مەسەلەکانی ڕۆشنبیری و لێکۆڵینەوەی زانستی و مێژوودا کە تەواو لە چەمك و واتای بیری ڕۆژئاوایی جیایە، چونکە وەرگیراوە لە بەها بنەڕەتیەکانی ئیسلام، ئەو بەهایەی چواردە سەدەیە ئوممەتمان دەیانزانێ، لەکاتێك دا ئەو چەمکە هاتووانە بە پوچەڵی خۆیان و بە هێزی فەڵەمڕەوی بیانیەوە ماوەی تەنها سەد ساڵە ئاسۆی فیکری ئێمەیان بڕیوە بەڵام قبوڵ و وەرگرتنیان بەدینەکرد.

بەرنامەی ڕۆژئاوا دیدێکی تایبەت و بەرتەسك و سنوردارە و چەند سەپاندنێکی وان کە هەڵە و ڕاستیش لەخۆ دەگرن و لە ڕۆشنبیریەکی تێکەڵ و ئەزموونێکی کەمەوە وەرگیراون. ناکرێ هۆشێکی جیهانی وا بنوێنن کە بتوانێ پێشکەشی مرۆڤایەتی بکرێ

بۆ چارەسەری کێشەکانی، چونکە لەلایەکەوە لایەنگرن و ئارەزوو و چاوچنۆکی صەهیۆنیەت بەسەریان دا زاڵە، ئەمەش پرۆتۆکۆلاتەکەیان ئاشکرا کرد کە بۆ تێکشکاندنی بەها مرۆییەکان بە مەبەستی دەست گرتن بەسەر جیهان دا چییان نیازە.

لە ڕێبازی ڕۆژئاوایی دا هیچ شتێ هێندەی لەدەست دانی خواپەرستی و ئیمان بەخوا مەترسیدار نیە، چونکە ئەو باوەڕبوونە بنەڕەتی ڕێبازی ژیان و بنیادی کۆمەڵگەو ژیارەکانە، ئایدۆلۆجیا هاوچەرخەکان تەواو لەوە خاڵین و جگە لە ئوممەتی ئیسلامی لە ڕوانگەی ڕێبازە خوا ویستیە قورئانیەکەیەوە لای هیچ ئوممەتێکی تر نەماوە، ئەمەش هێمای ئوممەتی میانڕەوە (میانڕەویش واتە چاکترین و باشترین و کامڵترین). چاکێتی ئەم ئوممەتە لەوەدایە توانای هەیە فەرمان بکات بە چاکە و ڕێگری بکات لە خراپە.

بیرە ملهوڕی و بێ ڕەوشتیەکان توانییان چەندین ئاین و ڕەوت و گەل لەناو ببەن و تەنگیان پێهەڵچنن وەك چۆن فەلسەفەی یۆنانی بەرامبەر جولەکایەتی و مەسیحیەت کردی– و لەناو جەرگەی شوێنی خۆیدا لەناوی ببەن، بەڵام لەبەردەم ئیسلام دا دەستەوسان وەستاون چونکە لە کرۆك دا بە جۆرێکە توانای هەیە ببوژێتەوە بۆ ڕاستکردنەوەی ڕەوتەکەی و ئازادکردنی بیری خۆی کاتێ ئوممەتی جیهانی دەیەوێت تەنگی پێهەڵچنێ. بیری ئەمڕۆی ڕۆژئاواش بۆ فەسادی ڕێکخراوی ئەخلاقی و پێشکەش کردنی بەدیلی فیکری خاوەن ئاڵای بتپەرستی نوێ و دروست کردنی چەند نەوەیەکی هەواداری هەڵگرانی ئاڵای دژە یەکخواپەرستی. ئەو هەوڵانە دواتر دادەڕمێن دوای ئەوەی ئوممەتی ئیسلامی دەگاتە قۆناغی پێگەیشتنی هزری و پیلانی شاڵاوی هزری و ڕۆژئاواگەری بۆ ئاشکرا دەبێ، ئەو پیلانەی کە دەزگاکانی ڕۆژهەڵاتناسی ڕۆژئاواو جولەکە و مارکسی پێی هەڵدەسن و هەرگیز بیردۆزەی عەلمانیەت ناتوانێ ببێتە بەدیل بۆ ڕێبازی ئیسلام چونکە ئیسلام بە سروشتی خۆی لەسەر نیزامێکی کۆکەرەوەی

دین‌و دەوڵەت دامەزراوە. بیری ڕۆژئاوایی لە بنیادی بنەڕەتی سیاسی خۆیدا دوو تایبەتمەندی هەیە، میکیاڤیلی و دەمارگیری. ناپلیۆنیش ڕایدەگەیەنێت کتێبی (میر)ی میکیاڤیلی تاکە کتێبی سیاسیە کە شیاوی خوێندنەوەیە، سەبارەت بە دەمارگیریش ئەوا کۆت و چەمکی ڕۆمانیە (ڕۆمان گەورە و بەرپرس و چوار دەورەکانیان کۆیلەن).

ئەگەر بیری ڕۆژئاوایی لە شەرعیەتی کۆیلایەتی دا پێچەوانەبوونی خۆی لەگەڵ بیری ڕۆمانی دا ڕاگەیاند بێ. ئەوا ئەوەی ڕوویدا کاتێ ڕۆژئاوا هیندیەککانی ئەمریکایان بە کۆیلە دەگرتن یان ئەفریقیەکان بە پیلانێکی مەترسیدار دەگوازرانەوە بۆ ئەمریکا، ئەمە تێکشکێنەری کەسێتی مرۆڤە. چونکە بیری ئیسلامی تەواو لەوە جیاوازە، دکتۆر حامد ڕەبیع دەڵێت: ئیسلام ڕازی نیە بەو نەریتە ئەورووپیانەی لە دەمارگیری تاکە کەسی دا هەن و دژی مارکسیەتە لە جەختکردنەوەی سەبارەت بە دەسەڵاتداری ڕەگەزی کۆمەڵایەتی و لەکارخستنی تاك و دژی نازیەت یان فاشیەتە وەك بەرهەمێکی زیادەرەوی هەردووکیان سەبارەت بە جەختکردنەوەی لە دەمارگیری. لێرەوە بیری سیاسی ئیسلامی لەبارە چونکە ئەرکی گشتی مرۆڤایەتی لە ساڵانی دواتردا ڕادەپەڕێنێ.

لە بنەماکانی زانستی ئیسلامی پاراستنی سەر سنوری نێوان زانست و ئەخلاقە و هاوسەنگی پاراستنی نێوان دوو ڕەگەزی ماددەو ڕۆح ئەخلاقیەتی ژیان و زانستەکانە، موسڵمانان هەندێ لقی زانستیان بەرپەرچ داونەتەوە جیا لەوەی ئیسلام بڕوای پێیەتی لەڕووی ئامانج و ڕاڤەی بوونیەوە. جیا لەوەی ناسینی خوای گەورە بنەڕەتی حەقیقی هەموو زانست و ئەزموونەکانە، موسڵمانان لە ڕێبازی لێکۆڵینەوەی زانستی دا ناسراون بە لێکبووردن لەگەڵ ئەو دەستە جیاوازانەی کە لە سایەی موسڵمانان دا دەژین. جیا لەگیانی زانستی لەسەر بنەمای هەوڵدان لەپشت مەعریفەوە لەپێناو مەعریفە دا نەك لەپێناو ئەو سوودە ماددیەدا کە لە پشت ئەوەوە بەدەست دەکەوێت.

به هەمان شێوه ئیسلام دژی بیرۆكەی بەشبەش كردن و كەرت كردنی مرۆڤه بۆ چەند یەكەیەكی له یەك جیا، چونكه ئەوه لەگەڵ فیترەتی مرۆڤایەتی دا ناگونجێ چونكه مرۆڤ له چەمك و واتای ئیسلامی دا جێی دابەش بوون و جیاكاری نیه و تەواوكەر و هاریكار و كامڵكاره. هەروەك ئیسلام دژی چەمكی خۆسەپێنیه، ئەو چەمكەی دەڵێ مرۆڤ هیچ ویستێكی نیه، بەڵكو دان دەنێ به ویستی كرای مرۆڤ دا. هاوكات ئیسلام چەمكی بەرپرسیارێتی كۆمەڵگه قبوڵ ناكات، ئازادی ئارەزوو و زاڵ بوون و دەرچوونی حەزەكان قبوڵ ناكات. بەڵكو پێناو لەگەڵ حەزەكانی مرۆڤ دا بەپێی چەند ڕێكخەرێكی یەكلاكەرەوه ڕێكدەخات كه ویستەكانی مرۆڤ حەرام ناكەن. بەڵكو ڕێ نادەن ببنه هۆكاری داڕماندنی خودی كەسەكه یان كۆمەڵگەكەی.

ئیسلام به هێز و پێچەسپاو له سێ خاڵی چەسپاو دا وەستاوه:

یەكەم: برایەتی مرۆیی و دادپەروەری كۆمەڵایەتی.

دووەم: پەیوەستی ئەخلاقی و بەرپرسیارێتی تاكەكەسی.

سێیەم: بەحەرام دانانی سوو و سەرخۆشكەرەكان و كوشتن و قومار و زینا.

# باسی حەوتەم

# ( پاشەکشەی زانست توانی دەستەوسانی لە پێشکەشکردنی حەقیقەتی شێوەییدا )

دوو مەترسی هەن پێویستە لە لێکۆڵینەوەی دیاردەی زاڵ بوونی زانست لە بیری ڕۆژئاوایی دا ئاگاداریان بین:

**یەکەمیان:** دەستەوسانی زانست لە بانگەشە خراوە ڕووەکەی و پاشەکشەی لە ویستەکانی تا شوێنی ئاین بگرێتەوە یان بەرنامەیەکی تەواو پێشکەش بە ژیانی مرۆڤایەتی.

**دەووەم:** دەستەوسانی لە جێبەجێ کردنی بیردۆزە ماددیەکان بەسەر زانستە مرۆییەکان و ئاشکرا کردنی جیاواز بە قووڵەکانی نێوان زانستەکان و فەلسەفەکان. مەترسیدارترین شتێکیش توشی زانست بوو پەرتبوونی بوو لەنێوان ئاراستەی عەقڵی و ئاراستەی ئەزموونی دا.

گیانی سەرکەشی و خۆبەزلزانی بەسەر بیری ئەوروپادا زاڵ بوو بەهۆی پێشکەوتنی زانستە ماددی و پیشەسازیەکانی ناو ئەوروپاوە، ئەمە وایکرد هەست بکات بە دەسەڵاتداری و خۆسەپێنی بەو جۆرەی بوو بە هۆی دەرکەوتنی چەمکی قورسکەری ماددی کە دەڵێت لە جیهان دا تەنها مادده و یاساکانی گەشە پێدانی هەن و عەقڵیش بەرزترین ئەنجامی ماددەو جیهانە، ئەمەش خۆبەخۆ و بە ڕێکەوت بووە.

مەترسی گەورەی دیدی بانگخوازانی ماددیگەرایی ئەوە بوو فەلسەفەکان بەرهەمی زانستن و دەکرێ بەرنامەی وشکی ئەزموون بسەپێنێت بەسەر زانستە مرۆییەکان و مێژوو و هی تریش دا.

هەروەك بیردۆزەکانی ڕێکەوت و خۆسەپێنی و حەتمیەت بزاڤی بەردەوام و گەشەسەندنی ڕەها و بانگەشەی بەرچاوی ئەوەی سروشت دروست بووە. هەموو ئەمانەی قۆستەوە کە هەموویان نکوڵین لە چەمکی خودایی سەبارەت بە پەیوەندی نێوان بوون و کۆمەڵگە و مرۆڤ و دژی فیترەتی مرۆیی و سروشتی نیزامی گشتگیری هەموو ئەو جیهانانەن.

بەڵام خێرا زانست خۆزلزانی خۆی نیشان دا و دەرکەوت لە هەموو مەیدانێکی زانستی ماددی یان زیندوویدا بڕێ ڕاستی هەیە کە دەکرێ ڕاڤەی هەموو جیهانی پێ بکرێ.

نکوڵی لە خوای گەورە و بەرزراگیری ماددە و سروشت بەڵگەیە لەسەر کەمتەرخەمیەکی زۆر لە دەورەدانی هەموو مەنزومەی کەونی. هەر دەبێ یاساکانی فیترەتی پەیوەست و تەواو گشتگیری مرۆڤ و بوون گەندەڵی دید و خۆبەزلزانی زانست لە بانگەشە گشتیەکەیدا ئاشکرا بکەن.

هەر دەبوو لەبەردەم ئەو بیردۆزەدا پاشەکشە بکەیت کە بیرکاری کلیلی بوونە یان فەلسەفەی ماددی دەتوانێ ڕێبازی ژیان و نیزامی کۆمەڵگە ببەخشێ یان جیاکاری نێوان بەهاکان دەکرێ کاروبارەکانی بە سروشتی لەگەڵ دا بڕۆن، ئەمە واتە بێبڕوایی بە ڕێبازی خوایی و نکوڵی لێکردنی ﴿وَلاَ يَزَالُ الَّذِينَ كَفَرُواْ تُصِيبُهُم بِمَا صَنَعُواْ قَارِعَةٌ أَوْ تَحُلُّ قَرِيباً مِّن دَارِهِمْ حَتَّى يَأْتِيَ وَعْدُ اللّهِ﴾

دواتر پیاوانی زانست کەوتنەوە دووبارەکردنەوەی حساباتی خۆیان لەسەر بنەمای ئەوەی ئەرکیان سنوری لێکۆڵینەوە لە ڕوخساری شتەکان تێناپەڕێنێ و زانست ناتوانێ کاکڵەی ژیان و بوون چارەسەر بکات. شێوەیەکی تری مەعریفە هەبوو کە بەبێ ئەوە نەدەکرا لە ژیان تێبگەیت کە ئەویش ئایین بوو، بەڵام ئەو ئایینە تاکە ئەوان دەیانزانی بەڵکو ئایینی حەق بە سەرچاوە صەحیحەکانیەوە.

هەروەك ئەو بیرۆكەیە تێكشكا كە دەیوت شێوەی زانستی تاكە شێوازی سەركەوتووە بۆ بە دەست هێنانی مەعریفە لە حەقیقەت دا ئەو شێوازەش شێوازی قۆناغی ئەو سەردەمە- سەركەوتووە، بەڵام شێوازێكی گشتگیر نەبوو بۆ هەموو سەردەمەكان.

ئەو گورزە كوشندەیە بەرامبەر خۆگەورەزانی ئەوانە بوو كە دەیانوت شێوە زانستی تاكە شێوازی سەركەوتووە بۆ بەدەست هێنانی مەعریفە و لەمڕۆ بەدوا هیچ پێویست بە ئایین ناكات، بەڵام بە زیاتر ڕوون بوونەوەی مەسەلەكان دەركەوت ڕێبازی گشتگیری ئیسلام كە زانست و عەقڵی لە لایەكەوە كۆكردووەتەوەو لە لایەكی تریشەوە ڕێبازی مەعریفە و گیانی كۆكردووەتەوە ڕاسترین شێوازە.

دەیان زانای دیار بەوپەڕی متمانەوە ڕاستیەكیان ڕاگەیاند كە واتای ئەوە بوو زانست تەنها مەعریفەیەكی جوزئی حەقیقەتی پێشكەش بە خەڵك كردووە و لەسەرمانە بۆ ئەو مەبەستە گۆڕانێ نەكەین، گۆڕینی هەموو شتێكیش دەكرێ زانست لێی بێ ئاگا بێ كەلە خەیاڵاتە، ئەمڕۆ هاوارێ بەرزبووەتەوە كە زانست سنوری هەیە و ڕاستیەكەشی ئەوە دەگەیەنێت زانست تەنها مەعریفەیەكی جوزئی لە حەقیقەتی گەورە پێشكەش كردوین و بەشەكانی تری حەقیقەت دەستەوسانی زانست نیشان دەدەن. لێرەوە بەهای حەقیقی ئایینی حەق دەردەكەوێت.

زانایان ڕایانگەیاند (ئەو سەردەمە تەواو بوو كە تیایدا زانست كرابوو بەخوا) سەردەمی بتپەرستی زانستی كە مرۆڤی زەلیل و زەبوون كردبوو تەنها بە شوێنكەوتەیەكی بێدەسەڵاتی یاسا و بیردۆزەكان هێشتبوویەوە، ئەو ڕاگەیاندنە دوای شەست ساڵ ڕووی دا هەر لەو كاتەوەی تندل لە بلفاست ڕاشكاوانە وتی تەنها زانست دەتوانێ چارەسەری هەموو كێشە بنەڕەتیەكانی مرۆڤ بكا. دوای بیست ساڵ برتراند راسل وتی سەقامگیری مرۆڤ ناكرێ ئێستا بنیاد بنرێ مەگەر لەسەر چەند بنەمایەكی

پتەو کە گەندەڵی و خراپە دزە نەکاتە ناویان، هەموو ئەمانە دارمان، چونکە ئەو تەنها ڕاستیەی کە ئەوان پشتیان پێ دەبەست ماددەو جوڵە بوو، بەڵام ئەو بیردۆزەی باسی هەوڵی چواندنی سروشت دەکات بە ماددەو جوڵە شکستی خوارد دوای ئەوەی دەرکەوت ماددە دەگۆڕێت بۆ وزە و وزەش دەگۆڕێت بۆ ماددە.

لە دیدی ئەوان دا (منول و ڕاسل و داروین و مارکس و دۆرکایم) زانست بتێ بوو کە تەوافیان دەکرد، بەڵام دوای چەند دەیەیەك بیروباوەڕە کۆنەکان کەوتن و حەقیقەتەکان دەرکەوتن و ڕوون بوویەوە زانست هەموو شتێ نیە و کلیلی هەموو بوونی بەردەست نیە و گەورەترین بیرکای زانی جیهان ناتوانێ پێمان بڵێ عەقڵی چۆن دەتوانێ گەورەیی یان تەواوکاری نێوان ژمارەکان دەکات. ئەم ڕاستیانە دوای ئەوە هاتن کە درۆکان چاوی گەنجانی چەند نەوەیەکیان داپۆشیبوون و دابوویان لە ئایینیان و لەخشتەیان بردبوون. سۆلیڤان لە کتێبە نوێیەکەی دا ئەوەی ڕوون کردۆتەوە و دەڵێت ئەو مۆڵ خواردنە گشتگیرەی زانست و گۆڕانەوە چاوەڕوان نەکراوە دوای ئەوەی چاوی چەند نەوەیەکی داخست بوو دەرکەوت زانست چەند ڕاستیەکەی کۆتایی بێ کەموکورتی نین کە جێی مشتومڕ نەبن.

دکتۆر عیمادەدین خەلیل کە ئەو دەقانەی وەرگێڕاوە دەڵێت: لە بوون دا چەند وزەیەکی هەڵگیراوی زۆر هەن کە کارەباو ناوك دوو ئاماژەی ئەوانن، مرۆڤ دەبێ هەنگاو بنێ بۆ ئاشکرا کردن و بەدواداچوونی زیاتر، هەر کەس لە قورئانی پیرۆز دا ئەو ئایەتانە بخوێنێتەوە کە باسی بەگەڕخستنی وزە سروشتیەکان لەلایەن سولەیمانەوە (علیه السلام) دەکەن دەزانێت چۆن ئەو بەکار خستنە وەك خزمەتێکی تەواو گەورە بووە و قورئانیش هاتووە و چاو و هۆشی خەڵك دەکاتەوە بەرامبەر بە ئەوە وزە و توانایانەی لە بوون دا هەن، زانا گەورەکانیش بەردەوام لە سەرسەختی وئالۆزیەکان دەوەستن و کاریگەرن بە لایەنەکانی کاریگەری کارەبا و ئاماژەکانی کاری پێکهاتە و

ماهیـەتی، کەچـی کـەس هیـچی لێ نازانـێ، زانـستیش سـەری دەلـەقێنێ و خـۆی داوە بەدەست واقیعەوەو دوای ئەوەی قۆناغی توندی هەرزەکاری بڕی بڕوای هێنا کە زانینی فیزیایی جەستەکان تەنها خەیاڵێکی ناو خەیاڵانە.

ئەمە لە ڕوانگەی زانستەوە، بەڵام مەسەلە گرنگترەکە ئەوەیە فەیلەسوفان پـشتیان بەستووە بەو زانیاریە کز و لاوازانەی کە زانست پێشکەشی کـردوون تـا لـە بنـەڕەت دا لەدەستی دەرباز بن و لەسەر ئەوە فەلسەفەی ژیـان و ئایـدۆلۆجیاکانیان بنیـات بنـێن. ئەمەش سەرکەشیەکی زۆر گەورەیە چونکە خێرا ئـەو (سـەپاندنە زانـستیانە) هەڵـەکان نیشان دەدەن و بەدوای ئەوەدا دارمانی ئەو ئایدۆلۆجیا و ڕێبازانە دێ کە ئـەوان وایـان دەزانی بە نەمری هەمیشەیی دەمێننەوە.

دکتۆر عیمادەدین خەلیل ئەوە نیشان دەدات و دەڵێت: چەند فەیلەسوف و ئەدیبێك هەوڵیان دا لەسەر بەخششەکانی زاننست پاڵ بدەنەوەو وە ئەوەی ڕاستی بـێ گومـانی دابەزیوی ئاسمان بن و لەسەر ئەوەش فەلـسەفە و ڕای خۆیـان دا بنـێن تـا سـیفەتێکی زانستی بدەنێ، کاتێ زانست ئەگۆڕێ و بنەڕەت دەگۆڕێ ئیتر بیردۆزەکانیان یەك دوای یەك دادەڕمێن.

ئەمـە بـە زۆری لـە بازنـەی کۆمەڵایـەتی و ئـابوری و نـەفس دا ڕووی دا، ماددیـەتی مێژوویی کە بنەڕەتی بیردۆزەکەی لە سەدەی نۆزدەدا لەسەر بەخششی زانست وەسـتا بوو بە زانستی ناسراو بوو خێرا لە سەدەی دواتر دا بەتایبەت لـە دەیـەکانی کۆتـایی دا بەر چەندین لەرزەی سەخت کەوت، چونکە ئەو بنەڕەتەی لەسەری وەسـتا بـوو بـەرەو بادانـەوەو کـەوتنی هەنـدێ لایـەنی دەچـوو. ئەگـەر نـەوەی تاقیگـە و هەڵـسوکەوتی ئـەزموونی لەگـەڵ مـاددە و بەرچـاویەکان و جەسـتەکان دا دان بنـێن بـەوەدا کـە بڕیارەکانیان کۆتا نین و ناتوانن بیبڕن سەرەتای ڕێیان بۆ حەقیقـەت نـەبڕیوە جا ئـەو ئـەدیب و فەیلەسـوفانە لـەکوێ کـە نـە چـوونەتە تاقیگـە و ئـەو دیاردەیـان ئـەزموون

نەکردووە کە باسی کۆتایی و چەسپاوی و بەردەوامی یاساکانیان دەکات ئەوە ئەو بانگەشە بەرچاوە دیالیکتیە بوو کرۆکی شتەکان و یاساکانی گەشەسەندنی ججیهانی دەزانی. ئەوانە زۆر لەو زانا ئەزموونیانە لەخۆبایی تر بوون کە گەڕابوونەوە بۆ ئەو یاسا سروشتیانەی کە گەرمی و جوڵەو تیشك و هەرشتێ دەگرنە دەست کە لە جیهانی ماددەدا هەیە هەر لە کارەبا و ناوك و گەردیلە ئینجا بینیان یەك یاسایان هەیە کە ئەویش هەڵە و پشت گوێ خستنە.

ئەوەتا هیزن برگی خاوەنی بیردۆزەی هەڵەی کۆمەڵایەتی لە یاساکانی سروشت دا دەڵێت:

دوو ئەزموون لە هەر یاسایەکی زانستی سروشتی دا بەیەك ئەنجامی وا ناگەن کە ئەزموون کراو بە وردی پێی دەگات. بەو جۆرە ڕاستیەکان غروری زانست دەشکێنن، سەبارەت بە بانگەشەی ئەو فەیلەسوفانەی زانستیان کردووەتە بنەڕەتی بیری ماددی خۆیان ئەوا لە باسێکی تایبەت دا بەرەنگاری دەبینەوە.

## *مەسەلەی حەتمیەت:

یاسای هۆکارێتی تەواو بەردەوام وەك یاسایەکی سەرەکی بواری زانست بۆ ماوەیەکی زۆر کارا بوو، ئەو یاسا حەتمیەتەش ئەمڕۆ لە شوێنی دا یاسای نا حەتمیەت هەیە. زانست گەیشتە یاسایەك کە هیچ ئەنجامێکی کۆتایی نیە و سەردەمی پاڵدانەوەی یەکجارەکی لەسەر چەند ڕاستیەکی دیاری کراو کۆتایی هات و بیروباوەڕێکی زاڵ شوێنی گرتەوە کە بەرەبەرە فراوان دەبێ.

بۆ نموونە ماددیەتی دیالیکتیکی لە چەند لایەنێکەوە بنیادی خۆی لەسەر بنەڕەتەکانی بەخششی زانستی سەدەی نۆزدە دامەزراند، ئەو بنەڕەتانە گۆڕان و زۆربەی ئەو بەخششانە گۆڕان، بەردەوام شوێنکەوتوانی ڕاڤەی ماددی بە ڕاستی

وەسفیان دەکرد، ئەوەش سەبارەت بە ڕاڤەی ماددی دەوترێ دەکرێ سەبارەت بە زۆربەی بیردۆزە فەلسەفی دەروونی و کۆمەڵایەتیەکان بوترێ. زیاتر ئەدەب و هونەرەکان لەسەر ئەو بنەڕەتە گۆڕاوانە سەرپێ کەوتبوون. دیارە ئەو دیاردە ناوکیەش وەرگەڕایەوە بەڕووی ئەو هۆکارێتیەدا کە زانایان لەبازنەی فیزیادا پشتیان پێوە دابوویەوە و فەرزکردنێکی بنەڕەتی لە زانستەکان دا پێکهێنا بوو.

جۆرێ لە پەیوەندیە ناوکیەکان خەریك بوو شوێنی ئەو یاسا حەتمیەی دەگرتەوە کە توشی داکەوتن ببوو، ئەگەری چی خودی پێکهاتەی ماددی-ناوکی بەرەو ئازادی سنوری حەتمیەت تێدەپەڕێنێ، ئیدی چۆن دەبێ ئێمە ژیانی مرۆیی لە شێوە تاکەکەسی و کۆمەڵیەکەیدا ملکەچی جۆرێ لە حەتمیەتی گوێ کەڕ کردوو بکەین. واتای ئەو گۆڕانەش ئەوەیە جۆرێ لە نزیکی نێوان سروشت و ئەودیو سروشت و ئامادەو نائامادە و ڕۆح و ماددەو بەند و ئازادی دەردەکەوێ. بەخششەکانی زانستیش لەگەڵ ڕاستیەکانی ئاینن دا لە جەرگەی بارێك دا بەیەك دەگەن و بەربەستە ماددیەکان دادەڕمێنن و ئازادی دەگاتە لوتکەی تێکەڵی ئەتۆمی. کاتێ مرۆڤ دەبێتە گەورەی جیهان و جێگری خوا لەسەر زەوی دا ئازادانە دەوەستێ تا هەڵسوکەوت بکات بەو سروشتەی کە بۆی گونجاو کراوە لەبری ئەوەی وا هەڵسوکەوتی پێ بکات کە فەلسەفە حەتمیەکانی سەدەی ڕابردوو باسیان دەکرد.

سۆلڤیانن دەڵێت: زانست گەیشتە قۆناغی مەترسیدار، ئەو قۆناغەی تیایدا ماددی دەگات بە ڕۆحی. ئەمەش لە گونجان و تەبایی و گونجانی مرۆڤ لەگەڵ سروشت دا دەبێ.

زانست لەیەکلاییەوە گۆڕا بۆ ئەگەری. ئەمەش لە چەندین مەسەلەی وەك ماددیەتی جیهان و قبوڵ نەکردنی غەیب یان ئەودیو مادده وەك دەڵێن (جیهان بەتەواوی چەسپاو یەکلای کردەوە جگە لە مادده هیچ شتێ نیە لە جیهان دا جیهانی غەیب و ڕۆژی دوایی، ناکرێ ئەوانە بوونیان هەبێ کاتێ هیچ شتێ جگە لە مادده نەبێ) ئەم ڕایە شکستی خوارد و زانست ئاشکرای کرد جیهانێکی شاراوە هەیە کە شتەکانی بۆ دەچن و لێوە دێن دوای ئەوەی بیردۆزەی مادده و وزە شکستی خوارد و ئەوە چەسپ مادده دەگۆڕێ بۆ وزە و وزەش دەگۆڕێ بۆ مادده.

## *مەسەلەی بێلایەنی و لایەنگیری زانست:

لە ساڵانی کۆتایی دا ئەو مەسەلەیە چارەسەر کرا کاتێ لایەنگری زانست ئاشکرا کرا، جا ئەو زانستەی کە ڕۆژئاوا پێشکەشی دەکات زانستێکی ڕۆژئاواییە کە لە چوارچێوەی چەمکی سەرمایەداری و ئایدۆلۆجیای لیبرالی دا دەجولێتەوە. هەروەها زانستە کۆمەلایەتیە ڕۆژئاواییەکان هەوڵیان دا چەند چەمکێ بسەپێنن کە خزمەت بە سەرمایەداری و قەڵەمڕەوی داگیرکاری بکەن، هەروەها زانستی کۆمەلایەتیفرۆیدی و بیردۆزەی داروینیان بەکاردەهێنا لەپێناو ئەو ئامانجەدا. هەروەها بیردۆزەی ڕەگەزەکان کە ڕۆژئاوا دەیویست بڵێ چەند ڕەگەزێ گەورەو چەند ڕەگەزێ ژێر دەستە دەبن، هەروەها باسی بانگەشەی ڕەگەزی سپی ژیارساز ز دەست ڕۆیی بەسەر ئەو ناوچانەدا کە کۆگای کەرەستەی خاون. باسی چەمکی هەڵسوتی دوو ڕەنگە بۆ قۆستنەوەی دڕندانەی بیردۆزەکانی داروین و جۆینیۆ و کەسانی تر.

هەروەها ئەوەی بە زانستی ئەنسرۆپۆلۆجیا یان زانستی مرۆڤ ناو دەبرێ لەسەر بنەمای خزمەت بە قەڵەمڕەوی بیانی دانرا. هەندێ شارەزای داگیرکەر ڕۆڵی مێژوییان هەبوو لە ئاراستەی قۆرخکاری گەلانی جیهانی ئیسلامی دا، ئەمەش لەژێر دروشمی

پێشکەوتن و گرتنەبەری مەسەلەی مرۆڤی بەزیو. هەروەها لێکۆڵەران ئاماژە دەدەن بە خودی مێژووی زانست کە ئەفسانەی بێلایەنی ناهێڵێ، چونکە ڕاستی زانستی ڕاستیەکی ڕەها نیە بەڵکو لەسەر چەند ئەگەرێکی گۆڕاو و زانیاریەکی دەستکاری کراو وەستاوە. ئەو ئەگەرە زانستیانەش پەیوەندییان هەیە بە چەند سەرەتایەکی دیاری کراوی کۆمەڵایەتی و سەرەتایەکی گۆڕاوەوە، لە نێوەندی جەنگی جیهانی دووەم دا بیانوویان دەهێنایەوە بۆ پیشەی کۆمەڵایەتی زانست، ئیدی زانایانی فیزیا (زانستە سروشتیەکان) دەبینین بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ پەیوەست بوون بە باسی خۆ پڕ چەك کردن و پرۆژەی تەقینەوەی ئەتۆمی لە ئەمریکا و تەقاندنەوەی لە هێرۆشیما و ناکازاکی و کە بەڵگەی بێلایەنی زانست بوو، هەروەها پەیوەندی لێکۆڵینەوە زانستیەکانی ناو وڵاتانی ڕۆژئاوا بە دامەزراوە پیشەسازیەکانەوە، خودی سەرەتاییەکانی لێکۆڵینەوەی زانستی تا ئاستێکی بەرچاو لەلایەن دامەزراوە پیشەسازیەکانەوە دیاری دەکران، جا دەستکەوتی دارایی بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ پەیوەست بوو بە ئەولەویاتی لێکۆڵینەوەوە. پێویستی کۆمەڵگە جڵەوی بەکارخستنی زانستی لەدەست بوو. ئەوەش ئەولەویاتی لێکۆڵینەوەی دادەنا، ئەگەر ئەمە لە ڕۆژئاوا دا بوو بێ ئەوا لە ڕوسیا دا زیاتر شوێنکەوتەی مەزهەبی مارکسی و خزمەتی ئەو ڕەوتە بوو.

دەبینین مارکسیەکان هێرشیان دەبردە سەر زانستە کۆمەڵایەتیەکان و زانستی دەروونی ڕۆژئاوایی و بەزانستی سەرمایەدارییان دادەنان. سەبارەت بە بیردۆزە مارکسیەکانیش هەمان شت بە پێچەوانەوە ڕوو دەدات. دەردەکەوێت هەردوو ڕێبازەکە لەسەر کارێکی سەربەخۆ نەوەستاون بەڵکو لە خزمەتی ئامانجێکدان، هەروەها ڕێبازی زانستە ئەزموونیەکانیش خزمەت بە ئامانجی شیوعیەت دەکات زانستیش لایەنگرە. ئەو کاتە تێپەڕیوو کە بە بیردۆزە فەلسەفیەکان دەوترا زانست و ئەوەش پەیوەندی بە

مرۆڤەوە هەبوو پێی دەوترا زانست بەو واتایەی ملکەچی زانستە، ئەوەش دەخاتە ڕوو کە زانستە مرۆییەکان ناکرێ ملکەچی ڕێبازەکانی مادده بن.

# باسی هەشتەم

## ( دارمانی بیردۆزەكان )

گۆڕانكاریەكانی كۆمەڵگە و ژیارە ڕۆژئاواییەكان دارمانی چەندین بیردۆزەی ئابوریو كۆمەڵایەتی و سیاسییان ڕایگەیاند بیری ڕۆژئاوایی بۆ بنیادی كۆمەڵگەی خۆی دایمەزراندبوون و دیویست ئەو بیردۆزانەش بەسەر كۆمەڵگەی ئیسلامی دا بسەپێنێ.

بیردۆزەی داروین لە كۆنگرەی نێودەوڵەتی ئیعجازی پزیشكی لە قورئان و چەندین كۆنگرەی تردا كە زانایانی بیۆلۆجیا دەیانبەستن بە بەڵگەی زانستی دارماو زانایان كەموكورتی بنەڕەتی بیردۆزەكە و بوونی ئەوەی پێی دەوترێ ئەڵقەی نا ئامادە كە داروین لە ئەگەرە هەڵەكەی دا سەبارەت بە سەرهەڵدانی مرۆڤ لە مەیمونەوە نەیتوانی ئاشكرای بكات هەموو ئەوانەیان خستنەڕوو.

لە ساڵانی كۆتایی دا دوو بیردۆزەی سەرمایەداری و ئیشتراكیەتیش دارمان و هاواری ڕۆژئاوا بەرزبوویەوە بۆ داوای نیزامێكی نوێی ئابووری دوای ئەوەی نیزامی ئەوكات خراپ و گەندەڵ دەرچوو، هەروەها بیردۆزە خوێنراوەكانی زانستە كۆمەڵایەتیەكانیش دارمان و دەركەوت فەلسەفەی ساختەن و بنەرەتەكانیان زادەی تلموودن، چ لە بواری ئەخلاق یان دەروون یان كۆمەڵایەتی دا.

هەروەها لە ئاسۆی كۆمەڵگە ئیسلامیەكان دا بیردۆزەی هەرێمچێتی و نەتەوایەتی ڕۆژئاوایی دارما و دەركەوت تەنها پیلانێكە بۆ لەناوبردنی یەكبوونی كۆكەرەوەی ئیسلامی تا داری خۆیان بچێنن. بیردۆزەی داروین كە سەرچاوەیەك بوو بۆ بیری ماددی ساختەی خۆی ئاشكرا كرد، زانست و دۆزینەوەو هەڵكۆڵراوەكانی ئێسك و پروسكەكان بیردۆزەی پەیوەندی نێوان مرۆڤ و مەیموونیان تێكشكاند و ئێسكەكان

سەربەخۆیی هەر ڕەگەزێكیان نیشان دەدا كە خوای گەورە دروستی كردون. مرۆڤ هەر لە یەكەم ڕۆژەوە ڕێك وەستاو بەسەر زەوی دا چووە.

هەروەها بیردۆزەی داروین سەبارەت بە گەشە و نەشونما داڕما، ئەو بیردۆزەی دەیوت بنەڕەتی ژیان كوتلەیەكی هیلامی بووە كە لە دەریاوە هاتووە، لێكۆڵینەوەكان بە بەڵگەی زانستی هەڵەی ئەو بیردۆزەیان سەلماند كە بەردەوام بۆ دەیان ساڵ زاڵ بوو بەسەر بیری جیهان دا.

بیردۆزەی داروینی دەرفەتی نەدەدا بەو ویستە ئازادەی كە لامارك باسی دەكرد، بۆیە جولەكە پشتگیرییان كرد و بۆ سەپاندنی جەبریەت كە بیری ئەوانی دەنواند كەوتنە بڵاوكردنەوەی، فرۆیدی دەرفەتی نەدەدا بە ویستی پێشكەوتنی مرۆیی كە كەسانی تر دەیانوت، بۆیە جولەكە پشتگیری ئەمەش بوون بۆ سەپاندنی چەمكی فرۆید سەبارەت بە جنس تا بیسەپێنن بەسەر دەروون ناسی دا. ماركسیەت دەرفەتی نەدەدا بەو پێناوانەی تر كە جڵەوی ڕێڕەوی مێژووییان لە دەستە، بۆیە جولەكە بۆ سەپاندنی ڕاڤەی ماددییان پشتگیرییان كرد، دەریشكەوت بە تەنها جنس سەرچاوەی هەڵسوكەوتە مرۆییەكان نیە و چەند پێناوێكی تریش هەن.

ئینجا تەقینەوەی ناوكی هات وەك هەڵەی بیردۆزە ماددیەكان كە نكوڵیان لە غەیب دەكرد، چونكە ئەوەی زانستی ئەزموونی ئەمڕۆ دەیڵێت ئەوەیە كە جیا لە جیهانی بینراو جیهانێكی تر هەیە كە پەیوەندی هەیە بەم جیهانەی ئێمەوە.

هەروەها خراپی بیرۆكەی گەشەسەندن ڕەها دەردەكەوێت كە چەمك و واتای خۆی لە بیردۆزەكانی داروین و سبنسەر و وتەی گۆڕانی ڕەهای هیگلەوە وەرگرتبوو و كە دوای بیردۆزەی چەسپاندنی ڕەهای ئەرستۆ هیگل گۆڕانی ڕەهای هێنا، هەردووكیشیان جیان لە چەمكی ئیسلامی كە چەسپاو و گۆڕانەكان پێكەوە كۆدەكاتەوە.

بیردۆزەی داروین کە تا ئێستاش لە خوێندنگە و زانکۆکان دا دەخوێنرێ خراپی و ناتەواویەکەی دوای ئەوە دەرکەوت کە تاقیکردنەوە و هەڵکۆڵینەکان ئەوەیان سەلماند هیچ پەیوەندیەك نیە لەنێوان ڕەگەزی مرۆیی و ڕەگەزە ئاژەڵیەکان دا و پەیوەندی هاوبەشی نێوان دوو ڕەگەز نیە. دکتۆر ڕۆناڵد جۆنسۆن مامۆستای زانستەکانی ڕەگەزە مرۆییەکان لە ساڵی ١٩٧٤ ڕیگەیاند ئێستا زانایان دەتوانن دوای کۆمەڵێ لێکۆڵینەوە و تاقیکردنەوەی چەندین ساڵە بڵێن بە ڕێژەی ٩٩،٩ مرۆڤ لەسەر دوو قاچی بەڕێکی چووە هەر لەو کاتەوەی لەسەر زەوی بووە، واتە مێژووە مرۆییەکەی هەر لە زیاتر لە سێ ملیۆن ساڵ لەمەوبەر. هەروەها چەند ئێسکێ دۆزرانەوە کە دەگەڕێنەوە بۆ پێنج ملیۆن ساڵ لەمەوبەر، هەموو ئەمانەش ئاماژە بەوە دەدەن مرۆڤی کۆن ڕێك وەستاوە هەر لە سێ ملیۆن ساڵ لەمەوبەرەوە، جان بیفتۆی زانای فەرەنسی و سەرۆکی کۆمەڵەی زانستی فەرەنسی دوای ئەوەی نزیکەی نیو سەدە لێکۆڵینەوەی لەسەر بنەڕەتی مرۆڤ ئەنجام دا وتی: مرۆڤ هیچ پەیوەندیەکی نیە بە هاوڕەگەزی لەگەڵ مەیموون و هەموو لێکچووەکانی نێوان مەیموون و مرۆڤ بەشی ئەوە نین بوونی یەك بنەڕەت بۆ مرۆڤ و مەیموون بچەسپێنن. بۆیە ئەو ئەگەرە بەرپەرچ دەداتەوە چونکە بڕوای وایە مرۆڤ لەسەر زەوی دا بەڕێکەوت دەرنەکەوتووە، بەڵکو کۆتا ئامانجە بۆ ڕێکخستنی بوون، بۆیە بە تەواوترین شێوە هاتووە..... هتد.

دکتۆر موحەممەد ئەحمەد مسیر دەڵێت: بیردۆزەی گەشەسەندن لەسەر ئەو یاسای هەڵبژاردنە سروشتیە وەستاوە کە دەڵێت ژیان هەروا و بەڕێکەوت سەریهەڵداوە (داروین) بانگەشەی بەڕێککەوتیش لەسەرهەڵدانی ژیان دا وتەیەکە زانست لێی دوورە و ڕاستیەکانی بوون نکوڵی لێ دەکەن، چونکە گەر بڕوانیتە ئاسمان و زەوی و ئاژەڵ و

باڵندە و دەریا و بەرهەم و کشتوکاڵ هێندە بەسە تا ئەو درۆیە تێکبشکێم ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّ اللَّهَ هُوَ الْحَقُّ وَأَنَّ مَا يَدْعُونَ مِن دُونِهِ هُوَ الْبَاطِلُ وَأَنَّ اللَّهَ هُوَ الْعَلِيُّ الْكَبِيرُ﴾ ئەگەریش مرۆڤ تەنها ڕەگەزی ماددی بوایە بە فەرمانی خوا ڕۆحی تیا نەبوایە ئەی چۆن ناتوانن یەك شانەی زیندوو ئامادە بکەن سەرەڕای ئەوەی دەزانن چۆن ڕەگەزە کیمیاییەکەی پێکدێ.

زانایان ئەوەیان ئاشکرا کردووە بیردۆزەی گەشە و نەشونما لەڕووی زانستیەوە نەچەسپاوە و هیچ ڕێگەیەکیش نیە سەلماندنی بە بەڵگە، ئەوانەش نەیاری بیردۆزەکەی داروین و بیردۆزەی فرۆیدن تیشکیان لەسەر نیە هەرچەندە زانایانێکی دیاری ئەو بوارەن. گراهام کانون مامۆستای وانەی ئاژەڵ سەبارەت بە داروین دەڵێت: سەرکەوتوویی کتێبی (أصل الأنواع) (بنەڕەتی شێوەکان) لەو هەڵخەڵەتاندنەدا بوون کە بەرووی دەروونی جەماوەردا کردیەوە و کتێبی تەواوی داهێنراوێکی گرنگی پێدراو بێ بەهۆی ئەوەی نادیار و ناڕوونە.

دکتۆر مۆریس بۆکای مەسەلەی دروست بوونی مرۆڤ لە نێوان مەسیحیەت و ئیسلام دا دەخاتە ڕوو و دەڵێت ڕۆژئاوا سەبارەت بە بنەڕەتی مرۆڤ زانیاری خۆی لە ڕێنماییەکانی ئینجیلەوە وەرگرتووە لە کاتێك دا لە جیهانی ئیسلامی دا دەبینین قورئان هیچی لەوە نەسرپیوەتەوە کە لە سێ کتێبە ئاسمانیەکەدا هاتووە بەڵکو ڕێنمایی تایبەت بە خودی مرۆڤی بۆ زیاد کردوون کە لە کتێبە ئاسمانیەکانی تردا نین، کاتێ پێشڕەوی زانستی دەستی پێکرد مرۆڤ پشتی بەست بەو زانیاریانەی کە لە تەورات و ئینجیل دا باس کراون بەڵام تەنها بەوەی ئەمڕۆ پێی دەڵێن بیرکردنەوەی زانستی یان تەنانەت بنەما یەکەمینەکانی دەبینین مرۆڤ گومان دروست دەکات. لێرەوە

دەبینین ئەوانەی لەو سەردەمەدا بە فەیلەسوفان ناسراون بێ دوو دڵی چەند بیردۆزەیەك دادەنێنن کە لەسەر چەند بنەمایەکی لاواز وەستاون. لە ڕۆژئاوادا بۆ یەکەمجار نەگونجانێ لەنێوان دەقی ناو ئینجیل سەبارەت بە چەسپان و گەشەسەندنی جۆرەکان لە ماوە جیاجیاکان دا دەرکەوت، لەوانەش مۆفۆن لە فەرەنسا و لامارك بە بیردۆزەی گۆڕان (سەرەتاکانی سەدەی نۆزدە) بەڵام لە هەموو گرنگتر داروین بوو کە لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەم لە بەریتانیا دەرکەوت و لە کتێبەکەی دا (بنەڕەتی جۆرەکان) کە بە گورزێ دادەنرێ بەرامبەر بە ئینجیل و بەڕای من ئەمەش ئۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە ڕای شوێنکەوتەکانی گەورە تر بوو لە نوسینەکانی خودی کاتێبەکە، چونکە خودی داروین لە باس و شرۆڤەی باری گۆڕانی جۆرێ بۆ جۆرێ سەرکەوتوو نەبوو خۆشی دانی ناوە بەوەدا.

بیردۆزەی داروین کە ئەمڕۆ بنەڕەتە چەسپاو و بەهێزە جیهانیەکان هەڵیدەوەشێننەوە خۆی لەخۆی دا زیاد لەوەی کە زانستی پێ تێڕامانی فەلسەفی بوو، جا لە کتێبەکەم دا (بنەڕەتی مرۆڤ کامەیە) وەڵامی زانست و کتێبە پیرۆزەکان، کەموکورتیەکانی بیردۆزەی داروین و شوێنکەوتەکانیم ڕوون کردووەتەوە سەبارەت بە بیردۆزەی گەشەسەندن. هەر لە سەرەتای کارمەوە بۆ لێکۆڵینەوەی پزیشکی ١٩٧٠ من لە نزیکەوە چاوم لەسەر هەر پێشکەوتنێکی زانستی بوو سەبارەت بە بنەڕەتی مرۆڤ، چونکە مرۆڤ بۆ بابەتێ کە بیەوێ بڕیاری لەسەر بدات پێویستی بە ڕێژەیەکی زۆر زانیاری هەیە، گەردوون زانەکانیش ئەوەیان پێیە. لە دیارترین تایبەتمەندانی ئەو بوارە بریتی بوون لە پرۆفیسۆر ب.جراس لە فەرەنسا ئەمڕۆش بیرێ زانیاری نوێی بەبایەخمان لا هەن کە لەسەر بیۆلۆجیای حەتمیەت و بیۆلۆجیای جوزئی وەستاون،

بەڵام بەداخەوە دەبینین هەندێ زانا بیردۆزەکانی خۆیان تەنها لەسەر بەڵگەی زانستی دادەنێن کەچی لە ڕاستی دا پێچەوانەی فەلسەفە تایبەتیەکەی خۆیانە.

هەڵەیە داروین و بیردۆزەکەی لەگەڵ بیردۆزەی گەشەسەندن بەگشتی پەیوەست بکەیت، چونکە جار هەیە کەسێ گەشەسەندن لە جیهانی ئاژەڵی دا قبوڵ دەکات بەڵام ئێمە لایەنەکانی تری بیردۆزەی کۆن و نوێی داروین بەرپەرچ دەدەینەوە. بەڵام پێویستە چی زانیاری لای زانایانی پەرەسەندن هاتووە بەرپەرچی نەدەینەوە، چونکە چەند ڕاستیەك هەن کە هیچ کەسێکی زانستخواز بۆی نیە بەرپەرچیان بداتەوە، بەڕاستی بە درێژایی سەردەمەکان گۆڕانێ بەسەر شێوەی مرۆییدا هاتووە بەڵام هەموویان لەگەڵ چەمکی دروست کردنی مرۆڤ دا کە لە سێ کتێبە ئاسمانیەکەدا هاتووە ناتەبا نین بەڵکو بە پێچەوانەوە قورئان ئەوەی باس کردووە و ناکرێ بۆ هەر بەڵگەیەکی زانستی ملە جیرێ بکرێ لەسەر ئەوەی خوا سەبارەت لە دروست کردن فەرموویەتی بەجۆرێ هەروایی یان بەڕێکەوت لە ژیان دا نیە و هیچ پەرەسەندنێ لە جیهانی ئاژەڵی دا نیە.

سەبارەت بە تەمەنی زەوی کە چوار ملیۆن و نیو ساڵە و تەمەنی مرۆڤیش یەك ملیۆن ساڵە (ئینجیلی لۆقا دەڵێت سەید مەسیح دوای شەست و حەوت نەوە دوای گەورەمان ئادەم (علیه السلام) هاتووە ئەوەش ئەمرۆ دانی پێدا نەنراوە).

زانایانی بیۆلۆجیا دەڵێن پێش پێنج ملیۆن ساڵ لەمەوبەر زیندەوەری زیندوو دەرکەوتوون، مرۆڤی (جاوە)ش دەرکەوتووە کە ئاگری بەکارهێناوە و مەزەندەی پێنج سەد بۆ سەد و پەنجا هەزار ساڵ لەمەوبەری بۆ کراوە. ئەو گۆڕانەی لە ماوەی سەدەکان دا بەسەر ڕەگەزی مرۆییدا هاتووە بە واتای تەواو جوانی و دروستی

پێکهاتەی ڕەگەزەکان نازانێ، بەڵکو لێکۆڵینەوەی پەرەسەندن لە جیهانی ئاژەڵی دا چی فێربوون دەکرێ بە گۆڕانی زیندەوەری هەروایی کۆرپەلەکان ڕاڤەی بکەین.

بە پێداچوونەوەی هەموو ڕاستیە زانستیەکان دەبینین:

- بیرۆکەی خوای گەورەی دروستکەر کە ڕاڤەی دروست و پڕاوپڕمان پێ دەبەخشێ و لەگەڵ مەنتیق دا دەگونجێ وەك لە سێ کتێبەکە ئاسمانیەکان دا هاتووەو جیهانی مەوزوعیش دەبێ ئەو ڕێنماییانە قبوڵ بکات، ئێمەش بەشی تایبەت بە دروست بوونی مرۆڤ لە ئینجیل قبوڵ دەکەین. سەبارەت بە قورئان ئەوا من زۆر کاریگەر بووم بەو زانیاریانەی لەسەر مرۆڤ و بنەڕەتی مرۆڤ هاتوون. لە سورەتی ئەنبیا دا هاتووە ﴿أَوَلَمْ يَرَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَنَّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقاً فَفَتَقْنَاهُمَا وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاء كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ أَفَلَا يُؤْمِنُونَ﴾. کێ هەیە ئەمڕۆ نەزانن بنەڕەتی ژیان لە دەریاوە دەستی پێکردووە.

- قورئان ئاماژەی داوە بە گەشەسەندنی زانستی کۆرپەلە لە قۆناغی شێوە پێدانی مرۆڤ ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَاكُمْ ثُمَّ صَوَّرْنَاكُمْ ثُمَّ قُلْنَا لِلْمَلآئِكَةِ اسْجُدُواْ لآدَمَ فَسَجَدُوا﴾ (سورة الأعراف) ﴿الَّذِي خَلَقَكَ فَسَوَّاكَ فَعَدَلَكَ﴾ (سورة الأنفطار) ﴿ لَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ فِي أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ﴾ (سورة التين).

لێرەوە دەگەڕێمەوە بۆ وشەی (ماوەکان) وەك لە سورەتی نوح دا هاتووە و پێموایە بەوردی شیکاری قۆناغە جیاجیاکانی ئەو بوارە دەکات کە لێکۆڵەرانی زانستی کۆرپەلە دەیزانن.

لە سورەتی دەهردا هاتووە ﴿نحنُ خَلَقْنَاهُمْ وَشَدَدْنَا أَسْرَهُمْ وَإِذَا شِئْنَا بَدَّلْنَا أَمْثَالَهُمْ تَبْدِيلاً﴾ لە سورەتی ئەنعامیش دا هاتووە ﴿إِن يَشَأْ يُذْهِبْكُمْ وَيَسْتَخْلِفْ مِن بَعْدِكُم مَّا يَشَاءُ كَمَا أَنشَأَكُم مِّن ذُرِّيَّةِ قَوْمٍ آخَرِينَ﴾

ئەم دوو وێنەیە جەخت لەوە دەکەنەوە هەندێ کۆمەڵ نەماون و بەویستی خوا هەندێکی تر شوێنیان گرتوونەتەوە. ئیدی چی بەڵگەیەکی گەورەتر لەسەر گەورەیی خوا و مەجازی قورئانی و گەورەیی لە هەموو کات و شوێنێك دا؟!!.

# باسی نۆیەم

## (بیری ڕۆژئاوا: لە زانستەوە بۆ فەلسەفە)

لێکۆڵەران جیاوازی دەکەن لە نێوان زانست و فەلسەفەدا، چەمکی زانست کورت بووەتەوە کە زانستی ئەزموونی پەیوەست بە سروشت و بیرکاری و گەردون و شتانێکی تردا، سەبارەت بە بەخششەکانی عەقڵی ڕۆژئاوا لە بواری زانستە مرۆیی و کۆمەڵایەتیەکان دا ئەوا ناو نراوە فەلسەفە یان زانستە فەلسەفیەکان ئەمەش بەلادان و زێدەڕۆیی ناونراوە چونکە پەیوەندی هەیە بە زانست و بیردۆزە زانستیەکانەوە، لەسەر بنەمای ڕێبازی زانستی لە لێکۆڵینەوەدا دامەزراوە.

بەڵام کاتێ ئەو فەلسەفانە وەرگێڕدران و گوازرانەوە بۆ ئاسۆی بیری ئیسلامی وەرگێڕەکانی بانگەشەی ئەوەیان دەکرد ئەوانە زانستن و سیفەتی زانستیان هەیە لەڕووی ئەو قسە سەر شێوێنەرەوە کە دەڵێت ئەوانە ڕاستین و پێداچوونەوە قبوڵ ناکەن، ئەمە ئەو مەترسیە گەورە بوو کە ماوەیەکی زۆر ئوممەتمان پێی لەخشتە برا تا ئەوەی قوڵایی جیاوازی نێوان زانست و فەلسەفەیان بۆ ئاشکرا بوو و دەرکەوت ناکرێ زانستە مرۆییەکان ملکەچی پێوەری زانستە ماددیەکان ببن، دیارە جولەکە لە دوا دەیەکان دا هەڵگری ئالای زانستە کۆمەڵایەتی و مرۆیی و ئەنسرۆپۆلۆجیەکان و چەندێکی تر بوون و پەیوەستیان کردبوون بە بیردۆزەی داروینەوە لەپێناو بەدیهێنانی ئامانجی خۆیان کە بانگەشەی ئاژەڵبوونی مرۆڤ بوو، لەو ڕوانگەوە توانیان بیردۆزەی ئاژەڵبوونی مرۆڤی مارکسی لەڕووی خۆراکەوەو بیردۆزەی ئاژەڵبوونی مرۆڤی فرۆید لەڕووی ئارەزوو و غەریزەکانەوە بچەسپێنن.

بەڵام هەموو ئەمانە دواتر ئاشکرا بوون وەگ چۆن دیدی ناتەواوی لە خودی زانستەکان و فەلسەفەکانیش دا دەرکەوت. زانایانیش کۆمەڵێ ڕاستی زۆریان ئاشکرا

کردن کە زانست و فەلسەفەکانیان بەرەو پێداچوونەوە پاشەکشە لە خۆگەورە زانی و بانگەشەی نا بەرچاوی خۆیان بانگکردن، هەرچیەك پەیوەست بوو بە چەمکی پەرەسەندنی ڕەها و ڕێژە و جەبریەت و حەتمیەت و عەقڵانیەت و ماددیگەری و ڕاڤەی ماددی و بزاڤی بەردەوام و هەڵەکانی دیکارت لە جیاکردنەوەی زانستە عەقڵی و ئەزموونیەکان و جیاکاری فرۆید لەنێوان عەقڵ و جەستە و نێوان زانستە بیۆلۆجی و سایکۆلۆجیەکان هەموو ئەمانە ملکەچی ڕاستیەکان بوون.

ئەمڕۆ دەرکەوت کە زانست تەنها مەعریفەیەکی جوزئیمان پێ دەبەخشێ سەبارەت بە ڕاستی، بەرامبەر بەمە بەشەکانی تری حەقیقەت کەرتێکی تری مەعریفە پێشکەشمان دەکات کە بیرمان ناچێت ئەوە ئایینە. لە کۆمەڵێ نوسەر و ئەدیب و بیریار و فەیلەسوف هاودەم بە هەڵچوونی زانست و خۆگەورە زانینی دەرکەوت کە لە بەخشش و بنەماکانی زانستەوە یاسایەکیان دانا لەسەر ئەوە فەلسەفەی خۆیان دامەزراند تا مۆرکی زانستی پێ بدەن. ئەوە بوو بیردۆزە جیاجیاکانی بواری کۆمەڵایەتی و دەروون و ئابووریان پێشکەش کردن، بەڵام ماددیگەری مێژوویی خێرا لەو سەدەدا کەوتە بەر چەند لەرزەیەکی توند و ئەو بنەڕەتەی لەسەری دەڕوا بەرەو لاربوونەوە و کەوتن دەچوو.

ئەو مەزهەبە ماددیەی فەلسەفە هاوچەرخەکان لەسەری دامەزران بەر پێکرانێکی گەورە کەوت بەهۆی ئەوەی زانست چەند شتێکی نامادی دۆزیەوە کە دەبنە وزە و وزەش دەبوو بە ماددە، دواتر هەموو ئەو فەلسەفانەی لەسەر ئەو بنەما ماددیگەریە وەستابوون دەرکەوتن.

عیمادەدین خەلیل سەبارەت بە قسەکردنی لەسەر کتێبەکەی سولڤیان دەڵێت فەلسەفە و ئەدەب پایەی خۆی لەسەر زانست دانا و پێشتر دیلی بیروباوەڕ بوو، مەترسیدارترین هەڵە لەسەر ئەو ئەگەرە وەستاوە هەرچیەك زانست نایزانێ یان لێی

بێئاگایە بە هیچ جۆرێ بوونی نیە و هەڵوێستێکە تا ئێستا زۆربەی بانگەشەکەرانی زانستگەری لە وڵاتان دا لەسەر ئەوە دەڕۆن، ئەوانەی ئەرکی ڕاگەیاندنی جەنگی دژ بە غەیبیان لە ئەستۆی خۆیان گرتووە بۆ ئەوەی بزانن شوێنە کۆتاکانی ڕێکردەی زانست ئەو ڕاستیەی ئاشکرا کردووە خودی ماددە لە پێکهاتەی دا دیدێکی غەیبی لەخۆگرتووە.

مەترسیدارترین شتی فەلسەفەی ڕۆژئاوایی پەیوەستە بە ڕێبازی ژیان و کۆمەڵگەکان و مەسەلەی مرۆڤ و عەقڵ و جیاکردنەوەی ئایین لە دەوڵەت. بیردۆزەکەی داروین لە بنەڕەت دا سەرچاوەی بیری ڕۆژئاوایی بوو و بیرۆکەیەکیش بوو شکست و دارمانەکەی چەسپاوە، بەڵام بنەڕەتەکانی ئەم بیرە لەسەر ئەم بنەڕەتانە دامەزران:

١- چەمکی ماددی مرۆڤ (چەمکێ کە دواتر گەشەی سەند بۆ ڕوانین بۆ مرۆڤ وەك ئاژەڵێکی قسەکەری ملکەچی دوو ئارەزووی خواردن و جنس.

٢- چەمکی پەرەسەندنی ڕەها کە پێی وایە سەردەمی ئێستا زیاتر لە سەردەمی پێشوو گەشە دەکات.

٣- ڕێژەی ئەخلاق و پەیوەندی بە دۆخەکانەوە و گۆڕانی لەگەڵ گۆڕانی بارەکاندا.

٤- جیا بوونەوەی ڕەها لە دیدی خوایی و جێگرتنەوەی چەمکی سروشت لەبری وتەی خواو ئیمان بە ئەزەلیەتی ماددە و مانەوەی نەمری نیزامی بوون بەبێ کۆتایەك.

٥- ڕاڤەی ماددی بۆ مێژوو کە دابەشکاریەکی هاوبەشی نێوان ئایدۆلۆجیاکانە.

دەرکەوتنی بیردۆزەی مارکسی لە ئەنجامی ئەو زێدەڕۆییەی کە کۆمەڵگاکان لە دەسەڵاتداری بیردۆزەی سەرمایەداری دا توشی ببوون.

نامە و لێکۆڵینەوەکانی فەیلەسوفان کەم و کورت و ناتەواو بوو (بەڵکو لێکۆڵینەوەی زانایان خۆی لە بیردۆزەی ناتەواوی داروین دا دەبینێتەوە) سەبارەت بە دیکارت ئەوا هەڵە بنەڕەتیەکەی ئەوەیە بەشەکان شوێنی ڕاستیەکان دەگرنەوە، لەو ئامانجەدا

بیرەکـان ملکەچـی بـەها ڕاسـتیەکان دەبـن. هەڵـەی مـاوەڕانی دیکـارت ئـەوە بـوو لـە بیروباوەڕی دا پێی وابوو چالاکی ئەندێشە لەگەڵ یاساکانی جیهـان دا دەگونجـێ لەبـەر وتەکـەی ڕۆیـر ئـەدۆن کـە دەڵێـت: دیکـارت کاریگەریـەکی گـەورەی لـە عەقڵیـەتی هەمووماندا جێهێشتووە و مەترسیدارترین کاریگەریشی ئەوەیە کە من بە هەڵەی میتا فیزیقی یان هەڵەی ئەخلاقی ناو دەبەم کە بە جۆرێك داماڵینی ئیمان و دەست گرتنەوە لە داهێنانە لە ئەنجامی کەوتنە ناو خەیاڵی هەڵخەڵەتێنەری ئەو ورووژاندنە عەقڵیەوە.

هەروەها ئۆگەست کۆنت لە یاسای قۆناغەکان دا (ئایینی میتـا فیزیقـی– وەزعـی) هەڵەی کردووە چونکە قۆناغی ئایینی بە قۆنـاغی خورافـە دانـاوە و لەبـەردەم دیـاردە سروشـتیەکان دا سەرسـام وەسـتاوە و دیـاردەی هـەورە بروسـکە و هـەورە گرمـە بـە دەنگی خواوەندەکان وەسـف دەکـات کاتـێ خواوەنـدەکان لـە ململانـێ و تووڕەییـدان. یەکێ لە هەڵـەکانی ئەوەیـە ئیـسلام بانگـەوازێکی قۆناغیـە کـە ڕۆڵـی خـۆی بیینیـوە و کۆتـایی هـاتووە. ئۆگەسـت کۆنـت عـەقڵی تـەواو نـەبووە و هـەوڵی داوە لـە ڕووبـاری (سین)دا خۆی بخنکێنێ.

ئـەوەی جێـی سەرسـوڕمانە نوسـینەکانی ئۆگەسـت کـۆن بـۆ دژایـەتی کاسـۆلیکی لەلایەن شوێنکەوتووانیەوە بۆ دژایەتی ئیسلام بـەکار هـات لـەکاتێك دا جیـاوازی قـوڵ لەنێوان ڕێبازی مەسیحیەتی ڕۆژئاواو چەمك و واتاکانی ئیسلام دا لە بـوار جیاجیاکـانی بیرو ژیان و کۆمەڵایەتی دا بەدیدەکرێت.

سەبارەت بە نیتسە ئەوا فەلسەفەکەی لەسەر بنەمای کینـە و ڕق لێبـوون وەسـتاوە وەك بنەڕەتێك بۆ بنیادنانی سـۆپەرمان یـان مرۆڤـی بـالا، بـۆ ئـەوەی بگەینـە دروسـت کردنی مرۆڤی بالا دەبێ هـەموو شـتێ کـاول و وێـران بکـەین، بـۆ ئـەوەی ئـەو دروسـت کراوە نوێیەی دەمانەوێ دروستی بکەین، بـەڵام چـۆن دەکـرێ بـەبێ ڕق و کینـە شـتێ لەناوببەین، بۆیە دەبێ سەرەتا ڕق و کینەمان هەبێ تا ئـەوە پاڵنـەرمان بـێ بـۆ وێـران

کردن. نیتشه پێی وایه چاکه و لەخوا ترسان و خۆشەویستی ڕەوشتی کەسە لاوازەکانە. نیتشه نزیکەی بیست ساڵ لە شێتیەکەی دا بوو کە خەریك بوو دەچەسپا، چونکه لە ماوەی کۆتایی سلفس دا کە نەخۆشیەك بوو توشی بوو جەستەی نەدەوەستا، بەڵکو هۆشی مراند و بێ بەرگ و بێ دەنگ مرد و کەس باسی نەدەکرد. بەڵام دوای مردنی جولەکە کەوتە زیندووکردنەوەی فەلسەفە وێرانەکەی.

## *بیردۆزەی ماددیەتی جەدەلی:

مەترسیدارترین شتی بیردۆزەی ماددیەتی جەدەلی (دیالیکتیك) ئەوە بوو کە هیگل خستیە ڕوو و مارکس بیردۆزەکەی خۆی لەسەر بنیاد نا کە بیردۆزەی میتا فیزیقی هەڵدەوەشێنێتەوە (داننانی میتا فیزقیی بە بوونی غەیب دا) بەڵام ئەم پێی وایە سروشت لەباری گۆڕانی بەردەوام و نوێگەری نەوەستاوە و پەرەسەندنی بێ کۆتادایە بەپێچەوانەی بیردۆزەی میتا فیزیقی.

ئەم بیردۆزەیە لەگەڵ چەمکی ئیسلام دا ناگونجێ، چونکه ئیسلام چەسپاو و گۆڕانەکان کۆدەکاتەوە و ئارنوڵد توینبیش پێی وایە ئەو ماددیە مێژووییە داهێنراوێکی ماددیە کە مەسیحیەت لەسەر دەستی مارکسی پێغەمبەری شیوعیەتی شکست خواردوو شکستی خوارد. ئەوەش بزاڤێکی وێرانکەری شۆڕشگێڕی بوو کە بە کۆی بەهاکانیەوە بۆ ئەوە نەدەگونجا فەلسەفەی ژیانی ئازاد و تەواوی مرۆڤ لە قەوارەی کۆمەڵگە ئازادە تەواوەکانی پێ بنیاد بنرێ.

توینبی بە ڕاڤە دژکاریەکەیەوە وا دەردەکەوێت پەرچەکردارێکی توند بێت دژ بە ماددیەت ڕاڤەیەکی ئەخلاقی بۆ مێژوو دەکات کە تەواو کاریگەرە بە ڕێنماییەکانی مەسیحیەت تا ئەوەی هەندێ لە مێژوونوسان بە ڕاڤەی مەسیحیەت بۆ مێژوو ناوی دەبەن. هەندێ لە ڕەخنەگران زیاتر دەچن و ڕێبازەکەی لە ڕێبازی زانستی بۆ ڕاڤەی

مێژوویی بەدوور دەگرن لەبەرئەوەی گیانی میتا فیزیقی صۆفیگەری مەسیحی بەسەردا زاڵ بووە، ئەمەش لەبەر ئەو زاڵ بوونی ڕۆحە لاهوتیەی کە ناکرێ بە واتـای ئـەزموونی ڕێبازی لێکۆڵینەوە و یاسا چەسپاوەکان بەزانستی دابنرێ.

ئەو لێکۆڵەرەی ئەو دەقەمان لێوەرگرتووە دەڵێت: هیگل بـڕوای وابـووە تەنگژەی مرۆڤ لە مێژوودا سیاسەتە. مارکسی پێی وابـوو تەنگژەی مـرۆڤ لـە مێـژوودا ئابوورییە. تویتبی بڕوای وابووە تەنگژەی مرۆڤ ڕۆحیەتە.

ئێمەی موسڵمان پێمان وایە دەرچوون لە ڕێبازی خواو لادان لەسەرچاوەی یەکەمی جوڵەی بوون و کۆمەڵگە و مرۆڤ کە خوای گەورەیە و لەبیری سەرپێچی سـەردەم دا بـە (سروشت) وەسف دەکرێ و بە سەرچاوەی تەنگژەی حەقیقی دادەنرێ.

زۆربەی ئەو تەنگژانەی کاروانی مرۆڤایەتیان تەوق داوە لە بڕینی هۆکـاری یەکـەم دا سەرکەوتوو بوون سەرەڕای جیا کردنەوەی حەق لە ڕۆحی ئەخلاقی.

ئەو فەیلەسوفانە بە ڕایەکی پێش وەخـت بانگـەوازی خۆیـان دەسـتپێکردو لـەپێناو دانپێنان و چەسپاندنی دا هەوڵیان دەدا هەندێ ڕوداوی گرنگی مێـژوو دامـاڵن و خۆیـان لـە چـەند ڕاستیەکی تـر بێئاگـا بکـەن کـە لـەوەی ئـەوان دەیڵـێن گرنگـی زیـاترە بـۆ مرۆڤایەتی، هەروەك دیدی گشتگیری هەموو لایەنە مرۆییەکان لەبەردەست نیـە، بـەڵکو لە چەند لایەکی دیاری کراوەوە لێنەبون و خۆیان بێئاگا کـردووە لـە گێڕانـەوەی چـەند هۆکارێکی تر. ڕاسـت دەفـەرموێت خـوای گـەورە ﴿إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا الظَّنَّ وَمَا تَهْوَى الْأَنفُسُ﴾.

لەپێناو چەسپاندنی ئەوەدا کە هاوسەنگی قبوڵی ناکـات شـێوەی زانـستیان هێنایـە ناو باس، بۆ ئەوەی کـە بکـەونـە چەسـپاندنی ئـەوەی کـە داوای زاڵکردنـی تـای پوچـی بەسەر حەقێکی پشتگوێ خراودا دەکات. ئەگەر نا چـۆن ماددیـەت بەسـەر هاوسـەنگی کۆکەرەوەی ڕۆح و ماددەدا سەردەخرێ و چۆن بـاری بزاڤـی بـەردەوام دەچەسـپێ تـا

بەسەر تەواوکاری چەسپاو و گۆڕاوەکان دا سەرخرێ، چۆن پەرەسەندن بەسەر چەسپاودا سەردەخرێ، چۆن ئەو بەها بنەڕەتیانەی کە ئاین دایناون وەك ئەخلاق بەهای ڕێژەیی بن و بە گۆڕانی کۆمەڵگەو بارەکان بگۆڕێن. چۆن ئەوەی پێی دەوترێ بە ڕێکەوت دادەنرێ و چی شتە لەم بوونەدا بە حسابێکی ورد دانراوە و هیچ لایەنێکی ڕێکەوت یان شتی کتوپڕی تێدا نیە، ئەگەر ئێمە ئەو یاسایانە نەبینین کە جڵەوی ئەو غەیبەی بەدەستە ئەوا واتای ئەمە ئەوەیە چەند یاسایەك نەبوون کە جڵەویان لەدەست بووبێت.

هەموو هەڵەکان لە دانانی فەلسەفەی ماددی دا یە سەرەڕای هەڵەکانی تر. ماددیەتی جەدەلی بۆ بنیادی خۆی پشتی دەبەست بە بنەڕەتەکانی بەخششی زانستی سەدەی نۆزدەهەم، ئەو بنەڕەتانە گۆڕان و زۆربەی بەخششەکانیش گۆڕان و بنەڕەتەکانی بیردۆزەکەیان لەرزاند. بارەکە بۆ بوونگەرایی (سارتەر) و فرۆیدی و بیروڕای خوێندنگەی زانستە کۆمەڵایەتیەکانی (دۆرکایم) و بیردۆزەکانی ڕەخنەی ئەدەبی و مەزهەبەکانی ڕۆمانسی و کلاسیکی و واقیعی و کۆمەڵایەتیش وابوو. بەڵکو دەرکەوت ماددیەتی جەدەلی لە پەیامەکانی دا پێچەوانەی بەخششەکانی خودی زانستی ئەزموونیەیە، چونکە ناکرێ لە جیهان تێبگەیت مەگەر لەڕێی ئەندامەکانی هەستەوە (بینین، بیستن، دەستلێدان).

هەروەها مرۆڤ لە جیهان دا ڕزگارکەر نیە بەڵکو ئیشکەر و سازێنەرە، ماددیەتی جەدەلی بەوە ناسراوە پەیکەرەکەی لەسەر وتە فەلسەفیەکان بنیادناوە و فەلسەفەش –نەك زانست– چەمکە گشتیەکان دادەڕێژێ. ئەم وتانەش لای هەموو فەیلەسوفێ بە دەقێ سەر هەڵدەدەن کە جیا بێ لە فەیلەسوفێکی تر، هەندێ جار بەتەواوەتی وتەی ئەو فەیلەسوفەکەی تر هەڵدەوەشێنێتەوە. لێرەوە بانگەشەی قۆرخکاری مەعریفەی فەلسەفی لەلایەن یەکێ لەو فەیلەسوفانەوە دەردەکەوێ و بە زانستی وەسفی دەکات و

لەسەر حسابی ئەوی تر نکوڵی لەو حەقە دەکات. ئەمە لەو لادانە گەورانەی هەڵەی ئەمو ئەوە: ئەو دەقەی دان دەنێ بە ماددیەتی جەدەلی دا بە پشت پێبەستنی بەرامبەر دەستکەوتەکانی عەقڵی مرۆیی تا لەگەڵ بەرژەوەندی چینێکی دیاری کراوی خەڵکدا بگونجێ. ئەگەریش بڕوانینە پێکهاتەی ماددیەتی جەدەلی لە مارکسیەت دا کۆمەڵێ ڕاستی تری گرنگ دەبینین.

مارکس و ئەنگلز پەیامی فەلسەفی خۆیان پێش سەردەمی فیزیای ناوکی دەخەنە ڕوو، ئەو ماوەش نزیکەی سەدەیەك دەبوو. مارکس و ئەنگلز چی پێشکەوتن و گرانبەهایی جیهان بوو کە پێش ئەوان هەبوون وەریان گرتبوو، بەڵام ئەو دووانە تەنها دەستکەوتی عەقڵی مرۆییان دارشت. ئەمەش بەپێی بەرژەوەندی و ئامانجی پرۆلیتاری‌و هەموو شوغلیەکان. لەبەرئەوەی دوو شۆڕشگێڕی گەورە بوون بۆیە دەستکەوتێکی زانستی بێ وێنەیان دەست کەوت و لە زانست و فەلسەفە و ئابووری سیاسی و مەزهەبی ئیشتیراکی دا کودەتایەکی شۆڕشگێڕیان ئەنجام دا و زانستێکی نوێی شۆڕشگێڕیان داهێنا کە مارکسیەت بوو.

مەترسیدارترین شتێ مارکسیەت بانگەشەی بۆ دەکات نیشاندانی ئەو یاسا کۆتاییانەیە کە جوڵەی جیهان و مێژووی جیهانیان بەدەستە. ئەمەش وتەیەکی پوچ بوو، چونکە جیهان نەبووە تا چاوەڕێی دەرکەوتنی ئەو یاسایانە بکات تا ستەمکاران بەسەر وڵاتیان دا ڕاپەڕن و جەنگەکە ببەنەوە، ئەگەر نا چۆن مێژووی مرۆڤایەتی پڕ لە شۆڕش و ڕاپەڕین و دەیان و سەدان سەرکەوتنی بێزارانی جەلادا و چەوسێنەرەوانیان پێش دەرکەوتنی یاساکانی مارکسیەت ڕاڤە بکەین.

هەروەها مارکس لە وتە ئابووریەکان دا کە بە زانستی ئابووری مارکسی ناسراون تەواو شارەزای مێژووی ئابووری مرۆیی نەبووە و بۆ بەخششی مەزەندەکراوی گومانی پشتی بەستووە بە چەند ماوەیەکی فراوانی و چی بۆ خۆی گونجاو بێ و پاڵپشتی

ئەگەر پێش وەختەکەی بوو بێ هەڵیبژاردووە و چیش لەگەڵی دا نەگونجا بێ شاردوویەتیەوە (بە وەرگرتن لە سولڤیان: حدود العلم و نوسینی تێبینیەکانی سەر ئەو کتێبە لەلایەن دکتۆر عیمادەدین خەلیلەوە).

ئیسلام بەرپەرچ دانەوەی مەنهەجیەتی جەدەلی و مەنهەجیەتی جەدەلی مارکسی ڕادەگەیەنێت، ئەو مەنهەجیەتانەی ژیانی مرۆڤایەتی لە ململانێیەکدا نیشان دەدەن کە بەبنەڕەتی جوڵە و گۆڕان و پەرەسەندنی دادەنێن.

دکتۆر مەحمود عوسمان لە کتێبە ناوازەکەی دا (بیری ماددی نوێ و هەڵوێستی ئیسلام لەڕووی‌دا) دەڵێت بنەمای هیگل و ئەوەی مارکسیەکان لە دژی لێنەویون بنەمانی نەگونجانە لە شتەکان دا، لە عەقڵیش دا بنەمایەکی شکست خواردووە. بنەمای نەبوونی ناتەبایی لە بوون و لە عەقڵ دا بنەمای دروست هەیە، جا بیردۆزەی جەدەل لە بنەڕەت دا شکست خواردووە و لەمەشەوە چی لەسەر بنەمای ناتەبایی دامەزرابێ بە لەکارکەوتنی ئەو بنەمایە ئەویش لەکار دەکەوێ.

## * عەقڵ و سروش:

بیری ڕۆژئاوایی دوای نکوڵی لە سروش گەیشتە دوو ئامانج: دیدی عەقڵانی و ڕوانینە هەستپێکراو. سەبارەت بە عەقڵانیەت ئەوا نکوڵی دەکات لە سروش، دیدی هەستپێکراویش نکوڵی کردن بوو لە غەیب. هەردووکیشیان لە بیردۆزەی ماددیەوە وەرگیرابوون، زانایانی موسڵمان بەرەو ڕووی هەردووکیان وەستان و دەستەوسانی تەنها دیدی عەقڵیان نیشان دالە پێشکەش کردنی چەمکی حەقیقی مەسەلەکان، بەرزڕاگیری چەمکی عەقڵ و عەقڵانیەت بەرەو نکوڵی ئەفسانە و خورافەو ئەو دەقانە دەچێ کە هەندێ کتێبی پیرۆز لەخۆی دەگرن و لەگەڵ ڕاستیەکانی زانست یان ڕاستیەکانی عەقڵدا ناگونجێن.

بەڵام بارەكە لە سنورێك دا نەوەستاو دیدی عەقڵانیەت هەوڵی دا خۆی وەك بنەڕەتێكی تەواو و تاكە بنەڕەتی مەعریفە بچەسپێنێ، ئەمەش پێچەوانەی چەمكی گشتگیری ئیسلامە كە عەقڵ و سروش پێكەوە كۆدەكاتەوە. دەركەوتنی چەمكی عەقڵانیەت پەیوەستە بە جەختكردنەوەی سوقرات لەوەی عەقڵ گرنگترین جیاكاری كائینی مرۆییە و لە كۆمەڵێ پێوەر پێكدێ كە لە ڕێی هەستەكانەوە لەو مەعریفەی وەردەگرێ كە لەسەر بنەمای ئەزموون ڕاستیەكەی دڵنیا دەكرێتەوە. ئیسلامیش عەقڵ دەكات بە بنەڕەتی تەكلیف، بەڵام كردوویەتی بە ئامێرێ كە چەمكەكانی لە سروشەوە وەردەگرێ.

ماوەردی دەڵێت: ناونانی عەقڵ لە بەستنەوەی وشتر دەچێ، چونكە عەقڵ ناهێڵێ مرۆڤ بەسەر ئارەزووەكانی دا پێشڕەوی بكات وەك چۆن وشتر كە دەیبەستیتەوە ناتوانێ بڕوا (ئەگەر بیبەستیتەوە دەتبەستێتەوە لە نەشیاو بەوە عاقڵیت) هەروا زانایانی ئیسلام تەبایی صەحیحی مەعقول لەگەڵ ڕاشكاوی مەنقولیان ڕاگەیاندووە.

جا عەقڵ بنەڕەتی تەكلیفە، ئەگەر عەقڵ وای لێهات نەتوانێ ئەركی خۆی بەجێ بگەیەنێ وەك نەخۆشی یان خەو، ئەوا ئەو كەسە تەكلیفی شەرعی لەسەر نامێنێ، زانایانی موسڵمان بڕیاریان داوە:

یەكەم: تەنها عەقڵ بەس نیە و دەبێ سەرچاوەیەكی ئایینی بۆ مەعریفە هەبێ كە توانای كاری گشتگیری هاوسەنگی ئازادی تێگەیشتوانە بدات بە عەقڵی مرۆیی. دەبێ چەند بەهایەكی خوا ویستی باڵاش هەبن كە گشتگیری و سەرپەرشتی پابەندی ئەخلاقی لەخۆ بگرن.

دووەم: ئامانج نایەتە دی تا كاتێ ئایینی كۆتا دێ، هەموو بانگەواز و پێغەمبەرانی پێشتریش پێشەكی ئەم ئایینە كۆتایە بوون.

سێیەم: خوای گەورە كە عەقڵی داوە بە مرۆڤ لە هەڵە بەدووری نەگرتووە و وای نەكردووە لەگەڵ ئارەزووەكانی دا بە درێژایی ژیان لە ململانێدا نەبێ.

چوارەم: عەقڵ لە مرۆڤ دا هەیە بەڵام دوور لە هەڵە نیە، ئەزموونی ئادەم (علیە السلام) لە بەهەشت دا بێتوانایی عەقڵی مرۆڤ لە عیسمەتکردنی مرۆڤ ڕوون دەکاتەوە. لێرەوە پەیامی پێغەمبەران هاتن بۆ هاریکاری عەقڵی مرۆیی تا ڕۆڵی خۆی ببینێ و مرۆڤ لە هەڵە بپارێزێ و پەیوەستی گوێڕایەڵی بکات.

سەر لە نوێ لە سەردەمی نوێ دا مەسەلەی عەقلانیەت وروژێنرا دوای ئەوەی بیردۆزەی (هۆبهلوس)ی بەریتانی دەرکەوت و عەقلانیەتی کرد بە پێناوێکی جەستەیی پەرەسەندنی مرۆیی کە لەسەر ئەو بنەڕەتە لایەنەکانی ژیانی تاکەکەسی و کۆمەلایەتی دەگونجێن. ماکس ڤێبەری ئەڵمانی بەکارهێنانی چەمکی عەقلانیەتی لە زانستی کۆمەلایەتی دا فراوانتر کرد و کارە کردەییەکانی بۆ چوار بەش دابەش کرد:

١- بەپێی پابەندییان بە پاڵنەری عەقلانی یان دوور بوون لێی.

٢- بەپێی جۆرەکەی کرداری یان بەها، تەقلیدی یان سۆزداری.

٣- لەسەر ئاستی کۆمەلایەتی.

کۆی قسەکەی ئەوەیە کۆمەڵگە ئەگەر هەستاو ژیانی خۆی پەیڕەو کرد و پشتی بەست بە چەند دامەزراوەیەکی سەقامگیر هاودەم بە ملکەچی پێناوەکان بۆ ئامانج ئەوا کۆمەڵگەیەکی عەقلانی دەبێت. هەروەها پێی وایە عەقلانیەتی کۆمەڵگە پەیوەستە بە دیموکراتیەتەوە.

ڕوون و دیاریشە جیاوازیەکی فراوان لە نێوان تێڕوانینی عەقلانیەت لە کۆمەڵگەدا کە لەسەر بنەمای دیدی گشتگیری ئیسلامی وەستاوە لەگەڵ کۆمەڵگەکەی دا هەیە کە دژایەتی هەموو شتێ دەکات کە پەیوەستی ڕۆحیات و مەعنەویەت و غەیبیات دەکات.

ئایین ڕاستیەکی بنەڕەتی یە کە لە ناخی مرۆڤ دا ڕەگی داکوتاوەو وەك ئەوە نیە کە مارکس و ئەنگلز بە ڕوانینێکی بۆرجوازی قۆناغگەری خەیاڵی دەکەن. لەبەرامبەردا عەقلانیەتی شیوعیەت بە شێوەیەکی بەرچاو بەر لەرزە کەوت. ئەمەش لەژێر زەبری

ئەوەدا کە لە فیترەتی مرۆڤایەتی دا بەردەوامە و پاشەکشە لە چەندین شوێن دا لەبەردەم کشانی دڵنیایی ئەودا.

هەوڵی بەخوا دانانی عەقڵ هۆکارە بۆ لەناوبردنی پێناوی چاودێری خۆیی کە ئایین بەدیدەهێنێت ئەمەش نەخشەیەکی ماددی بوو کە دەیویست حەڵاڵەکانی خوا حەرام و حەرامەکانی خوا ڕەوا دابنێ.

## *عەلمانیەت:

عەلمانیەت لە وشەدا جیاکردنەوەی ئایینە لە کۆمەڵگە و دەوڵەت و کورتکردنەوەی لە پەیوەندی نێوان مرۆڤ و خودا، ئەمەش چەمکی لاهوتی مەسیحی و هەندێ ئایینی تر دادەنرێ، بەڵام ئیسلام جیاوازە و هەردوو پەیوەندیەکە کۆدەکاتەوە، پەیوەندی مرۆڤ بە خواو بە خەڵکیشەوە. ئیسلام ڕێبازێکی ژیان و نیزامی کۆمەڵگەیە. بیرۆکەی عەلمانیەت لە ڕۆژئاوادا لەبەر چەند هۆکارێك دەرکەوت کە گرنگترینیان هەڵوێستی پیاوانی ئایینی بوو بەرامبەر ڕێنیسانس و نەیارییان بەرامبەر دۆزینەوە زانستیەکان. هەروەها ئامانجی جولەکە بۆ لەناوبردنی دەسەڵاتی مەسیحیەت لە کۆمەڵگەی ڕۆژئاوایی دا تا بۆخۆیان دەرفەتێ هەبێ دەستبگرن بەسەر سیاسەت و قەڵەمڕەوی سەربازی دا. لێرەوە ئەو ڕقە توندەی دژ بە ئایین لە فەلسەفەی چەندین فەیلەسوفی وەك نیتشە و مارکس و فرۆید دا دەردەکەوێت.

قەڵەمڕەوی بیانی هەوڵی دەدا ئەو مەسەلەیە بگوازێتەوە بۆ ئاسۆی کۆمەڵگە ئیسلامیەکان دوای ئەوەی دەستیگرت بەسەر ڕێبازی پەروەردە و فێرکاری دا، بیرۆکەکە هێشتا ناجێگیرە و پێشوازیەکی تەواوی لە کۆمەڵگەیەك دا پەیدا نەکردووە کە لەسەر بنەمای نیزامێکی گشتگیری ئایین و دەوڵەت دامەزرابێ.

سەبارەت بە مەسیحیەت ئەوا کۆمەڵێ وەسیەت بوو چونکە لە شەریعەت دا شوێنکەوتەیی ئایینی موسا بوو، کاتێ جیا بوویەوە ویستی نیزامێك بۆ کۆمەڵگە

دابمەزرێنێ، بۆیە چەمکێکی مرۆیی داڕشت کە نەیدەتوانی تەنگ هەڵچنێ بە نیزامی گشتگیری خوای گەورە. لەم خاڵەوە تەنگژەی ژیار و بیری ڕۆژئاوایی دەستی پێکرد.

ئیسلام کاتێ ئەو عەلمانیەتە بەرپەرچ دەداتەوە کە داوای جیاکردنەوەی ئایین لە دەوڵەت دەکات، بەهەمان شێوە دەوڵەتی ئایینی سوقراتی کە داوای قەڵەمڕەوی پیاوانی ئایینی بەسەر دەوڵەت دا دەکات بەرپەرچ دەداتەوە. دیارە بانگەشەکانی فەیلەسوفە ماددیەکان جەختی دەکردەوە لەسەر ڕزگار بوون لە کۆتایی ئایین وەك پەیڕەوی ئەو ئامانجە ماسۆنیانەی کە نەخشەیان داڕشتبوو بۆ بڵاوکردنەوەی مەزهەبی ملهوڕی، مارکسیەتیش کەوتە بانگەواز بۆ نکوڵی یەکپارچەی ئایین و لەناوبردنی و دامەزراندنی ئاینێکی نوێ کە بریتی بوو لە (ململانێی چینەکان) وەك پێشەکیەکی پێویست بەرەو جیهانێکی باشتر کە تیایدا مرۆڤ گەورەی خۆی بێت، ئەم بانگەشەش پوچ بوو نەهاتەدی و لە ڕۆژئاواشدا بانگەواز بۆ لەکارخستنی دەسەڵاتی ئایین و دەسەڵاتی ئەخلاق و گۆڕینیان بۆ حزب بڵاوبوو. کۆڕە ماسۆنیەکانیش (کە دواجار گۆڕان بۆ کۆڕی لیۆنز و روتاری) بانگەوازیان دەکرد بۆ ئازادی ڕەهاو تێکەڵی نێوان دوو ڕەگەز و دامەزراندنی شاری بێ بەرگان و هاندانی گەشت و یانە وەرزشیەکان و بڕوانەبوون بە نیشتمان یان ئایین یان نەتەوە.

هەندێ لە لێکۆڵەران دەڵێن سەرچاوەی ئەو بیرۆکە عەلمانیە ناکۆکی نێوان ئایین و زانست بوو، ئەو مەسەلەی کە لە ئەنجامی ململانێی نێوان کڵێسا و بازنەکانی لێکۆڵینەوەی زانستی دا دەرکەوت. ئەو بیرۆکەیە نەدەکرت بگوازرێتەوە بۆ کەش و هەوای ئیسلامی چونکە ئیسلام وەك هاوپەیمان و هاندەری زانست دەرکەوت، بۆیە زانستی پەیوەست بە جیهان دادەنێ بەجۆرێ واقعی و مەدەبی بێ، عەلمانیەتیش وەك نەیار و هەڵوەشێنەری ئایین لە کەشێکی بنیادی ژیاری وادا دەرکەوت کە ململانێیەکی سەختی لەگەڵ ئایین دا بەدیدەکرد. هەروەك لاهوتی کڵێسای کاسۆلیکی لە ئەوروپا و

ڕای ڕەسمی كڵێسای كاسۆلیكی وێنای دەكرد، ئەو ململانێیە لەگەڵ زانستێك دا بوو كە ڕێنیسانسی ئەورووپی نوێ لەسەر بنەڕەتەكانی ئەو دامەزراو چاوی دادەخست لە هەڵوێستی جەوهەری ئایینی مەسیحی ئەو ستەمەی ڕافەی كڵێسایی بەرامبەر ڕای حەقی مەسیحیەت لەسەر مەسەلەی زانست دا ئەنجامی دابوو. بێگومان دژایەتی ئایین بۆ زانست و ململانێی نێوانیان تایبەتمەندیەكی كاسۆلیكی ئەورووپی بوو و هیچ لێكچوونێك نەبوو لەنێوان ئەو پێشەكی كارانەی ئەو دوژمنایەتی و ململانێی یەیان نایەوە لەگەڵ واقیع و هەڵوێستی ئیسلام و ڕای زۆریەی ڕەوتە هزریە ئیسلامیەكان لەو بارەوە، چونكە ئیسلام چوارچێوەی زانستەكانی سروش و شەرع ناگەیەنێتە هەموو مەیدانە دنیاییەكان، بەڵكو زانست و ئایین و عەقڵ و نەقڵ و دانایی و شەرعیەت و دنیاو ڕۆژی دوایی لەڕێی دیاری كردنی بنەماكانی هەر ڕەوتێكی هزری دا یەكدەخات بۆ دانانی دیدێكی تەواو تا مرۆڤ گەشە بە ژیان بدات. ئەم گۆڕانەش ڕوو نادات ئەگەر پشت نەبەسترێ بە جەمسەرە جیاجیاكانی دیاردەكانی بیرو ژیان نەك بۆ یەك جەمسەری یەك دیاردە. تایبەتمەندی عەلمانیەت بە واقعی ئەورووپی و ئەو نیزامی كاهینی و كەهەنوتەی مە مەسیحیەت لەسەری بوو و جەخت دەكاتەوە لەو نیزامەی كە مرۆڤی ئاسایی و پەروەردگاری دەبێ نێوەندێكیان هەبێ كە ئەویش پیاوی ئایینی و كاهینە، ئەمە وا دەاكت چینێ یان دەستەیەك ڕای ڕەسمی ئایین قۆرخ بكەن، بەڵكو مافی قسەكردن بەناوی ئاسمانەوە قۆرخ بكەن، بەدوای ئەمەش دا پیرۆزی و بەپیرۆزدانان بۆ ئەو پیاو و دامەزراوانە دێ كە ئەوەیان بۆ ئەو ئایینە داناوە. ئیسلامیش هیچكام لەمانەی تێدا نیە، بەڵكو نەك ئەوەی لێیان دوورە بەڵكو نكوڵییان لێ دەكات و جەنگێكی سەختیان لەڕوودا ڕادەگەیەنێت.

لەكاتێك دا عەلمانیەت زانستی پەیوەست بە جیهان و هەرچیەك واقعی و مەدەنی بێت بەرامبەر بە ئایین دادەنێت. ئیسلام هەموو زانستە مەدەنی و ئاینیەكانیش

دەخاتە بازنەی نیزامی گشتگیری خۆیەوە. بێگومان تەواوی و کامڵی ئیسلام و دیدە کۆکەرەوەکەی ناهێڵێ ئەو چەمکە دەربکەوێ کە لە سایەی ئەو لێکهەڵوەشانە دا دروست بوو کە فەیلەسوفان و بیریارانی ڕۆژئاوا لەنێوان لاهوت و زانستی ئەزموونی دا دایانهێنا. بەڵکو وەك دکتۆر عەبدولموصەوڕ شاهین دەڵێت ئیسلام جیهانێتی ماددە و ڕۆحیش کۆدەکاتەوە و هەموو بەهاکان بە گونجاوی و تەبایی بەیەك دەگەن.

دکتۆر شاهین پێی وایە عەلمانیەت لە هەموو بارەکانی دا چەمکێکی سیاسیە نەك ژیاری کە ئامانجیان جیاکردنەوەی ئایینە لە ژیان یان لەناوبردنی تەواوی ئایینە. هەردوو چەمکەکەش لەدیدی ئیسلامی دا بەرپەرچ دراوەن.

دیارە عەلمانیەت چەمکێکە لەباری ململانێی نێوان کڵێسا و دەوڵەت لەسەر دەسەڵات دەرکەوت. بیریارانی ئەوکات پێیان وابوو دەکرێ چارەسەرەکە لە دوورخستنەوەی کڵێسا لە دەسەڵات بێت و وەسفی عەلمانیەتیان دا بەسەر ئەو بارە دروست بووەی ئەو دوورخستنەوەدا. دواتر ئەو چەمکە گەشەی سەند تا ئەوەی مارکس و خوێندنگەکەی هاتن و چەمکەکە لای ئەوان گەشەی سەند بۆ واتای لەناوبردنی تەواوی ئایین بۆ بەدیهێنانی عەلمانیەتی حەق و ناوی (عەلمانیەتی توندڕەوی) لێنرا.

مامۆستا فەتحی ریزوان پێی وایە عەلمانیەت پەرچە کرداری دژ بە تیرۆری ئایینی و دەست تێوەردانی کڵێسایە بۆ مەسەلەکانی بیر و لێکۆڵینەوەی زانستی و پەروەردەو پێگەیاندنی منداڵ و گەنجان.

لەبەر ئەوەی ئیسلام هەر لە هاتنی موحەممەدەوە (ﷺ) (٥٧٠ز.) تا ئەمڕۆ کە هەنوت و پاپەویەت و دەسەڵاتی ئایینی وای نەبووە کە بیری خەڵك دابخات و کێشە بۆ

بیریان دروست بکات بۆیە نابینی لە وڵاتی ئیسلام دا عەلمانیەت دامەزرابێ، بەڵام موژدەبەران و هەندێ لەو مەسیحیانەن لە ئەورووپا فێربوو بوون عەلمانیەتیان بەڕێی پێشکەوتن و زامنی ژیار لە وڵاتی موسڵمانان دا دەزانی. هەروەك لە وڵاتی مەسیحیەکان دا وابووە، بۆیە لە وڵاتی ئێمە بە ئامانجێکی تر موژدەی عەلمانیەتیان دەدا تا گەمارۆیەك بخەنە سەر ئیسلام تامنداڵی موسڵمان دوور لە گیان و چاودێری ئیسلام پێبگات. بەڵام ئیسلام زۆر باشتر ئەوەی بەدیهێنا کە عەلمانیەتی ئەورووپا هەوڵی بۆ دەدا و گەیشتە بەرزترین ئامانج. والی بە حوکمی ئایین لەسەری دەبوو مافی بدایە بە نا موسڵمانانی مەسیحی و جولەکە و ئایینە ئاسمانیەکان تا بەو جۆرەی خۆیان دەیانەوێت بێ زەبر و فشار لە پەرستگای خۆیان دا کە لەوپەڕی ئازادیەوە دروستیان دەکەن پەروەردگاری خۆیان بپەرستن و زەنگەکانیان لێبدەن و کتێب و نوسینەکانیان چاپ بکەن و تیایدا بیروباوەڕی خۆیان شرۆڤە بکەن و بەوپەڕی ئازادیەوە بەو جۆرەی پێیان خۆشە منداڵانی خۆیان پەروەردە بکەن. مێژوونوسان باسیان لەوە نەکردووە والیە موسڵمانەکان ڕێیان گرتبێ لە لێکۆڵینەوەی زانستی یان ڕای ناو ئایین یان ڕێی بەدەستخستنی مەعریفە. دەستوری ١٩٢٣ ڕاشکاوانە تەحەدای عەلمانیەت دەکات و بەتەواوی نکوڵی لێ دەکات و دەڵێت ئایینی ئیسلام ئایینی دەوڵەتە لە کاتێك دا دەوڵەت عەلمانیە و هیچ ئایین و هیچ مەزهەبێکیشی نیە.

# باسی دەیەم

# (زانستە مرۆیی و کۆمەڵایەتیەکان)

پاش ئەوەی بانگخوازانی عەلمانیەت و ماددیگەرایی لە هەموو شوێنێ بەوە موسڵمانانیان لە خشتە بردن کە گوایە ئەوەی فەلسەفەکان لەبواری ئەخلاق و کۆمەڵایەتی و دەروون دا دەیڵێن ئەو زانستە یە کە حەقیقەت دەنوێنێ، دوای ئەوەی زانایانی بەویژدان ئاشکرایان کرد فەلسەفە و ئابووری و دەرونزانی و کۆمەڵایەتی بە واتا حەقیقیەکەی زانست نین هەموو ئەو لەخشتە بردنە دارما. سولڤیان لە کتێبەکەی دا (سنوری زانست) دەڵێت دەرونزانی تا ئێستا بەزانست دانانرێ و بۆ مەعریفەکانی تری وەك زانستی کۆمەڵناسی و ئابوری و ئەوانەی تر لەو لایەنانەوە کە بە نەخۆشی دادەنرێن لە دیدی زانستیەوە وا سەیر دەکرێن. بەڵکو زانست لەوە بەهێزترە کە ئەو لەسەریەتی کاتێ دەنەویتە جیهانی ماددی. سەبارەت بە نوسین و وتەکانی لەباسەکانی تردا ئەوا بەڕێژەی لاواز و ناچەسپاو دادەنرێ. ئەوەی ڕاستی یەو لەم بوارەدا دەبێ بوترێ ئەوەیە جولەکەی جیهانی لە نەخشە صەهیۆنیەکەی دا بۆ دارمای مرۆڤایەتی زانستە مرۆیی و کۆمەڵایەتیەکانی کردن بە دەروازەی خۆی بۆ نیشان دانی وێنەیەك کە گاڵتە بە مرۆڤ بکات و بە ئاژەڵێکی ملکەچی گەدە و جنسی دابنێ (بەو جۆرەی مارکس و فرۆیدی جولەکە ڕایانگەیاند) دواتر دۆرکایم لە دارمانی چەمکی کۆمەڵناسی مرۆیی دا ڕۆڵی مەترسیداری خۆی بینی.

مامۆستا ئیسماعیل فاروقی دەڵێت: زانستە کۆمەڵایەتیەکان لە جەخت کردنەوەو بەرپەرچ دانەوەیان دا لەسەر بنەمای گومان وەستاون و بڕوا وایە بە ڕەهای خوازراو ئەویە بەکردار خوازراو بێ، ڕێی مەعریفەی سروشتیش لە هەوڵی خوێندنەوەی هەست پێکراوە، هەست پێکراویش خواستە تێرکەرەکانی جوڵەی بینراوی مرۆڤن کە ملکەچی

پێوانەی چەندێتین. سەبارەت بە زانستە مرۆییەکان ئەوا لە بنەڕەت دا هیچ حەقیقەتێکیان نیە و زانست نین بەڵکو ئەدەبن.

بۆیە زانستە کۆمەلایەتی یە نوێکان پشت دەبەستن بە لقێکی حەقیقەتەوە کە هەست پێکراوی چەندێتی یەو لە بەشەکەی تر کە هەست پێنەکراوە جیان، ئیدی ئەوە فەرمانی خوایی بێ یان لە خودی خۆیدا بەهایەکی ڕەها بێ، لەسەر بانگەوازی پەیڕەوی ڕەها وەستاوە و ملکەچی بنەمایەك یان یاسایەك نیە بەڵکو تەنها لە ویستی شەخسیەوەیە، جا نیتشە لە بانگەوازی دا بۆ هێز و دەسترۆیی بوونگەرایی هیچگەرایی لەسەر زمانی سارتەر پەیڕەوی ئازاد بەرز ڕادەگرێ، هەموویان دەڵێن: نەگونجا پەیڕەوە شەخسیەکان لە بەهایان کەم ناکەنەوە یا بنە هۆی بەرەنگاربوونەوە و دەست درێژی بۆسەر لای تر و فرەڕەوی لە ئارەزوو و داکەوتنی بەرەو هیچگەرایی، بەو جۆرە لە ڕۆژئاوادا ئەخلاق بە سەختی داڕما لەو کاتەوەی بیردۆزەکە گشتگیر بوو و هەمووان گرتیانە بەر و تاك بڕوای ئەوەی پەیدا کرد حەزی لە چیە ئەوە بیانووە بۆی، لەبەرئەوەی حەزی سامان و جنس بەهێزترین حەزی مرۆیین بۆیە ژیان لە ڕۆژئاوادا دابەزی بۆ ئەو ئاستەی کە ئەمڕۆ تیایدایە.

ئەو چەمکانە کاریان کردە سەر بیردۆزەی پەروەردە و ئاستی کۆمەلایەتی و دەمارگیری نەتەوایەتی دەرکەوت بە بیانوی خۆ بە گەورە زانی بەسەر گەلانی دنیا دا و داگیرکردنی لاوازیان.

دوای جەنگی جیهانی دووەم ئەو بیرۆکەیە دەرکەوت کەچی لەپشت هێزی سروشتەوە هەیە خورافە و ئەفسانەیەو ئایین دەبێت لە هەموو لایەنێکی ئەودیو سروش ڕزگار بکرێ، بەوەش خراپە و خۆ سەپێنی لەودیوی دایە، ئەو بیردۆزەش دەرکەوت کە مەسیحیەت ئایینی ئاشتی و خۆبەدەستەوەدان بۆ لایەن و ڕەگەزی نیە و کۆمەڵی مەسیحی بۆی هەیە چۆن دەیەوێ بێباکانە بجەنگێ و وێرانکاری بکات (بیانوی ئەو جەنگە ئەتۆمیەی کە ئەمریکا بردیە سەر یابان).

## * دۆرکایم و بیردۆزەکەی:

بیردۆزەی دۆرکایم لە زانستە کۆمەڵایەتییەکان دا لە چەمکی مارکسی و بیردۆزەی ماددیەتی جەدەلی یەوە وەرگیراوە و بوونی تاک بەتەواوەتی و خواست و بەرپرسیارێتی تاک لەکار دەخات و کۆمەڵگە بە سەرچاوەی بەها و ڕۆشنبیری دادەنێ و پێی وایە ڕووداو گۆڕانە کۆمەڵایەتییەکان بەرهەمی هەوڵی تاکە کەسی نین. تاکەکان لە چوارچێوەی کارلێکیان لەگەڵ کۆمەڵ دا دامێنان و نوێگەری کارانێك دەکەن کە تەنها بەو کارلێکە لەگەڵ کۆمەڵ دا کاریگەرییان دەبێ. واتای ئەم دیدەی دۆرکایم بریتی یە لە ملکەچی تەواوی تاك لە چوارچێوەی کۆمەڵ و دانانی بە دەستەوسانی مرۆڤ لە گۆڕینی کۆمەڵگە و پێویستی ملکەچ بوونی بۆ کۆمەڵگە، هەروەها دەڵێ هۆکاری کارا کە کار دەکاتە سەر کۆمەڵگە سروشتی کۆمەڵایەتیە، ئەمەش لەگەڕخستنی تەواوی ڕۆڵی تاکە، ئەمەش چەمك و واتای خوێندنگەی زانستە کۆمەڵایەتیەکانە کە لێکۆڵەران شایەتی دەدەن بە ناتەواوی و تێکەڵی ئەو ڕایە و زۆر پرسیاری بێ وەڵام بەجێهێڵراوی، هەنگاوەکەی ئەو کە پێشخستنی کۆمەڵگەیە بەسەر تاك دا و ملکەچی بۆ کۆمەڵگە گەیشتە بیرۆکەی بورگماتی و شوێنکەوتەیی.

نوسینە جۆراوجۆرەکانی بەرەوتی جەخت کردنەوە لە پێویستی ملکەچی تاك بۆ ئەوەی کە هەیە و لەچواردەوریەتی هەنگاو دەنێن، جا دیاردەی کۆمەڵایەتی زۆرەملێ و پابەندیە، لێکۆڵەران هەڵەو نەگونجانی لەگەڵ فیترەت دا ئاشکرا کردووە و جەخت لەوە دەکەنەوە لێکۆڵینەوە و ڕاکانی بەر لێدانی چەندین ڕاستی زانستی دەکەون، ئەوان پێیان وایە ئەو ویستوویەتی کۆمەڵگە بناسێنێ (بەڵام بە ڕایەکی پێش وەختی پێکهاتوو لە چەمکی جولەکایەتی خوازیاری لەناوبەری کۆمەڵگەکانن) قسە و ڕایشی لە سان بیگۆن و ئۆگست کۆنت و مارکس وەرگرتووە.

دۆرکایم کاری دەکرد و کەوتبووە وێرانکردنی هەموو بەهاو چەمکە ئایینی و ئەخلاقیەکان و خوێندکارە گەورە جولەکەکەشی (لیڤی بریل) ڕێبازەکەی ئەوی گرتەبەر و بەو ڕێگایەدا چوو کە لەسەر ڕێبازی گومان خستنە بەها و بیروباوەڕو ئەخلاق وەستا بوو، ئەو بنەمایەی بیری ئەوی لەسەر وەستا بوو ئەوە بوو کە هەموو دیاردە و ڕوکەشەکان ڕێژەیی و گۆڕاون و لەسەر بارێ ناوەستن، چونکە هەموو ڕۆژێ بارێ دەگۆڕێ بە بارێ، ئەمەش لە زانستی کۆمەڵناسی و دەرونزانی و ماددەی ئەخلاق‌و مێژووی ئاینەکان دا دەبیستین. ئەوان ئەو ڕێبازەیان بەکار هێناوە بۆ خراپ کردنی کۆمەڵگە و هەڵوەشاندنی ئەخلاقی ئایینی کۆمەڵگە بە ئامانجی ئەوەی کۆمەڵگە بنالێنێ و پڕ ئاژاوە بێ، ئەمەش ڕێگەی خۆیانە بۆ لەناوبردن، لەپێناو ئامانجەکەشیان دا یەکیان گرتووە تا لە زانکۆکان و زانستە مرۆییەکاندا یەك قسە بن. (دکتۆر عەبدولحەلیم مەحمود).

ئەگەر ئەخلاق ڕێژەیی بێ ئەوا ئەو سەردەمە دێ کە تیایدا بروامان وا دەبێ ڕاستگۆیی سوکیەو دلێری خراپەیەو نەبەردی بەدکاریە یان پاك داوێنی تاوانە، لەبواری بیروباوەڕیش دا ئایا ئەو ڕۆژە دێ کە تیایدا یەك خواپەرستی نەوترێ؟! یان باسی ویست و زانستی خوا نەبێ؟!

دۆرکایم فیترەت بە تاوان دەزانێ و لای ئەو پەیوەندیەکانی دەرەوەی خێزانیش فیترەتە، کۆمەڵگەش بیروباوەڕی ئایینی دادەمەزرێنێ و ئەو بەرپرسە لە هەڵەکانی تاك.

دۆرکایم و خوێندنگەی زانستە کۆمەڵایەتیەکان گۆڕانی زانستی کۆمەڵایەتیان بۆ لێکۆڵینەوەی دیاردەکان سەپاند بێ ئەوەی لە ئاراستە کردن یان گۆڕینی کۆمەڵگەدا هیچ ڕۆڵێکی هەبێ، ئەمەش لەپێناو ئەوەدا زانستی کۆمەڵناسی ببێ بە زانستێکی وەزعی و هەمان مۆرکی زانستە سروشتیە ماددیەکانی هەبێ، بەڵام هەموو بیریاران ئەوەیان بەرپەرچ داوەتەوە چونکە دەروونی مرۆیی ناکرێ ملکەچی پێوانەکانی زانستە ماددیەکان بێت.

ژمارەیەك لە ڕۆژئاواگەڕاکانی خاکی ئیسلامیمان شوێن ئەو چەمکە سەرشێوێنانە کەوتن و ئەو بیرانەیان گواستەوە بۆ کۆمەڵگەمان و بانگەوازیان بۆ کردن و گومانیان لەسەر ڕاستیەکانی ئیسلام نایەوە سەبارەت بە چەمکی کۆمەڵایەتی، ئەمەش هۆکارێکی ئەو هاوارە بەهێزە بوو کە لەسەرەتای سەدەی پانزەوە بەرزبوویەوە بۆ چەکی زانست و داڕشتنەوەی ئیسلامیانەی زانستە کۆمەڵایەتیەکان، پێشڕەوی ئەوانەش دکتۆر ئیسماعیل فاروقی و کۆمەڵەکەی بوون.

لێرەوە زانستە مرۆییەکان و زانستە کۆمەڵایەتیەکان کە ئێستا خراونەتە ڕوو مەترسیدارترین زانستەکانی دژ بە بیروباوەڕی ئیسلامین چونکە زۆربەیان لەسەر ئەگەرو چەند بڕیارێ بنیاد نراون کە ئامانجی خراپیان هەیە دیارترین ئامانجیشیان گومان خستنە ئایینەکان و لەکارخستنی ئەخلاقە و دانانی ئەخلاقە بەتەنها دیاردەیەکی دەرونی و کۆمەڵایەتی و هیچی تر، مرۆڤ لە ڕێبازی ڕۆژئاوادا لە نێوان دوو پرسی مەترسیداردایە: مەسەلەی پیرۆز ڕاگرتنی تاك تا ئاستێ دەوڵەت هەڵبوەشێنێ یان پیرۆز ڕاگرتنی دەوڵەت تا ئاستێ تاك بەژێر زەوی دا بەرێ، بەڵام ڕێبازی خوا مرۆڤ بەرەو ئەو ململانێیە نابات.

## * ئایا بیردۆزە دەرونیەکان زانستن یان ئەگەرن؟

دەرونزانی فرۆیدی: زانستی جنسی جولەکەیە و داڕماندنی مرۆڤی جویم (جگە لە جولەکە)یە، بانگەوازێکە بۆ جەبریەت و جیاکردنەوەی زانست لە پەیڕەو، زانستی دەرونزانی فرۆیدی تەنها لەگەڵ چەمك و واتای ئیسلامی دا جیاواز نیە بەڵکو لەگەڵ چەمك و واتای فیترەت و عەقڵ و مەعریفەی هەموو مرۆڤایەتی دا ناگونجێ. سولیڤان پێی وایە ئەو زانستەی عەقڵی لەگەڵە زانستی دەرونزانیەیە کە تا ئێستاش لە قۆناغێکی زۆر سەرەتایی دایە، بەڵکو هەندێ نکوڵی دەکەن لە بوونی هەر زانستێك لەو ڕووەوە، بەدڵنیاییەوە نیزامێکی مەعریفەی چەسپاوی دەرونی نیە کە بەشێوەیەکی گشتی دانی

پێدا نرابێ، بەڵکو چەند بیردۆزەیەك هەن هەرکامیان دەرفەتێکی سنورداری پەیڕەو و جێبەجێ کردنی هەیە، لەبەرئەوەش کە لە دەرونزانی دا دوو بیردۆزە هەن بەرامبەر هەر دیاردەیەك ئیدی چۆن بڕیار بدرێ لەسەر ڕاستی و زانستێتی ڕێبازی دەرونی، ئەمە واتا دەرونزانی لەسەر چەند پاڵپشتێکی چەسپاو پاڵی نەداوەتەوە وەك ئەوەی بۆ فیزیاو کیمیا هەیە.

زۆربەی بیردۆزەکانی دەرونزانی پشت دەبەستن بە گشتگیرکردن، گشتگیرکردنیش گورزی کوشندەیە بۆ ڕێبازی لێکۆڵینەوەی پتەوو دوو ڕیشەیی زانستی. لێرەدا دوو بیردۆزە هەن: بیردۆزەی ئاکاری و بیردۆزەی شیکاری دەرونی.

بیردۆزەی ئاکاری لەسەر ئەو واتایە وەستاوە کە ئەوەی ئێمەیە بە چالاکی عەقڵی ناوی دەبەین لە بنەڕەت و حەقیقەت دا تەنها چەند جوڵەیەکی جەستەیین، مەسەلەی گەڕانەوەی مەرجیش کە بەڕەنگ دانەوەی مەرجی ناونراوە لەڕاستی دا بیردۆزەی دیارنەمانە، ئاکاردیەکان تا ئاستێکی زۆر چوون و کەوتنە هەڵەوە چونکە دەیانویست ئەنجامەکانی خۆیان کە لەسەر ژمارەیەك ئەزموون و تاقیکردنەوەی سنوردار وەستابوون گشتگیر بکەن بەسەر هەموو ئاکارێتی عەقڵی مرۆیی دا. کارێکی هەڵەیشە کە عەقڵ وا وەسف بکەین کە بەشێوەیەکی تەواو لەسەر ڕەنگدانەوەی مەرجی وەستابێ.

سەبارەت بە بیردۆزەی شیکاری دەرونی کە فرۆید بنەڕەتەکەی دانا، گرنگی سەرەکی خۆی وەك بیردۆزەیەکی گشتی دەرونزانی جەخت دەکاتەوە سەر ئەگەرەکانی.

ئەگەرە سەرەکیەکان: بریتییە لە بوونی ئەوەی بە لاشعور ناو نراوە، پێویستە وا دابنێین لەپاڵ ئەو چالاکیە عەقڵانیەدا کە دەیانزانین کە چەند چالاکیەکی دیکەی عەقڵی چالاك هەن کە هەرگیز نایانزانین. هەندێ لەو چالاکی و ڕووداوانە لە

لاشعوردان‌و دەکرێ بە هەوڵێکی خۆویستی بیانهێنینە بواری شعورەوە، هەندێکیشیان تەنها بە بەکارهێنانی هونەری تایبەت بە شیکاری دەرونی دەهێنرێتە بواری شعور. بەخششەکانی بیردۆزەی شیکاری سەبارەت بە (لاشعور، ململانێ، کۆت کردن، بزەی جنسی (لبی دوو)) ناکرێ بە بارێکی یەکلا و کۆتایی دابنرێ کە کرۆکی پەیوەست بە باری عەقڵ و ڕەنگدانەوەی بەسەر سایکۆلۆجیای مرۆیی دا چارەسەر بکات. جا ئەو خەوەی ڕاڤەکەی بە یەکێك لە پایەکانی بیردۆزەکە دادەنرێ لە چەند سەرچاوەیەکی تەواو جیاوازی ئەزموونەوە هەڵدەقوڵێ کە وا دەکات بڕوا بوون بە هەر ڕاڤەیەکی خەو سەخت بێت.

فرۆید لە خەو دا کۆمەڵێ هێمای جنسی بەدی دەکات.

ئەو لە خەودا دەربڕینی حەزی هێز بەدی دەکات.

یۆنگ خەریکە ڕاڤەیەکی تر بخاتە ڕوو.

هەرگیز ناکرێ بڵێین هەریەك لەو ڕاڤانە لە ڕاڤەکانی تر مەعقول ترە، ئەمەش مەسەلەیەکی بێ هیواکەرە ئەگەر مەبەست ئەوە بێ ڕاڤەی خەو بە زانست دابنرێ، ئەم بەشەی ڕێنماییەکانی فرۆید چەندین گومانی وروژاندووە، فرۆید جەخت دەکاتەوە سەر ویستە کپکراوە جنسیەکان، لەکاتێك دا چەندین زانا جەخت دەکەنەوە سەر چەند پاڵنەر و ویستێکی تر لێرەوە هەرگیز ناگونجێ بڵێین بەخششەکانی شیکاری دەرونی لەلایەن زانایانی دەرونزانیەوە ئەو دان پێدانانی گشتی لەسەرە، لەڕاستی دا بیردۆزەکە تێکەڵەیەکی تەواو ئاڵۆزە، بوونی ئەو ئەگەرانەی دەوری ئەو بیردۆزەیان داوە زۆرێك لە بەهای بیردۆزەکەیان کەم کردۆتەوە و پلەی متمانەی چاوی بیریاران بۆ ئەو بیردۆزەیە بەو هۆیەوە تەواو کەم بوویەوە.

فرۆید وزەی خۆشەویستی جنسی بۆ هەموو چالاکی و ئاراستەیەکی ژیانی مرۆڤ درێژ دەکاتەوە هەر لەو ڕۆژەوەی لەدایك دەبێ تا مردنی، هەموو کارێکی جوزئی یان ئامانجێکی باڵا زۆربەی جار وەك دەربڕینی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆی ئەو وزە کپکراوە جنسیە وایە.

لەلای یۆنگ وزەی حەزی جنسی بریتی یە لە هێزێکی بنەڕەتی چەسپاوی ژیان کە هەموو ئارەزووەکان پێکهاتە یان شوێنکەوتەی ئەون.

ئەدلەر پێی وایە ئەو بزوێنەرەی ژیانی تاك بەڕێدەکات خۆی لەو حافزەدا دەنوێنێ کە پاڵی پێوەدەنێ بۆ بەدەست هێنانی هێز و سەرکەوتن بەسەر چواردەوری دا. لێرەدا چەند دەستیەکی جیا جیا هەن لەبواری شیکاری دەروونی دا، بەگشتی لە بیردۆزەکانی دەرونزانی دا شتێ نیە بۆ ئەوە بێ لە قەناعەتی ئێمەدا بە جددی دابنرێ، ئەو زانستە ناکرێ تا ئێستاش بە زانست دابنرێ.

جفری ماسۆن یەکێ لەوانەی شرۆڤەی دەروونی کردووە و تایبەتمەندی دەروونزانیە لە کتێبخانەی کۆنگرێسی ئەمریکی لە کتێبێکی نوێ دا کە بەم نزیکانە خرایە بازاڕ ڕایدەگەیەنێت فرۆید لەو شیکارییانەدا کە پێیان گەیشتووە پەنای بردووە بۆ درۆ و غەش کردن بەتایبەت بیردۆزەی پاڵنەری جنسی لای منداڵ کە ساڵی ١٨٩٦ز. پێی گەیشت.

ماسون دەڵێت زۆربەی ئەو منداڵانەی فرۆید بۆ بەدیهێنانی بیردۆزەکەی پشتی پێ بەستن درۆیان لەڕوودا نواند و زانیاریَ حەقیقیان پێنەبەخشی. فرۆید ئەم هەڵانەی ئاشکرا کردن بەڵام ڕاستی نەکردنەوە. ماسون لەئەنجامی ئەو بڕیارو ڕاگەیاندنانەی دا لە پیشەکەی دەرکرا.

ماسون دەڵێت: پشتیوانانی فرۆید دەترسن بیردۆزەکانی شیکاری دەروونی شکست بهێنن ئەگەر ئەو هەڵانە بخرێنە ڕوو کە دەڵێت ئەوان لەو ترسەیان دا مافی خۆیانە، ئەگەر ئامادە بن ڕاستی شیکاریەکانی فرۆید دڵنیا بکەنەوە ئەوا دەبێ سەر لەنوێ بەدوای وەڵامی ئەو نەخۆشانە دا بگەڕێن کە لە ساڵی ١٩٠١ز.ەوە ملکەچی شیکاریەکانی بوون. کچەکەی فرۆید داوای لە ماسون کرد تا چوار سەد بەڵگەنامەی باوکی بگێڕێتەوە کەلای خۆی هێشتبوونیەوە. شایەتیەکەی جفری ماسون بە سەختترین گورزێ دادەنرێ کە بەتایبەت ئاراستەی فرۆید کرابێ، پێشتر ئەوەی

خستەڕوو کە فرۆید پەیوەندی جنسی هەبووە لەگەڵ خوشکی ژنەکەی دا سەرەڕای ئەوەی باس لەوە دەکات فرۆید حەشیش و ماددەی هۆشبەری بەکارهێناوە.

زۆربەی لێکۆڵینەوەکانی سالآنی کۆتایی ئاماژە دەدەن بە (درۆیەکانی فرۆید) و فرۆید بە هێرشێکی توندی چەندین خوێندنگەی دەروونزانی و زانستە مرۆییەکان بوەتەوە، گرنگترینیان کتێبی (بزاڤی شیکاری دەروونی) رشت جیلنز و کتێبی (کزبوونو کەوتنی ئیمپراتۆریەتی فرۆیدی) ئیزینك.

ئەو دوانە پشت دەبەستن بە یەك وتە کە ئەو نوێیەی فرۆید هێنای هیچ ڕاستی و پێکانێکی تێدا نیە، ئەو ڕاستیەی وتویەتی نوێ نەبووە، ئەوەی بە ڕەخنە لێی دەگیرێ مەزهەبی هێرشی بیرەکانە کە فرۆید بانگەشەی ئەوە دەکات ئەو وەك پێناوێ بۆ چارەسەری دەروونی دایهێناوە کە وادەکات بەرژەوەندیەکان بێ وردەکاری جڵەوی یادەوەریەکانی بگرن. ئەمەش داهێنانی ئەو نەبوو بەڵکو داهێنانی (سێرفراستس گالتۆن) بوو کە زیاد لەچوار سەدە پێش فرۆید دایهێنا، گیلنز ئاماژە بەوە دەدات فرۆید ئەو بیرۆکە بنەڕەتیەی لە نیتشە دزیوە کە پەیوەندی پاڵنەر و حەز و هەڵسوکەوتەکانی مرۆڤ بە پاڵنەرە ناوەکی و نەزانراوەکانی ئارەزووەوە دەبەستێتەوە.

یۆنگ ئاماژە بەوە دەدات ئەو پاڵنەرە جنسیەی فرۆید بەتەواوەتی پشتی پێ بەستووە تەنها پاڵنەرێکە لەنێو چەندین پاڵنەری جۆراوجۆردا.

یۆنگ و مەکدۆگل ئەوەیان سەلماندووە کە عەقڵی باتین (کە فرۆید دایهێنا) تەنها خورافە و خەیاڵێکە. فرۆید لە مەسەلەی عەقڵی باتین و عقدئردیبدا مشتومڕی لەسەر کرا. دواجار بەڕاکانیشیەوە سەبارەت بە شیکاری دەروونی و گیان و خەو کە تەنانەت لە دەروونی خۆیشیدا جێی شلۆقی بوون و نکوڵییان لێکرا.

دیارە هێزە وێرانکەرە جیهانیەکان سووربوون لەسەر بڵاوکردنەوە و پاراستنی ڕاو بۆچوونەکانی فرۆید تا کۆمەڵگەکان داڕمێنن و گیانی بێ ڕەوشتی بوروژێنن و

بانوویشی بۆ بهێننەوە. بیانوش بهێننەوە بۆ بە ڕەواکردنی لەباربردنی منداڵ و دروستکردنی ڕێگرەکانی سك کردن لەپێناو شێواندن و تێکدانی نەوەکان دا.

## *گەندەڵی فەلسەفە بوونگەراییەکان:

فەلسەفەی بوونگەرایی بەرهەمێکی ماددیەت و بێ ڕەوشتی و بتپەرستیەکە بیری ڕۆژئاوایی لێپێکهاتووە، ئەمەش دوای ئەوەی ئەو بنەڕەتەی ئاین تێکشکا کە بنەڕەتی قەوارەی حەقیقی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگەکان بوو. فەلسەفەی بوونگەرایی قۆناغێکی فراوانی بەرەو نکوڵی بوونی خواو ئازادی مرۆڤ لە هەڵسوکەوت کردنی بەشێوەی ئازادی بێ ڕەوشتی بریوە کە تیایدا کۆتی ئەخلاقی و کۆمەڵایەتی و ئایینی نامێنێ. بوونگەرایی ملهوڕی کە سارتەر دایمەزراند لە کۆمەڵگە داڕماوەکان و لای گەنجی دەروون بەزیوی بەردەم ئارەزووەکانی ژیار پێشوازی لێ کرا. ئیدی ژەهرە لەناوبەرە بکوژەکەی لە کۆمەڵگە مرۆییەکان دا بڵاوبوویەوە بەتایبەت لە کۆمەڵگە ڕۆژئاواییەکاندا بەجۆرێ دەبینیت بوونی مرۆیی تەنها سەرپێیە، دوای جەنگی دووەمی جیهانی وەك پەرچەکردارێکی ئەو شکستانەی کۆمەڵگە ئەوروپیەکان بەدەستیەوە دەیانناڵاند لەڕێی نوسینە شانۆییەکانی ئەوروپاوە بە فراوانی بڵاوبوویەوە.

ئەو فەلسەفەیە هیچ بیرۆکەیەك لەو بیرۆکە بنیادنەرە ڕاپەڕیوانە پێشکەش ناکات کە زامنی خۆشی و چاکەن بۆ نەوەکانی مرۆڤایەتی و وەك موستەفا غالیب دەڵێت ملهوڕیو زەندەقە و هەر تەقە دەکات بنەمای جەختکردنەوەی گرنگ کە فەلسەفە بێ ڕەوشتیەکەی لەسەر بنیاد دەنرێ، هەر تەقەی سارتەر لە نیشاندانی دەقە هێرش بەریەکان دا ئەو توانایەی تێکشکاند کە مەسەلە جیاجیاکان لەخۆ دەگرێ، ئەوەش بە واتای ڕوونی ئەو وشەیە فەلسەفە نیە بەڵکو چەند خاڵێکن لە دیدی ماددیگەری لە بیرکردنەوەدا دەنوێنن.

ڕۆژنامەی هیرالد تریبون پوختەی ئەو کۆڕبەندەی بڵاوکردەوە کە تیایدا چەندین بیریاری فەرەنسی قسەیان کرد، ئەو بیریارانە قۆناغی دوای سارتەریان دەنواند و دەیان وت سارتەر لەگەڵ کەس دا مشتومڕی لەسەر بیروڕاکانی نەدەکرد. مارکسیەتی سارتەر هەرگیز کاریگەر نەبوو، گرنگیشی نەدەدا بە خەڵك، ئەمڕۆ بیرۆکەکانی سارتەر کەوتون و چەند نەیارێکی بەرفراوانی دژ بە بیری بوونگەرایی و فرۆیدی و لەسەر ڕێبازی ئێستای دەروونزانی دەرکەوتن، سارتەر لە بورجێکی عاجی جیا ژیاوە نەك لە جیهانی حەقیقەت دا.

لە پێداچوونەوەی کتێبێکی ڕیمون ئەرونی بیریاری فەرەنسی هاوڕێی سارتەر و ڕکەبەری لەسەر ژیانی ڕۆشنبیری فەرەنسی بەدرێژایی چارەکە سەدەیەك (پەنجا ساڵ لەبیری سیاسی) دا هاتووە:

فەلسەفە جیاجیاکانی ڕۆژئاوا وەك بەرگری لە لیبرالیەتی ڕۆژئاوا دژ بە نەیارانی لیبرالیەت ڕووە و ڕاستەکان (فاشیەت)و چەپ ڕەوەکان (ئیشتراکیەت و شیوعیەت) هیچ خزمەتێکیان پێشکەش نەکردووە. ئەو کتێبە سەرکۆنەیەکی ڕاشکاوانەی هەموو ئەو فەلسەفانەی تێدایە (بوونگەرایی و وەزعیەتی دەربڕاو، پەرەسەندنی ماددی، پەرەسەندنی ڕۆحی، سودبەخشی ئەخلاقی) چونکە هەموویان نەیانتوانی بەرگری بکەن لە فەرهەنگی لیبراڵی ئەورووپا، بەوجۆرە مەترسیدارترین شتێ لە بوونگەرایی دا ئەوەیە پەرچەکرداری بیرۆکەی هەڵەی بنەڕەتی مەسیحیەتە لێرەوە هەڵوێستی مەترسیداری دێ سەبارەت بە مەرگ و ترس لە کۆتایی ژیان، دیارترین دیمەنی بیری ڕۆژئاوایی ئەمڕۆش ترسە لە مردن بەهۆی تێکەڵ بوونی ئەو دیدە مەسیحیەی دەڵێت دەبێ ڕۆح جەستە قۆرخ بکات یان سزا لەڕۆژی دوایی دا مەعنەویەو دەرکەوتنی دیاردەی خۆکوشتن لە پێشکەوتووترین و دەوڵەمەندترین دەوڵەتەکان دا.

# باسی یانزەهەم

## ( ژەهری ( هەڵبژاردەی ) ئەدەبی ڕۆژئاوایی )

بانگەشەیەکی بەرچاو هەیە کە باس لە هەڵبژاردەی ئەدەبی ڕۆژئاوایی دەکات و هاواری گەرم و گوڕی دەنوێنێ بۆ وەرگێڕانی ئەو هەڵبژاردانە بۆ ئەدەبی عەرەبی، لەڕاستی دا ئەو هەڵبژاردانە تەنها ئەو چیرۆکە جنسیانەن کە وردترین باری جنسی وێنا دەکەن و لەگەڵی دا ژیان وا دەردەکەوێ ساتێکی جنسی بێ کە داوێن پیسی ڕازاوە دەدات و لەوێنەیەکی جوان دا دەیخاتە ڕوو و کەموکورتی مرۆڤ وا نیشان دەدات کە ئەوە ڕاستی بنەڕەتی و قوڵی مرۆڤە. لەگەڵ ئەوەش دا ناکرێ ساتی لاوازی ژیانی مرۆڤ هەمان گەورەترین ساتەکان بن. هەموو ساتەکان نین و هەمیشە داواکراو نین تا بەو وردەکاریە بخرێتە ڕوو. مرۆڤ ئەوە نیە کە ئەدەبی ڕۆژئاوایی وێنەی دەکات بەوەی مرۆڤ ئاژەڵێکی جنسیە بەو جۆرە ناکرێ ساتی لاوازیش بکرێ بە پاڵەوانی و واقعی گەورەی پشت پێ بەستراو پشتگوێ بخرێ، ئەو واقعەی هەستە بەرزو باڵا جیاجیاکانی لەبەردەم دا دەکرێنەوە.

هەروەها هەڵبژاردەی ئەدەبی ڕۆژئاوا وێنایەك لە ساوایی منداڵ پێشکەشی خەڵك دەکات بە زیندوکردنەوەی ئەو ئەفسانە و خەیاڵانەی هەستە بتپەرستیەکان دەنوێنن لەگەڵ چەمکی ئەو هەڵبژاردانە بۆ چەمکی مارکسی و بوونگەریای و فرۆیدی کە مرۆڤ بە ئاژەڵ دادەنێ، چیرۆکە ڕۆژئاواییەکە لەمەوە سەرهەڵدەدات و چەمك و بەها و کۆمەڵێ ئەخلاق لەخۆ دەگرێ کە جیاوازە لەو چەمکە یەکسانەی مرۆڤ کە ئایینەکان بانگهێشتی دەکەن بۆ ڕەوشت و باڵایی.

بەو جۆرە دەبینین ئەدەب لەگەڵ ئەخلاق بە واتا دروستەکەی ناگونجێ لە ڕوانگەی چەمکە ڕۆمانتیکی و کلاسیکی و بوونگەراییەکانەوە کە چەند نمونەیەکی مۆرکداری

منگەرایی و دەورەدانی ئەو دەروونەمان پێشکەش دەکەن کە خەفەتی بکوژیان بۆ هەموو هەوڵ و خەفەتێکی بە میرات داناوە بەجۆرێ دەبینی دەروونە تینووەکان چێژ لە ئاهوگریان دەبینن، شەمشەمە کوێرەی حەزی لە تاریکی دایە، هەروەها ئەو کەسەش وایە کە هەستی ئارەزوو و ئارەزووبازی لە دڵ دا بەمیرات دانێ.

بەناوی واقعیەت و شیکاری دەروونیەوە چەند وێنەیەکی ئەدەب دەرکەوتن بەتایبەت چیرۆك کە تاویان دەدایە باری سوك و نهێنیەکانی شەرمگەیان دەخستەڕوو و زۆر چاکە و گەورەییان بریندار دەکرد و بەناوی هەناسەدان و داڕماندنی شوێنکەوتەیی لەزۆر تاوان دا زۆر شتی سوکیان ئەنجام دەدان بەو بانگەشەی ئەو کەسانەی وانین توشی چەند نەخۆشیەکی دەروونی بوون، بەبیانوی ئازادیخوازی و سەربەخۆیی تاکەکەسیەوە بانگەواز بۆ دوبارە ڕوانینە میراتی ڕەوشتی و پێوانی کۆمەڵایەتی و دەرچوون لە هەموو چەسپاوێکی دانراو بڵاوبوویەوە. ئیدی دەرچوون بوو لە هەرشتێ کە نەریت دایدەناو ئاین بە پیرۆزی دەزانی، بانگەواز بۆ ئەوە بوو کە هەموو تاکێ جیهانێکی سەربەخۆی بەها بۆخۆی بنیادبنێ کە پێوەرەکانی چاکە و خراپە ببنە تاکەکەسی و چاکەی گشتی نەبێ کە لای هەمووان بەچاکە دابنرێ و خراپەیەکی گشتیش نەبێ کە هەمووان بەخراپی دابنێن. ئیدی کۆمەڵگەیەك نابێت، چونکە گیانی کۆمەڵایەتی بنەڕەتی هەموو دەست پێوەبوونێکی کۆمەڵایەتی یە. دیاردەیەکی تری ناو ئەدەبی ڕۆژئاوایی بریتی بوو لە ڕەقی بەجۆرێ سەرچاوەکانی سەخاوەتی مرۆیی لای نوسەرانی وەك نیتشە و کەسانی تر وشکیان دەکرد کاتێ هەوڵیان دەدا لاوازان لەناوببەن و پەککەوتەکان بکوژن یان وازیان لێ بێنن تا دەمرن بێ ئەوەی کاریکەن بۆ چارەسەریان. ئەمەش وەرگێراوی چەمکی ڕۆمانی کۆنی ڕۆژئاوایی بوو کە دەبوو دادپەروەری بۆ گەورەکان بێ و پزیشکی تەنها بۆ ئەرستۆقراتیەکان دەبێ. بەڵام ئیسلام دادپەروەری بۆ هەموان و پزیشکی بۆ هەژارانە، ئەوان لەڕێی دڵە ڕەقەکانەوە

ژیارێکیان دامەزراند کە لەسەر تالآنی و ئابڕوو بردن وەستاوە. ئەوان دەیانوت بۆچی زنجەکان بەزیندوویی بمێننەوە کاتێ گەلانێکی تری بالآتر لەوان هەن. یان مۆنسلیکۆ دەڵێت ئایا دەکرێ خوا لەو جەستە ڕەشانەدا گیانی زیندوویی دروست کردبێ. ئەم قسەیەش بیانوو بوو بۆ داگیرکاری و قۆرخکاری چونکە بەهێزەکان دەبوونە داگیرکەر. نیتشە داوای دەکرد لاوازەکان لەناو ببرێن. داروین دەیوت ململانێ لەسەرمانەوە هەبێ تا ئەوەی گەیشتە ئەوەی بڵێ لاوازەکان گەلە ڕەنگاوڕەنگەکانن.

هەندێ دەپرسن بۆچی ئەدەبی ڕۆژئاوایی ڕەشبینی و دارمان و بێهیوایی لەخۆدەگرێ کاتێ هەڵوێستەکان لەوپەڕی تاریکی دا نیشان دەدات و، سەرچاوەی ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو بیرۆکەی تاوانەی کە زاڵە بەسەر هەموو بیری ڕۆژئاوایی دا، فەلسەفەو ئەدەبیشی، بەڵام ئیسلام دان نانێ بە بیرۆکەی بنەڕەتی هەڵە و تاوان دا، بۆیە هەمیشە مۆرکی ئیجابی و گەشبینی هەیە ﴿قُلْ يَا عِبَادِيَ الَّذِينَ أَسْرَفُوا عَلَى أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا مِن رَّحْمَةِ اللَّهِ﴾ جێی سەرسوڕمانە ئەو شوێنەوارە لادەرانە لەچەند ئەدیبێکی نەخۆش دا دەرکەوتن و دواتریش ڕەخنەگرێکی بەویژدان بیر لەوە ناکاتەوە ئەوانە شیاوی ئەوە نین دوایان بکەویت. پێنج لە گەورە بیریارانی بیری مرۆیی فەڕەنسی لە فەرەنسا نەخۆش بوون، موباسان، فۆلبێر، بودلێر دوریە.

فۆلبێر: سۆزی ڕقی توند بەرامبەر خەڵك و ژیانی لە دەروون دا بوو بەهۆی نەخۆشی دەروونی سەختەوە.

بودلێر: سەر مەستی سزادانی کەسانی تر بوو بەهۆی نەخۆشی ماسوشیەوە کە تووشی ببوو.

موباسان داوای دەکرد خەڵکی وەك سەگەکان بژین.

ئالیوت و لۆرەنس و رۆبەرت لویل داوی نەخۆشی جەستەیی و دەروونی جۆربەجۆر بوون.

نیتشه: ژیانی پڕبوو له سه‌ختی و بێهیوایی، خه‌فه‌ت و که‌نارگیری گه‌مارۆی توندی سه‌ر نیتشه بوون تا به‌ره‌و شێتییان برد و به نه‌خۆشی زهری مرد.

ئه‌وانه‌ی هه‌ڵبژارده‌ی ئه‌ده‌بی ڕۆژئاواییان نوسی و تا ئێستاش نوسه‌ره‌کانمان به‌رهه‌مه‌کانیان وه‌رده‌گێڕن و داوامان لێده‌که‌ن به نموونه‌ی بالای چیرۆکی جیهانییان دابنێین به‌م شێوه بوون.

ئه‌گه‌ر بگه‌ڕێینه‌وه سه‌ر ئه‌و ئه‌ده‌به باڵایه ده‌بینین هه‌موو پاڵه‌وانه‌کانی دستۆڤسکی نه‌خۆش و ناته‌واو بوون، هه‌موو پاڵه‌وانه‌کانی فرۆید لاده‌ربوون. ئه‌زموونی برتراندراسل که ئه‌وان پێوه‌ی ده‌نازن پیس و بۆگه‌ن بووه. هافلۆن ئه‌لیس له‌ڕووی جنسیه‌وه لاوازبووه و به‌نوسینه‌کانی هه‌وڵی داوه که‌سێتی سه‌رکه‌وتوو به‌خۆی ببه‌خشێ. به‌و جۆره ده‌بینین هه‌موو ئه‌نجامه‌کان سه‌ره‌ڕای شیعری هۆگۆ و مووسیه و ڕۆستان و که‌سانی تر ته‌نها ئاره‌زووی ده‌روون و هه‌ڵچوونی ئاره‌زووی جه‌سته‌و ڕق له خه‌ڵك بوون بوون و هیچی تر.

ئه‌مه‌ش له ئه‌نجامی جیاکردنه‌وه‌ی عه‌قڵ و ویژدان و جه‌سته و ده‌روون و بیرو سۆزدا بوو، ئه‌و نه‌گونجانه مه‌ترسیداره له‌نێوان بانگه‌واز بۆ زانست و عه‌قڵ و هه‌وڵی هێنانی ئه‌فسانه و خورافه‌دا بوو.

ئه‌ده‌بی ڕۆژئاوایی مۆرکی به‌رزراگیری ڕه‌نگی سپی به‌رامبه‌ر کۆیله‌گیری گه‌له ڕه‌نگاوڕه‌نگه‌کانی له‌خۆگرتووه. به‌هه‌مان ئه‌و ڕێگه‌دا که ئه‌رستۆ و ئه‌فلاتون پێیان وابوو کۆیلایه‌تی شتێکی دادپه‌روه‌رانه‌یه و سروشت ده‌یسه‌پێنێ.

بانگه‌واز بۆ پێشنیاری ئه‌و ئه‌ده‌به له ئاسۆی بیری ئیسلامی دا مه‌ترسیدارترین هه‌وڵێ بوو بۆ داڕماندنی کۆمه‌ڵگه و به‌هامان، چونکه ئه‌و ئه‌ده‌به له‌سه‌ر وته‌ی ئه‌و خوێندنگه کۆمه‌لایه‌تیه وه‌ستاوه که ده‌ڵێت ئه‌خلاق به‌هایه‌کی خۆیی و چه‌سپاو له‌سه‌ر بارێکی دیاری کراو نیه و وێنه‌ی خۆی له‌و کۆمه‌ڵگه‌وه وه‌رده‌گرێ که تیایدایه و

کۆمەڵگەش لە هەموو دیاردە کۆمەڵایەتیەکان دا بنەڕەتە نەك مرۆڤ. بێگومان پێشنیاری ئەو چەمکانەو بەردەوام بڵاوکردنەوەیان لەڕێی ڕۆژنامەگەری و پێناوەکانی ڕاگەیاندن و تێر و تەسەل کردنی بە چیرۆك و شانۆیی و فیلمی سینەمایی ئەمانە مەترسیدارترین ئەو هەولانە بوون کە دەیانویست بیانکەنە شتی دڵنیا لە دیدی گەنجانی موسڵمان و ئەوانەدا کە هێشتا ڕۆشنبیریەکی تەواویان بنەڕەتی ئیسلامییان وەرنەگرتووە، ئامانجیش بەرپەرچدانەوەی پیرۆزی بوو لە ئایین و ئەخلاق و گومان خستنە بەهایان، بۆیە کاریگەریەکەی وێرانکەر بوو بۆ بەرپرسیارێتی تاکەکەسی و پابەندی ئەخلاقی و ئەو فەلسەفانەی داروین و نیتشە و مارکس و سارتەر و فرۆید و دۆرکایم خستیانەڕوو. ئەو ئاڕاستەیە لە ڕۆژئاوادا نامۆنەبوو، چونکە کاتێ ڕێگیرا لە ڕۆمانەکەی ئۆرەنس (عشیق اللورد تشارلی) بڵاوکاری ئەمریکی ڕایگەیاند تەورات شتێکە لەلادانی جنسی. لە چیرۆکە بێ ڕەوشتیەکانی ناو کتێبی پیرۆزدا لەوە شەرمەزارانەتر هەیە، بێگومان ئەو هەڵبژاردەی ئەدەبی و ڕۆژئاوایەی کە ئەوان باسی دەکەن تەنها یەك دید لەخۆ دەگرێت کە دیدی توندی جنسی و شۆڕشی جنس و بانگەوازکردنە بۆ دەرگا کردنەوە لە ئارەزوو بێ گوێدانە هەر سنور و ڕێکخستنێ، هەموو گێڕانەوەو ڕۆمانەکانیشیان ئەو ئاراستەیە لەخۆدەگرن.

بەو جۆرە شەپۆلی لێکهەڵوەشان لە ئەدەبی ڕۆژئاوایی دا بە شەپۆلێکی ملهوڕی لەبیری ڕۆژئاوایی دا ڕووی دا، ئەمەش لەژێر ناوی زانست و ئازادی لێکۆڵینەوە.

ئەدەبە جیهانیەکان تەنها چوار مەسەلەیان باسکردووە: خۆشەویستی بە واتای جنس و مردن و دەست درێژی جنسی، پەرستشی جەستە و پیرۆز ڕاگرتنی شەهوەت، ئەمەش لە هونەری یۆنانی ئیغریقی کۆنەوە وەرگیراوە. گفتوگۆی نێوان چیرۆك یان شانۆییش لەنێو چەند هۆکارێکدایە کینە، بێهیوایی و بێئومێدی، ڕەشبینی، بێ ڕەوشتی.

دیاره نەوەد لەسەدی ئەو چیرۆك و شانۆگەریانە لەژێر چەند ناوێکی جۆراو جۆردا وەرگێردرانە سەر ئەدەبی عەرەبی بە ئامانجی وێرانکردنی ڕەوشتمان، لەوانە وەرگێڕانەکانی تەها حوسەین و زەییات و عەنان و فیلکس فارس. ئەگەر بۆمان هەبێ بپرسین ئایا ئەو وەرگێرانانە ڕاستی وێنەی دەروونی مرۆییان خستووەتە ڕوو لە خراپترین باری دا لە قۆناغی زاڵ بوونی بیردۆزەی فرۆید بەسەر ئەدەب دا؟

دکتۆر مەهدی بن عەبود لە وانەیەکیدا سەبارەت بە کتێبێکی ئەورووپی بەناوی (قرن الأکتئاب والضجر والهم) ئاماژە بە دەربڕینێ دەکات سەبارەت بە ڕۆمان و شانۆگەری و هەستی ویژدانی. ئەو بنەڕەتە دەروونیەی بیرکردنەوە لە ڕۆژئاوادا وێنە دەکات و وێنەیەکی شلۆقی نیشان دەدات، دەترسین لە نەوەکانی دواترمان لەوەی هەڵیانبخەڵەتێنن و بەرەو گێژاویان ببەن بەجۆرێ دوای کەوتنە ناوی دەرچوون لێی سەخت بێ.

هەروەها دەڵێت: مۆرکی ئەدەبی ڕۆژئاوایی بریتی یە لە ڕەشبینی، ڕەشبینیش مۆرکە نەك هەڵوێستێکی عەقڵی، ئەنجامی زانستیش نیە. دیارترین ڕەشبینانی فەلسەفەی ڕۆژئاوایی بریتین لە شۆبنهۆر کە ئەوەی لەو فەلسەفە هیندیەوە وەرگرت کە دەڵێت هەمیشە مرۆڤ لەپشت ئارەزووەکانەوەیە.

بەڵام ئیسلام دان نانێ بە بێهیوایی و بێ ئومێدی دا، هەموو نوسەرانی بێ هیوایش بریتین لە بیکیت، کافکا، هنری میلەر.

بیکت وەك نوسەرێکی بێ هیوایی و چەرمەسەری ئەبەدی کە خاوەنی شانۆی نا مەعقوله و نوسەرێکی چەرمەسەراویە و نوسینی پڕە لە ناڕەحەتی و پاڵەوانەکانی لە خاکێکی وێرانە و لە کەناراوی ئەبەدی دا دەژین، کارو نوسینەکانی پڕن لە سەختی و شەتەحاتی خەیاڵی داڕماو.

بەڵام کافکا هۆکاری پێکهاتە ئاڵۆزە دەرونیەکەی سەرەڕای هەستکردنی زێدەرەوی بە جولەکایەتی خۆی وەك ئەوە وایە دوژمنکاریەکی بەردەوامی دژ بە جیهانی هەبێ و نوسینەکانی لە دەزووی داکەوتن و پێچ و پەناکانی خۆی پستووە. لە جیهانی ترسناکی (نەبوون) دا دەژی.

هنری میلەر وشە چوار پیتەکانی بردە ناو ئەدەب کە ئاماژە دەدەن بە ئەندامی زاوزێ، بردنیە ناو دەربڕینی ئەدەبی خۆی تا سنوری شەرم بشکێنێ و تەحەدای بەهاکان بکات، نوسینەکانی ژیانی سەرکێشی بێ ڕەوشتیان لەخۆ دەگرت بەجۆرێ غەریزەکان لەگەڵ هێزی سروشت دا ململانێ دەکەن، ئەویش شوێن پێی بیکیت و لۆرەنسی گرتووە و بەوە وەسف دەکرێ کە ڕێبەرێکی شۆڕشی جنسیە.

ئەمە ئەو ئەدەبە ڕۆژئاواییەیە کە بە ئەدەبی باڵا ناودەبرێ، ئەی ئایا بەڕاست ئێمە پێویستمان پێیەتی.

# باسی یەکەم

# (ئاشکرا کردنی هەوڵەکانی تەنگپێهەڵچنین)

لە بەدوادا چوونی بیری ڕۆژئاوایی لە هەرسێ قۆناغەکەی دا (یۆنانی و مەسیحی و ماددی) دەبینین تەنها لەسەر ئارەزووی مرۆیی وەستاوە وە لە هەوڵێکی پێشنیاری چەمکێکی کۆمەڵایەتی جیا لەو دیدە خواناسیەی کە دان دەنێ بە بەخشی خوادا، بەڵکو نەگونجانیشە لەگەڵ ئەو دیدە دا لەژێر ناوی دژایەتی لەگەڵ ئایین و کڵێسا و لە هەوڵی دامەزراندنی نیزامێکی مرۆیی دایە لە ڕوانگەی ئەو ئایدۆلۆژیا و فەلسەفانەی کە نەیانتوانیوە ببەخشن و دیدیان شێواوەو لەسەر گومان و ئارەزووی دەروون نەوەستاون. ئیدی ڕۆژئاوا لە ماوەی پێنج سەدەی ڕابردوودا لە ململانێیەکی بەردەوامی وادابوو کە لەناو خۆیدا پەرتبوون و غوربەت و ڕاڕایی لەخۆگرتبوو و دیدی خۆبەگەورەزانی بانگەشەی بێباک بوون لە بەخششی ئایین دەرکەوت.

پێناوی فێڵزانانەی ڕۆژئاوا لەپێناو دەستگرتنی بەسەر سەرچاوەکانی سامان لە جیهانی ئیسلام دا بریتی بوو لە پێشنیاری ئەو بیرە تێکەڵە شێواوە: دارو پەردووی ساختەو ساوایی مرۆڤ لە ئاسۆیی ئیسلام دا تا نەنگی پێهەڵچنێ و لە دیدە بنەڕەتیەکەی جیا بکاتەوەو دەستی بەسەردا بگرێ، موسڵمانان ماوەیەك لەژێر فشاری کاریگەری بە شوێنکەوتەبی بۆ ژیاری ڕۆژئاوا و هەڵخەڵەتان بە بانگەشەی ڕێبازی زانستی تووشی شیرك بوون، دواتر بێداربوونەوەو ڕاچڵەکین کاتێ ڕووداوەکانی یەکدوای یەك هاتن و قەناعەتیان کرد بە خراپی ئەو دیدە و بڕوابوونیشیان بەئیسلام وایکرد لە شوێنکەوتەیی ڕزگاریان بکات و بگەڕێنەوە بۆ سەرچاوەکان. دواتر هەنگاوی دواییان بەرەنگاربوونەوەی ئەو بیرە ماددیە بتپەرستی یە بێ ڕەوشتیە و ئاشکراکردنی ساختەکانی بوو، ئیسلام لە هەموو مەسەلەیەك دا هەڵوێستی ڕوونی هەیە، سەبارەت بە

ئاشكراكردنی خراپەی بیردۆزەی ڕۆژئاوایی لەڕێی دەستەوسانبوونی لە پەیوەندی لەگەڵ ڕێبازی خوا و دواتر مرۆیی بوونی و دەستگرتنی فەلسەفەی ماددی بەسەری دا.

یەكەمین ئاماژەكانی بەرەنگاربوونەوە كە كە ئەو بڕیارە هەڵەیان ئاشكرا كرد كە لەسەر دەستی تەها حوسەین و زەكی نەجیب مەحمود و لویس عیوەز و عەلی عەبدولرەزاق و مەحمود عەزمی و كەسانێكی تر بانگەشەی بۆ دەكرا (توانای ڕێبازی زانستی ڕۆژئاوا لەسەر بەخششی ڕووتەن بەجۆرێ دەكرێ بوترێ ئەو بیردۆزانە تەنها چەند ڕاستیەكی زانستین. مەترسیدارترین شتێ ئەوان دەیڵێن ئەوەیە بیردۆزە فەلسەفیەكان كە بەرهەمی چەند عەقڵێكی مرۆیین لە بواری تەحەدیەكانی كۆمەڵگەكانیان دا– لەبارێكی جیا لە باری كۆمەڵگەی ئیسلامی دا چەند زانستێ بوون وەك ئەوەی سەبارەت بە فرۆیدی و بوونگەرایی و ماركسی و سەرمایەداریی هەبوو.
دواتر ڕۆژان خراپەی ئەو بانگەوازەیان كرد كە ئەو ڕێبازە فەلسەفیانە لەسەر هەندێ بەخششی زانستی ماددی پشتیان پێ بەستبوو بەڵام خێرا گۆڕان و بەرهەمەكانیان لەدەست چوون.

یەك داوی یەك ڕوداو و گۆڕانكاریەكان دەهاتن و دەستەوسانی ڕێبازی زانستییان نیشان دەدا سەبارەت بە بەخشین و بوونی چەند درزێ لە چەندین بواردا بەتایبەت لە زانستە مرۆییەكان دا كەپشتیان دەبەست بە ڕێبازی زانستی ماددی و جیاوازیە قوڵەكانی نێوان زانستەكانی پەیوەست بە ماددەو ئەوەی پەیوەستە بە دەروونی مرۆییەوە لەبیركرابوو، دواتر گۆڕانەكانی كۆمەڵگەكان دارمانی چەند بیردۆزەیەكی ئابوری و كۆمەڵایەتی و سیاسیان نیشان دا كە دەمێك بوو بانگخوازانی ڕۆژئاواگەری بانگەشەیان بۆ دەكرد.

موسڵمانان بۆیان دەركەوت ناكرێ وا زانستەكانی ڕۆژئاوا وەربگیرێن كە تاكە پەیڕەون بەڵكو ئەوەی لە ڕۆژئاوا وەردەگیرێ دەبێ وەك كەرەستەی خاو وابێ و موسڵمانان لەبازنەی چەمك و واتای خۆیان بۆ زانست بەكاری بهێنن.

موسڵمانان نایانەوێ لە بازنەی تەکنەلۆژیای جیهانی دا دەورەدرێن و تیایدا تێکەڵ ببن و ببنە بەشێ لەو نیزامە جیهانیەی کە دەچێتە بازنەی شوێنکەوتەیی و پێ سەرسامبوون، چونکە ئێمە لە ئیسلام دا چەمك و واتایەکی جیا و دوور لەو چەمکە ئابوریە جیهانیەمان هەیە کە قۆرخکاری و سوو و دەمارگیری و ململانێی چینایەتی و بەرزراگیری ڕەگەزی سپی و دەستگرتن بەسەر خەڵکی تردا داپۆشیوە. ئێمە سەرەتا داوا دەکەین زانستەکان وەرگێڕدرێنە سەر زمانی عەرەبی و دواتر لە بازنەی بیری خۆمان و چوارچێوەی چەمك و واتای خۆمان بۆ زانست بەکاریان بهێنین، هیچ خۆ بەگەورە زانین و پاڵدانە ڕەگەزێ یان دەستەیەکی تیا نیە، بەڵکو لە چەمکی ئیسلام دا موڵکی هەموو مرۆڤایەتی یە. ئەمەش پێناوێ نیە بۆ هەرەشە لە مرۆڤایەتی یان وێرانکردنی بەڵکو بۆ پاراستن و بنیاد و چاکەیە، لێرەدا چەند هەوڵی هەبوون بۆ تەگیپەڵچنینمان لە بازنەی زانستە نوێکان و تەکنەلۆجیادا تا ژیاری سەربەخۆی خۆمانمان نەبێ. ئەگەر لەباری لاوازیەك دا کە ئێستا پێیدا تێپەڕ دەبین ئەوە قبوڵ بکەین خودێتی خۆمان لەدەست دەدەین و لە نێوەندی ژیارێك دا تێکەڵ دەبین و کۆتا هەناسەکانمان هەڵدەکێشین.

هەروەك چەمکی ئیسلامی بۆ زانست و ڕۆشنبیری دان نانێ بەو دیدە ڕۆژئاواییەدا کە پشتی پێ دەبەستێ بە پێوانی مەنتیقی و بە بنەڕەتێکی دادەنێ بۆ ڕوانین، لەگەڵ ئەوەی تەنها پێوانی مەنتیقی بەس نیە بۆ دانانی بیردۆزەکان بەتایبەت ئەگەر لەگەڵ واقیعی مێژوودا نەگونجێ، هەروەها بەشایەتگرتنی واقیعیەکان لە مێژوودا ناڕوونە هاوکات سەرشێوێنیەکی زانستی و هەوڵی قۆرخکردنی دەقەکانە بۆ پاڵپشتی دیدێکی پێشوەخت چونکە بەشێ لە حەقیقەت پێشکەش دەکات و چەند بەشێکی تریش لەبیردەکات، ئەم پێوانەش ئەو پێوانە خراپەیە کە ڕاستی زانستی پشتگیری ناکات، پێوانی مەنتیقی (کە مارکسیەت وماددیگەری جەدەلی و بوونگەرایی لەسەر وەستاوە)

بەس نیە بۆ دامەزراندنی بیردۆزەو مەزهەبەكان بەتایبەت ئەگەر لەگەڵ ڕاستیەكانی مێژوودا نەگونجێ.

بانگخوازانی ڕێبازی ڕۆژئاوا لە زانست و عەقڵانیەت دا لە ڕاستی دا دەیانەوێ بیردۆزە فەلسەفیەكان بسەپێنن (نەك زانستی ئەزموونی كە ئێستا دان دەنێت بە بوونی جیهانی غەیب دا) بەڵام بانگەشەیەكی پوچ بەو وتەی دەڵێ فەلسەفە زانستە، هەركەس مێژووی ململانێی نێوان زانایانی ئەوروپا و كڵێسا و مەسیحیەت بخوێنێتەوە ئەوا دەزانێت فەلسەفەكان هەوڵێكن بۆ گرتنی ئەو بۆشاییەی هەیە بە خستنەڕووی ئایینی مرۆیی دوای ئەو هەڵمەتە سەختەی زانایان بردیانە سەر مەسیحیەت و وتیان كەسی ئەورووپی دوای خۆڕزگاركردن لە كۆتی ڕێنمایی یەكلاكەرەوەی مەسیحیەت لە ڕۆح دا و چوونی بە كەسی ڕۆشنبیری یۆنانی دا توانی دروست كردن و داهێنانی هەبێ، ئەمەش كۆتایی هێنا بە دواكەوتەیی مەسیحیەت لە مادەی ئەو دە سەدەیەدا كە وەریان گرت بوو. هەندێكی تر دەڵێن ئەوروپا دوای جیابوونەوە لە ئایین پێشكەوت، لەكاتێك دا زانست لە ئیسلام دا لە ئەنجامی خودی بانگەوازی ئایین دا دەركەوت، خوا دەفەرموێت ﴿قُلِ انظُرُواْ مَاذَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ﴾ ﴿قُلْ هَاتُواْ بُرْهَانَكُمْ﴾.

زانایانی ڕۆژئاوا نەگونجانی كتێبە پیرۆزەكانیان لەسەرچاوە مێژووییەكان دا ئاشكرا كردووە. ئەوەش كە لێكۆڵینەوە زانستیە نوێكان سەبارەت بە خراپی ئەگەرەكانیان دا سەبارەت بە حسابی كات و دروست بوونی بوون و هی تریش سەرەڕای ناكۆكی و نەگونجانی نێوان عەهدی كۆن و عەهدی نوێ.

هەوڵی ڕۆژئاواگەریەكان (تەها حوسەین و عەلی عەبدولرەزاق و لوتفی سەید و سەلامە موسا) بۆ ئەوە بوو ئەو جەنگە بگوێزنەوە بۆ ئاسۆی ئیسلام و كەوتنە باسی گومان لە قورئان و سوننەت وەك خۆ چواندن بە جەنگی ڕۆژئاوا لەگەڵ كتێبە پیرۆزەكان دا. دواتر بانگەواز بۆ عەلمانیەت و عەقڵانیەت وەك هەوڵی گومان خستنە

سەر سروش و پەیامەکانی ئاسمان بوو، بەڵکو قۆرخکردنی ئەو چەمکانەی موعتەزیلە کە عەقڵیان بەسەر نەقڵ دا (واتە سروش) زاڵ دەکرد. هەروەها بانگەواز دەکرا بۆ گومان خستنە سەر کۆن و چاوپێداخشاندنەوەی، مەبەست بە کۆنیش تەنها ئایینە (لێرەدا کتێبی خورافەی میتافیزیقیا واتە خورافەی عەیب و بانگەشە بۆ ئەوە هەبوو کە ئاین لە ئاسمانەوە دانەبەزیوە بەڵکو لە زەویەوە هاتووە وەك چۆن خودی ژیان لە زەویەوە هاتووە) (تەها حوسەین ئەمەی لە دۆرکایمەوە وەرگرتووە) چەند بانگەشەیەکی حکومەتی ئایینی لە ئیسلام دا هەبوون (لەگەڵ ئەوەی ئیسلام لە هەموو مێژوویدا ئەو حکومەتەی نەبووە) هەروەها نکوڵی سروش و هێرش بردنە سەر هاوەڵانو وەسفکردنیان بە سیاسی شارەزا. زیندووکردنەوەی ئەفسانەی بیری کۆنی بتپەرستی و بانگەوازەکەی عەلی عەبدورەزاق و دانانی هۆنەر و میکیاڤیلی بە بنەڕەتی شرۆڤەی بیری سیاسی ئیسلامی لە کتێبەکەی دا (الأسلام و أصول الحكم) بانگەوازەکەش ڕووەو عەرەب بوو دوای شکستی ١٩٦٧ کە دەیوت ئیتر دەبێ بە یەکجارەکی لە ڕابردوو دەرچین.

ئەوە ئەو نوسەرە دیارانەبوون کە کاریگەر بوون بە بیری ڕۆژئاوایی (بتپەرستی ماددی بێ ڕەوشتی) بەرامبەر بە ئیسلامی پاك و پوخت (بانگەواز بۆ یەك خواپەرستیو ڕەحمەت و برایەتی مرۆیی) هەموو ئەوانە توشی هەڵەیەکی گەورە بوون کە بڕیاردانە بەوەی ڕەخنەی ڕۆژئاوایی بۆ ئایینی مەسیحی و کاریگەری لە ژیاری ڕۆژئاوایی دا دەکرێ بەسەر ئیسلامیش دا بچەسپێ. بەڵام جیاوازی نێوان بیری ئایینی مەسیحی لاهوت و ئیسلام کە ڕێبازی ژیان و نیزامی کۆمەڵگەیە زۆر قوڵ و فراوانە. ئیسلام ژیاری پوختی یەکخواپەرستی پێشکەشی مرۆڤایەتی کرد و مرۆڤایەتی لە کۆتی بتپەرستی و مرۆڤ پەرستی ڕزگارکرد. بزاڤی بێداریخوازی ئیسلامی بەرەو ڕووی نوسینەکانی ئەو ڕۆژئاواگەرانە بوویەوەو چەمکە شێواوەکانی تێکشکاندن، بەڵام هەندێکیان هێشتا

سورن لەسەر هەوڵەکانیان سەرەڕای وشکی شێوازیان و ڕقی خەڵك لێیان. هەروەها سەرەڕای ئەوەی ڕۆژنامەگەری عەلمانی گرنگی و پایەی پێدەدا لە جەختکردنەوە لەسەری و کۆتکردنی وەڵامی نەیارانی، ئەوەی بەهێزتریان دەکردن ئەوەبوو ڕیشەی ئەو بیردۆزە سەرشێوێنە فەلسەفیانە تا ئێستاش لە زانکۆو پەیمانگاکانمان دا وەك زانستی بێگومان دەخوێندرێن بەتایبەت مەزهەبی داروین و بیردۆزەکانی فرۆید و مارکس و دۆرکایم و سارتەر و.... هتد.

پێویست چاو بخشێنینەوە بە نوسینەکانی ئەو نەوانەدا کە پێشەنگ دادەنران بە لوتکەی زانایان ناسراون هەر لە تەهتاویەوە تا تەها حوسەین و لوتفی سەید و کەسانێکی تر کە ئەمڕۆ خەڵکی پێ هەڵدەخەڵەتێنن تا ئەو چەمکە سەرشێوێنیانە پێش بخەن.

هەروەها نوسینە وەرگێڕاوەکانی ڕۆژئاوا کە هەوڵ دەدەن بیانسەپێنن بەسەر موسڵمانان دا تا ئێستاش بەردەوامن:

- پەیمانی کۆمەڵایەتی ڕۆسۆ.
- بنەڕەتی جۆرەکانی داروین.
- سەرمایەداری کارل مارکس.
- جیاوازی ڕەگەزە مرۆییەکانی جۆبنیۆ.
- هەڵکەوتەی بیروزو.
- نەخۆشیە دەروونیەکانی ژیانی ڕۆژانەی فرۆید.
- میری میکیاڤیلی.

بۆرگماتی ولیەم جیمس.

- بیردۆزەی دیوی.

کۆماری ئەفلاتون.

ئەو کتێبانەی وەرگێڕاون و لە ڕوانگەی چەند لێکۆڵینەوەیەکەوە لەلایەن ئەو ناوە دیارانەی بیریاران ڕۆژئاواگەرییەوە پێشکەش کراون، ئێستا کاتی ئەوەیە ساختەی ئەو کتێبانە ئاشکرا بکرێن و ئەو ناودارانە بخرێنەڕوو و مارکس و فرۆید و دۆرکایم و لۆرەنس و سارتەر و ڤۆڵتێر و رۆدۆلسون و مارکوز و ماکس نوردۆ و مندل و بونسکۆ و بکیت و سانت نیف و سارتەر بە شێوەی ڕاستی خۆیان نیشانی خوێنەر موسڵمان بدرێن دوای ئەوەی چەند پێنوس و گۆڤارێکی عەرەبی کە بە ئاڕاستەی زەکی نەجیب مەحمود و فوئاد زەکەریا و لوتفی خولی دەرچوون ئەوانەیان ساختە کردون.

نوسەرە ڕۆژئاواگەرەکانمان دابەش بوون بۆ بانگخوازانی سەرمایەداری و شیوعیەت، بەڵام بزاڤی بێداریخوازی سەرکۆنەی هەریەک لە سەرمایەداری و شیوعیەتیشی کرد. بیری ناسراو بەبیری ڕۆژئاوایی کە چەند نوسەرێکیان پێشکەشیان کردووە بەدرێژایی سی ساڵ ملکەچی هەواداری ئەو ڕەوتانەبوون. ڕەوتی هەواداری بۆ ڕۆژئاوای سەرمایەداری یان مارکسیەتی ناسراو بە ئیشتراکی و چەپڕەوی و دەیان ناوی تری سەرشێوێن.

مامۆستا عەبدولقادر ئیدریسی وتی: ئەو تەنگژەو گرفتانەی ئەو بیرە بەدرێژایی سی ساڵ هێنای بەسەر ژیانی ڕۆژئاوایی دا بەڵگەیەک پێشکەش دەکات لەسەر شکست و پووچی و نەگونجاوی ئەو بیرە و بەشێوەیەکی تایبەتیش پەیوەستە بە سیاسەتی سەرەنجامی پەیوەست بە مەسەلەی فەلەستینەوە بەجۆرێ هەمووان دڵنیابوون ئەو بیرەی ڕێبەری جەنگی عەرەب و موسڵمانانێ دژ بە ئیسرائیل و صەهیۆنیەت و داگیرکاری دەکرد بەجۆر ناجۆرێ لە دید و ویست و ئاکاری دا هاو ڕوانگە بوو لەگەڵ دوژمن دا.

بۆ ئەوەی کەس وا گومان نەبات کە ئێمە بەرامبەر ڕۆژئاوا هەڵچوین ئەوا یەکێ لە گەورە زاناکانیان کە جۆن ستورت مل (١٨٧٣.) خاوەنی ڕەوتی سودگەری لە

ئەخلاقداو یەکێ لە خاوەن دیدی گەورەکانی لیبرالیەت قسە لەسەر بەرتەسکی ئاسۆی دیدە ئەورووپیەکان دەکات کە وایکردووە هەندێ لە حەقیقەت بزانن و بە هەموو حەقیقەتی بزانن. دان دەنێن بە لایەنی ماددی یان ئابوری یان کۆمەلایەتی ژیانی مرۆڤدا بەلام دان نانێن بەلایەنەکانی تردا. هەر لایەنێکی ژیانی مرۆڤ لە ڕەوتی ڕاستی خۆی لادەدات و زۆر زێدەڕەوی دەکات لە گرنگی پێدانی دا بەجۆرێ سنورە مەعقولەکان تێدەپەڕێنێ. ئەوەش سەرچاوەی کەموکورتی بنەڕەتی هەلوێستی ئەورووپایە. ئەوە کەموکورتیەکی ڕۆشنبیری جەرگەی ڕۆشنبیریە بەلام ڕوانینە بۆ مرۆڤ. ئەمە ئەو کالا خراپەیە کە فرۆشتیان بە موسلمانان، بەلێ مارکسیەت و دیموکراتیەتیش نەیانتوانی ڕێبازێکی دروستی پەیڕەو بدەن بە موسلمانان، بەلکو لە بەرەنگاربوونەوەی ئەو بیرە ئیسلامیەدا کە کرۆکی لە ڕێبازی بەهێزی خواییەوە وەرگیراوە بەرەو ڕووی سەختی زۆربوونەوەو هیچ ڕێبازێکی مرۆیی ناتوانێ ڕێبازی ئیسلام ببڕێ یان بەسەریدا زال بێ، ئەو ڕێبازانەش کاتێ لە ئاسۆی بیری ئیسلامی دا خۆیان خستەڕوو و خێرا کەموکورتی و دەستەوسانییان لەو بەخششە دەرکەوت کە دەرونی ئیسلامی لە ڕوانگەی چەمکی پتەو و چەسپاوی گشتگیری ئیسلامیەوە ماوەی چواردە سەدەیە لە ڕێی ئیسلامەوە دەیبەخشێ و چەندە لێی دووربگرین هەر لە کرۆك دا وەستاوە. ئیبن خەلدونیش ڕاست دەکات کە دەلێ: عەرەبەکان ڕێبەری و ملکەچی و ژیاریان بۆ نەبوو لەڕێی پێغەمبەرایەتی یان ویلایەتی ئایینی یان بەرهەمی ئایینیەوە نەبێ. هەولەکانی شالاوی برین و ملکەچی کردنی موسلمانانیش سەرکەوتوو نەبوون چونکە ئەوان لە هیچ ڕێنیسانس یان چاکسازی بوارێکی ژیانیان دا ئەملاولا ناکەن و تەنها لە سایەی ئایینی دروستی خوایی دا لێدەنەون، ئەو ئایینەی کە بەردەوام بەهێزترین هێزی پالنەرە بۆ بزافی مێژوویی و ژیاری گەورەیان بە درێژایی سەدەکان.

ئیسلام لە قۆناغی تەنگژەکان دا دەتوانێ لەناوخۆوە ببوژێتەوە و دژی ئەو هەولانەی شالاو ڕۆژئاواگەریەك بوەستێ کە مەبەست سەپاندنیەتی بەسەر ئیسلام دا. لەبواری فەلسەفەش دا پیلانەکە ڕوون بوو. وەرگێڕانەکانی فەیلەسوفانی ڕۆژئاوا (کانت سیبونزا- لینتز- هیگل- ولیەم جیمس- برتراند راسل) وەك فەلسەفەی شلۆقی وەستاو لەسەر گەورەکردنی کەسەکان و هەولی رازی کردنی خوێنەر بە ئارەزووەکانیان هاتن بێ ئەوەی بیری بیرێکی دروست سەبارەت بە (سەردەم) فەیلەسوف و تەحەدیەکان پێشکەش بکات بەلکو شتێ نەبوو کە بکرێ ئێمە وەك موسلمان سودی لێوەربگرین.

هەروەها وەرگێڕانی فەرهەنگی یۆنانی یان تەسەوفی فەلسەفیش بە تێکەلیەکی سەرسوڕهێنەری نێوان فەلسەفە میسالی و ئەزموونی و عەقلانی و عەبەسیەکان وابوو. هەروەها پێشکەش کردنی چەند کەسایەتیەکی شێواوی ناو بیری فەلسەفەی ئیسلامی (ئیبن عەرەبی، مەسکەویە، ئیبن روشد، پوختەی نوسینەکانی ئەرستۆ، ئەفلاتون، ئەفلۆتین)وابوو.

مەحمود قاسمر و عەبدورەحمان بەدەوی و ئەهوانی و عەلی عەبدولواحید وافی و ئەبولعەلا عەفیفی پردێ بوون بۆ وەرگێڕانی بیری ڕۆژئاوا بێ ئەوەی تیشك بخەنە سەر ئەوەی کە لەبەردەم خوێنەری موسلمان دا دەردەکەوێ و ڕاستی پەیوەندی و جیاوازی چەمکی نێوان بیری ڕۆژئاواو بیری ئیسلامین مەگەر شتێکی کەم لەو نوسینانەی حضری و تەفیق تەویل و عەبدولهادی ئەبووریدە.

زێدەڕۆیی ڕۆژئاوگەراکان لە سەپاندنی چەمکە هاتووەکان دا زۆربوو بەجۆرێ زەکی نەجیب مەحمود تایبەتمەندی داناوە بۆ (زالکردنی بە تەنها عەقڵ بەبێ چەمکی کۆکەرەوەی مرۆڤ).

سەبارەت بە عەبدورەحمان بەدەوی ئەوا گرنگی داوە بە کەسایەتیە لادەرەکانی وەك حەلاج و سەهرە وەردی و ئیبراهیم بیومی تاییەتمەندی زیندووکردنەوەی ئیبن سینا بوو سەرەڕای ئەو تۆمەتانەی بەرەو ڕووی کراونەتەوە بەوەی دۆستی باتینیە قەرمەتیەکان بووە.

دواتر زەکەریا ئیبراهیم و فوئاد زەکەریا بەڕێی گوێگران دا هاتن و زیندووکردنەوەی خوێندنگەی تێکەڵی فارابی و ئیبن سینا و ئیبن روشد و کندی هاتەوە کایە تا موستەفا عەبدورەزاق و عەلی سامی نەشاری خوێندکاری هاتن و ئەو مەسەلەیان خستەوە سەر باری دروستی خۆی.

لە سایەی ئەو گۆڕانە ڕوونەدا چەمکی فەلسەفەی ڕۆژئاوایی لەسەر حەقیقەتی خۆی دەرکەوت، وەك دکتۆر تەفتازانی وەسفی دەکات ئەوە ئەو بیرە ئازادیە عەقلانیەیە کە سەربەخۆ لە سروش و ڕێنماییەکانی پێچەوانەی ئیسلام ڕێی خی دەبڕێ، چونکە لە ئیسلام دا عەقڵ پەیوەستی سروشە، ئەگەر هەڵەو ڕاستی هەبێ ئەوا پێغەمبەر (ﷺ) وەك لە بیروباوەڕ و حوکمی ڕێی سروشمان دا هاتووە بەدوورە لە هەڵە، بۆیە هەمیشە پێویستە ئەوەی عەقڵ پێی دەگات لەسەر بنەمای سروش ڕاست بکرێتەوە، بێگومان بانگەوازی گومان خستنە مەنقول هەوڵێکە بۆ گومان خستنە سروش و ئەوەی لە قورئان و سوننەت دا لەڕێی پێغەمبەری خواوە بۆمان هاتووە.

بانگەوازی ئیسلامیش بریتی یە لە بەکارهێنانی عەقڵ لە بینین و ڕوانین و پەندە وەرگیریدا ﴿فَاعْتَبِرُوا يَا أُولِي الْأَبْصَارِ﴾ ئەمە بەو واتایە نا کە عەقڵ پێش شەرع بکەوێ. چونکە موڵکیەتەکانی مرۆڤ و لەنێویان دا عەقڵی بەڵگەخوازی سنوردران چونکە عەقڵ لە هەموو بارەکانی دا دوورنیە لە ئارەزوو یان سۆز.

بیری ئیسلامی لە سەردەمە جیاجیاکان دا ئەو ئاراستەی دانەناوە کە دیدی عەقڵ و حوکمەکانی سروش پێکەوە دەبەستێتەوە. زانایانی یەکخاپەرستی سوور بوون لەسەر

چەسپاندنی ئەو بیروباوەڕەی لەڕێی ڕوانینی عەقڵیەوە لە سروش دا هاتووە. ئیبن تەیمیە لە (موافقە صریح المعقول لصحیح المنقول) دا ئەوەی ڕوون کردوەتەوەو پێویست نیە ئەوە بچێتە ئەندێشەوە کە ئەو بیروباوەڕ و حوکمەی ئیسلام هێناویەتی لەگەڵ عەقڵ دا نەگونجێ، چۆن ناگونجێ؟ لەکاتێك دا قورئان بیروباوەڕی ئیسلامی بەسەر عەقڵ دا نیشان داوە و بانگی کردووە تا مشتومڕی لەسەر بکات تا حەق لەناحەق جیابکاتەوە و بەڵگەی ڕوونی پێداوە، هەروەك بیروباوەڕی پێچەوانەی بە بەڵگەی دژیشیەوە باسکردووە.

سەبارەت بە چەمکەکانی زانستە ڕۆژئاواییەکان ئەوا لەگەڵ ئیسلام دا نەدەگونجان چونکە لە ملهوڕیەوە سەریان هەڵدابوو. زۆربەی مەزهەبە فەلسەفیە ئەورووپیە نوێ و هاوچەرخەکان بە ئاڕاستەیەکی جیا لە ئاڕاستەی ئایین دەڕۆن. لە ئەورووپادا عەقڵ ئاراستەیەکی دژی ئایینی هەیە کە ئەمەش پەرچەکردارێکە بەرامبەر ستەمی کڵێسا لەڕووی بیریارە ڕۆژئاواییەکان دا. پەیوەندی نێوان سروش و عەقڵیش یەکەم بنەمای ئیسلامیە.

کاتێ ڕۆژئاوا هەستی بەوەکرد موسڵمانان خەریکە بەرامبەر ژەهری ڕۆژئاوا دەوەستن و پیلانەکانی ئاشکرا دەکەن کەوتە ڕێکخستنەوەی پەرەکانی بەوپەڕی شێوەی مەترسیداریەوە.

یەکەم: ڕێبازەکانی ڕۆژئاوا کینەی دژ بە ئیسلامیان هەڵگرتبووە و دان نانێن بە فەزڵ و چاکەی ئیسلام بەسەر شارستانیەت دا، بەڵکو ئەو فەزڵە دەدەنەوە پاڵ ژیاری یۆنان و ڕۆمان و ئیسلام بە تەنها بە گوێزەرەوەی چاکەی ئەو دوو ژیارەدا دەنێن.

دووەم: چاندنیتۆوی کینە و ڕق لە ڕێبازی فێرکاری ئەورووپیدا، ئەوان دەترسن ئەمە لە ئەندێشەی خەڵکی ڕۆژئاوادا بچەسپێ، بۆیە لە چەند بەرنامەیەکی وردا دیبەنە ناو وڵاتانی ئیسلامی و دەیگوازنەوە بۆ نێو ئەندێشەی موسڵمانان.

**سێیەم:** فێرکردنی نەوە موسڵمانەکان، ئەوانەی بە دەستە دەچن بۆ ئەوێ تا ببنە سەرچاوە بۆ بڵاوکردنەوەی سەرلەنوێی بیری ئەوان لەنێو موسڵمانان دا، بۆ نمونە دەبینین تەها حوسەین دەڵێت (بڕوا بە خەڵکی ڕۆژئاوا مەکەن کاتێ بەو جۆرە و بەو شێوە باسی خۆیان دەکەن)، ئەو کەسانەی لە ڕۆژئاوادا فێر کران و گەڕانەوە بۆ ڕێبەری بزاڤی فێرکاری و ڕۆشنبیری لە وڵاتی خۆیان دا.

**چوارەم:** ئەو شەپۆلە نوێیەی لە ڕۆژئاوا دان دەنێت بە ئیسلام دا لێی بدرێ و گومان و پشێوی بخرێتە سەر و کار بکرێ بۆ ئەوەی چەند شایەتیەك لەسەر موسڵمانان دابنرێ بەوەی هیچ جیاوازیەکی حەقیقی نیە لەنێوان ئیسلام و مەسیحیەت دا.

**پێنجەم:** دەرکەوتنی دەقە ئیسرائیلیە هاوچەرخەکان کە گوررزیان دەوەشاند بەرەو ڕووی ناوداران و زانایانێك دا کە ڕێبەرانی ئیسلامی و پایەی ئەو ژیارە بوون. ڕۆژئاوا لە هەوڵ دا بوون بۆ نکوڵی یەکجارەکی ڕۆڵی ئیسلامی.

**شەشەم:** دەرکەوتنی شەپۆلێکی نوێی دەست بەسەدا گرتن و داڕمان و وێرانکاری لەڕێی سوود وەرگرتن لە تەکنەلۆجیای نوێ بۆ کۆمەڵێ کە لە خاکی ئیسلام دا بانگەشەی حەق دەکەن و ڕۆژئاوا لە ڕۆژهەڵات جیادەکەنەوەو پێشکەوتن دوادەخەن.

**حەوتەم:** دانانی ئیسلام بە سەرچاوەی دواکەوتن و بەستوویی و دوژمنایەتی هەستانەوە سەرپێ بەو بانگەشەی گوایە ئیسلام ئایینێکی پەرستشیەو هیچ پەیوەندیەکی نیە بە یاسا و ئابوری و سیاسەتەوە.

**هەشتەم:** ئەنجامدانی چەند هەوڵێ دژ بە ئوممەت لەڕێی هەندێ نەوەی موسڵمانان لەڕێی تەنگ هەڵچنینی کەمینەکان و ڕەگەز و لایەنە نەیارەکانی ئیسلام. ئەوەش ئەو شوعبیەتە نوێ و کارکردنە بوو بۆ لێدانی ئیسلام لەناوخۆوە.

ئەو نەخشەی کە قەڵەمڕەوی ڕۆژئاوایی بۆ تەنگپێهەڵچنینی موسڵمانان داینا ئەمڕۆ بەرەو ڕووی مەترسیەکی توند بووەتەوە، چونکە موسڵمانان خراپی ڕێبازی ڕۆژئاواییان

بۆ ئاشکرا بووەو کردنی بە ڕێبازی خۆیان لا بووە بەتاوان بۆیە جارێکی تر دەگەڕێنەوە بەرەو ڕێباز و بەرنامەی بنەڕەتی خۆیان.

ترسی ڕۆژئاوا لە گەڕانەوەی موسڵمانان بۆ مێژوو و کلتور و ڕابردووی خۆیان لەو ترسەیان دا دەردەکەوێ کە وایان لێدەکات چەند هاوارێکی ترسناکیان هەبێ، ئەوان نەخشەی گۆڕان و تەنگ هەڵچنینیان بۆ موسڵمانان داڕشت و چەند هەنگاوێکیان نان بە هەنگاوی ڕۆژهەڵاتناسی و موژدەبەری خۆیان. هێزە ڕۆژئاواییەکان دەستیان دەگرت بەسەر بەرنامەی خوێندنی زانکۆ و پەیمانگاکان دا سەرەڕای دەست گرتن بەسەر ڕۆژنامەو ڕۆشنبیری دا. دەیان باوەڕدار و کارکەری ئەو ڕەوتە دەرچوون و سەیریان کرد ئەمڕۆ جیهانی ئیسلامی متمانەی خۆی لە هەموو ئەوەدا لەدەست داوە و موسڵمانان زانییان هەڵخەڵەتاون و ئێستا ڕاچڵەکیون. ئەو ئەزموونە تاڵەش تەنها دواکەوتەیی و شوێنکەوتەییەکی سەد ساڵەی تێپەڕاند تا موسڵمانان گەڕانەوە بەرەو سەرچاوەی سەرەکی. لێرەدا ڕۆژئاوایی و شوێنکەوتەکانیان فەرهەنگی دروستکراوی زانستی خۆیان لەدەست دا و کەوتنە هێرشی توندو تیژی.

موسڵمانان بۆیان دەرکەوت ڕێبازی زانستی ڕۆژئاوایی (بەهەردوو بەشەکەیەوە) هەڵە و درۆ و سەرشێوێن بووە، هەرکات ئەو مەترسیە دەرکەوت ئەو بینایە بەرەو داڕمان چوو و موسڵمانانیش بەرەو ڕێبازی بنەڕەتی خۆیان گەڕانەوە. ئەمە گەڕانەوە نیە بۆ ڕابردوو، بەڵکو گەڕانەوەیە بۆ بنەڕەتی سەرەکی کە ڕۆژئاواگەری و شالاوی هزری قەڵەمڕەوە سەرەکیەکەیان دا شاردبوو و سڕیبوویەوە. ڕۆژئاوا وا گومان دەبات موسڵمان ئەو بارە سەردەمیەی بە ویستی خۆی قبوڵ کردووە، بەلام ئەمە ڕاست نیە، چونکە بە فێڵ و هەڵخەڵەتاندن و سەرشێوێنی بەسەریان دا سەپێنراوە، ئەگەر نا لە بنەڕەت دا تاسەی ڕێبازی بیری بنەڕەتی خواییان هەیە، ڕۆژئاوایش زانیارییان لە موسڵمانان وەرگرت و دواتر تا ئێستاش نکوڵی دەکەن و چەند چەمکێ دەکەنە پێناوی

خۆبەگەورە زانی کە لە زانستی موسڵمانانیان وەرگرتبوو، دواتر نەخشەکانیان شێواندنو بنەڕەتیان داپۆشی تا موسڵمانان نەگەڕێنەوە بۆ سەرچاوەکانیان. ئەمە ڕاستی ڕوانینی ڕۆژئاوایە بۆ خەباتی دژ بە ئیسلام کە ماوەی زیاد لە سەدەیەك پێوەی سەرقاڵ بوو.

دەیان چەمك و واتا هەن کە لای ڕۆژئاوای مەسیحی و عەلمانی و فەلسەفەی ماددیدا هەن پێچەوانەی ئیسلامن وەك ئەوەی ئیسلام لەم خاڵانەدا لەگەڵیان ناگونجێ (خوا، ئایین، ئەخلاق، خێزان، دەوڵەت، دەسەڵات، ژیان) سەرەڕای جیاوازی چەمك و ژیار و کۆمەڵایەتی و پەروەردە. هاودەم بە پۆزش هێنانەوە بۆ بەڕێز رفاعە تەهتاوی و خەیرەدینی تونسی و کەسانێکی تر کە پێیان وایە ئەوەی لە ڕۆژئاوادا دەیبینن لە ئیسلامەوە وەرگیراوە، بۆیە گێڕانەوەی ئەوانە بێ کێشەن، ئەوانە ورد نەچوون بۆ گەورەیی ناکۆکی لەسەر ئەو چەمکانەی ڕۆژئاوا لە موسڵمانانیان وەرگرتن و تێکەڵیان کردن لەگەڵ بتپەرستی یۆنانی و کۆیلایەتی ڕۆمانی.

نەخشەی نوێ بریتی بوو لە هەوڵی تەنگپێهەڵچینین بە ئیسلام و بنەڕەتی ئیسلام لەژێر ناونیشانێکی نوێدا کە بریتی یە لە (گفتوگۆی نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا) یان گفتوگۆی نێوان کەناراوەکانی دەریای ناوەڕاست بە ئامانجی بەدەست هێنانی چەند دەستبەرداربوونێکی نوێ. پیلانی نوێش ئامانجی ناونانی ڕۆژهەڵاتناسیە بە (لێکۆڵینەوە ڕۆژهەڵاتیەکان) یان (دانپێدانانێکی ڕێژەیی لەپێناو پاراستن و بردنی نەوتو بازاڕەکانی هەناردە و کەڵەکەبوونی دراودا). بەڵام ئەمە لەسەر حەقیقەتێکی بنەڕەتی لە بەرامبەردا دەوەستێ کە ئەویش بریتی یە لەوەی موسڵمانان هیچ ڕێکخستنێ ناگوازنەوە، ئەوەش کە دەیگوازنەوە وەك کەرەستەیەکی خاو وایە کە لە بازنەی بیری خۆیان دا بەو جۆرە دەینوێنن کە لەگەڵ چەمکی یەکخواپەرستی پوختدا بەگونجاوی بزانن.

# باسی دووەم

## ( هاواری ڕاستکردنەوە پاش بەرەنگاربوونەوە )

یەکەم شتێ کە بزافی بێداریخوازی ئیسلامی بەرامبەر ڕێبازی ڕۆژئاوایی هاتوو ئاشکرای کرد بە بنەڕەت کردنەوەی ڕێبازی لێکۆڵینەوەیە لای موسڵمانان بەو جۆرەی موسڵمانان لێی تێدەگەن نەك بەو شێوە ساختەیەی کە ڕۆژئاواگەران و ڕێبەرانیان لە ڕۆژهەڵاتناسان و مژدەبەرانێ بانگەشەی بۆ دەکەن و بەرگی زانایانیان پۆشیوە، پێویستە گەنجی موسڵمانی ڕۆشنبیری لەوە تێبگات موسڵمانان لە لێکۆڵینەوەدا ڕێبازێکیان هەیە جیا لە ڕێبازی ڕۆژئاوایی وەرگیراو لە ڕێبازی یۆنانی، ڕێبازی ئیسلام بنەڕەتی خۆی لە ڕۆحی فکریەکەوە وەرگرتووە، بیری قورئانی کە لەسەر یەکخواپەرستی دامەزراوە ڕێبازێکی هاو شێوە یان وەرگیراو و بەیەکگەیشتوو لەگەڵ ڕێبازی یۆنانی دا نیە. چونکە بیری یۆنانی لەسەر کۆیلایەتی و بتپەرستی وەستاوە.

ڕێبازی ئیسلام لەسەر وازهێنان لە تەقلید و پشت بەستن بە بەڵگەی ڕاست و ڕوانینە بوون و پەیرەوی ئەزموون و تەواوکاری بەهاکان وەستاوە، بەهای ڕۆحی و چەسپاوی و خودایی، بەڵام لەدیدی ڕۆژئاوادا بارەکە پێچەوانەیە. مەنهەجیەتی زانستی بەواتا ئیسلامیەکەی سروش و عەقڵ پێکەوە کۆدەکاتەوە و لەسەر یەکخواپەرستی وەستاوە ئایینی مرۆڤ و پەروەردگاری و برایەتی مرۆیی و کامڵیەتی نێوان بوون و مرۆڤو دانان بە فرە جۆری لە بازنەی یەکبوونی ئیسلامی دا و پێچەوانەی لقگەری ناو لقەکان.

دیارترین جیاکاری ڕێبازی ئیسلامی پەیوەستکردنی نێوان بیردۆزەو پەیڕەو و نێوان ڕێباز و ئاکار و بیروباوەڕو کارە، ئەمەش بەتەواوی جیایە لە چەمکی ڕۆژئاوا کە لەسەر جیاکردنەوەی نێوان بیروباوەڕو کارو ماددە و ڕۆح وەستاوە. دکتۆر کارل لە

کتێبەکەیدا (تجدید الأنسان) دەڵێت: (دیکارت شتە ماددیەکانی لە شتە ڕۆحیەکان جیاکردووەتەوەو دیاردەی عەقڵ دوای ئەو جیاکردنەوەیە وای لێهاتووە ڕاڤە نەکرێ. لەدیدی ئەوان دا بنیادی جەستە و شێوەی ئەنجام دانی کارە جیاجیاکانی زۆر چەسپاوترە لە بیرۆکەی نەشوەو خەفەت و جوانی. ئەم هەڵەی ژیار و شارستانیەت بەرەو ئەو ڕێگەی دەچێ کە سەرکەوتنی زانست و دارمانی مرۆڤی لێدەکەوێتەوە. ڕزگارکەرانی جیهان دەبێ لەڕووی چەندێتی و چۆنێتیشەوە لە مرۆڤ بکۆڵنەوە).

ئەمە گەورەترین لایەنی جیاوازی نێوان ئیسلام و ئەوانە، چونکە ئیسلام خاوەنی ئەو ڕێبازەیە کە وتە و کار بەجۆرێ کۆدەکاتەوە کە قورئان دەفەرموێت﴿ يا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفْعَلُونَ كَبُرَ مَقْتاً عِندَ اللَّهِ أَن تَقُولُوا مَا لَا تَفْعَلُونَ﴾.

بیری ڕۆژئاوا لە چەسپاوی ڕەهاوە (ئەرستۆ) چوو بەرەو پەرەسەندنی ڕەها (هیگل)و نەیتوانی تەواوکاری نێوان بەهاکان یان بەیەکگەیاندنی نێوان نەوەکان بەدیبێنێ. لێرەدا ئەو ململانێیە هەبوو کە بەرەو پەرت بوونی دەبرد، لەکاتێك دا ئیسلام لەسەر تەواوکاری و بەیەکگەیاندن بیری خۆی داناو.

لە بەرەنگاربوونەوەی چەند هەڵەیەکی سەخت و تۆمەتێکی مەترسیدار و هەوڵی هەڵوەشاندنی چەمکی ڕێگەی زانستی لە لێکۆڵینەوەی موسڵمانان دا دەبێ هاوارێ هەبێ بۆ نوسینەوەی مێژووی زانستە ئیسلامیەکان تا ئەو ڕاستیانەی هەردوو بواری پەیوەست بخەینە بەردەستی گەنجانی موسڵمانان:

یەکەم: بەرامبەر ئەو خۆ بێئاگا کردنە ترسناکەی کە لێکۆڵینەوەکانی زانستی ناو زانکۆکان ئەنجامی دەدەن و بە قۆناغی ڕۆژئاوایی دەست پێدەکەن و بەتەواوی ڕۆڵی موسڵمانان لە بنیادی ئەو ڕێبازەدا لەبیردەکەن.

دووەم: خۆ بێئاگا کردن لە دیدی ئیسلام لە زانستە مرۆییە جیاجیاکان دا وەك کۆمەڵناسی و ئەخلاق و ئابوری و سیاسەت.

موسڵمانان یەکەم کەسانێ بوون بنەڕەت دروستەکانی لێکۆڵینەوەی زانستییان دانان، ئەمەش لە لێکۆڵینەوەکانی حەسەنی کوڕی هەیسەم و بیروونیدا دەردەکەوێت: ئیسلام هۆکاری سەرەکی بووە وەك دکتۆر یوسف مەحمود دەڵێت- کە چاوەکانی کردونەتەوە و هانیداون بۆ رامان و بیرکردنەوە لە هەست پێکراوەکان و لێکۆڵینەوە لە بەڵگەی پەیوەست بە راو بیروراکان، ئەمەش ئەوە ڕوون دەکاتەوە دیاردەکانی بوون ملکەچی یاسای هۆکارێتین و جەخت دەکاتەوە لە جیهانی بوونی زانست چ لە وەرگرتن یان بەخشین دا وەك چۆن جوگرافیناسە موسڵمانەکان بیروباوەڕی ئیسلامی و ڕێبازی پەیڕەوکراوی خۆیان پێکەوە پەیوەست کردون و مەوزوعیەتیان هێناوەتە دی لەو گەشت و بەیان و بازرگانیانەدا کە هەیانبوون.

وەك دکتۆر حەسەن شەرقاوی دەڵێت: تایبەتمەندی ڕێبازی زانستی ئیسلامی بریتیە لە گشتگیری یاساکانی و پاشەکشەیان لە هەموو شتێ لەو بوونەدا. لێکۆڵەر یەك بابەت ناگرێتە بەر تا بیگەیەنێتە چەند ئامانجێ وەك ئەوەی لە ڕێبازە وەزعیەکان دا هەیە بێ ئەوەی ئەو بابەتە پەیوەست بێ بە ناموسی کەونی و یاسای خواییەوە، ڕێبازی قورئان ڕێنماییە نهێنیەکانی پەیوەست کردووە لەگەڵ نیزامی کەونی دا و بانگەواز دەکات بۆ پێ چەسپاوی و کەوتنە شوێن چاکە. لەکاتێك دا ئایەتە قورئانیەکان ئاماژە دەدەن بەکاری خوایی کە ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە و ڕوبارو دەریا و ئاژەڵ و شاخی خستوونەتە بەردەستی خەڵك، قورئان وەك لێکۆڵەران لە مێژوو ناکۆڵێتەوە و وەك سروشت گەرانیش لە سروشت ناکۆڵێتەوە. دەقەکانیش وا ناخانەڕوو کە چەند واتایەك لەخۆبگرن و واتاکان پێکەوە نەگونجێن وەك لە لێکۆڵینەوە نەزەری و ئەزموونیەکان دا دەردەکەوێت. قورئان وەك مێژوونوسان شیکاری ڕووداوەکان و جیاکردنەوەیان لە ڕاستیەکان پەیڕەو ناکات، چونکە مێژوونوسان ڕوداوێکی دیاری کراو دەکەنە هۆکاری شۆڕشێك، مەبەست بە چیرۆکی قورئانی تێرامان و عەقڵگەری و

بەرچاو ڕوونیە، قورئـان کاتـێ باسـی چیرۆك و ڕووداوەکـان دەکـات شـێوەی زانایـانی مێژوو بەکارناهێنێ یان دەقی فەیلەسوفان یان چەمکی زانا سروشتیەکان بـەکارناهێنێ کاتـێ باسـی بابەتـەکانی سروشـت و بـوون دەکـات، بـەڵکو گـشتگیری و ڕوونـی تێـدا بەدیدەکرێ چونکە هەموو خەڵك لـە ئاسـت و بـار و مـاوە جیاجیاکانیـان دا دەدوێنـێ، بەڵام تایبەتمەندان لەگەڵ ئەوەش دا سود دەبینن لە هەموو بازنەیەك کـە تایبەتمەنـدن بە ئایەتەکانی بوون و چیرۆکە قورئانیەکان، ڕێبازی ئیسلامی گرنگی دەدات بە دواندنی هەموو خەڵك، باوەڕدار و بێباوەڕ یان زانا و نەزانیان، پەیامی خوا بۆ خەڵك لە شـێوە و ڕەوانبێژی و واتـای دا موعجیزەیە تـا خوێنـەر یـان گـوێگر هەسـت بـەوە بکـات تـەنها ئاڕاستەی ئەوە، دیارترین ڕێنمایی ڕێبازی ئیـسلامی بریتـی یـە لـە: گشتگیری: ڕێبـازە وەزعیەکان و یاسا مرۆییەکان چەسپانیان کەمە چ عەقڵانی بن یان ڕۆحی یـان هەسـتی یان ئەزموونی ئەگەر سـاتەو ناسـاتێ چـەند بیردۆزەیـەکی نـوێ دەربکـەون قـەبارەیان دەشکێنن و گومڕایی ئەوی پاڵ خۆیان ڕوون دەکەنەوە و دیدێکی نوێ دەخەنە ڕوو کـە ڕێبازە کۆنەکان تێکدەشـکێنن و بنەڕەتـەکانی لـەکار دەخـەن. بـۆ ئـەوەی لـە کرۆکـی ڕێبازی ئیـسلام لـەبواری زانـست دا تێبگـەین ئـەو بنەڕەتانـە دەخەینـە ڕوو کـە دکتـۆر زەغلول نەجار نووسیونی:

دیدی ئیسلامی بۆ زانستخوازی لە دیدی ڕۆژئاوایی ئەوروپی جیاوازە بەجۆرێ ئـەمڕۆ لەڕێی فەلسەفەکەیەوە زانست وەردەگرێ، جیهانی ئیسلامی فەرهەنگی مرۆڤایـەتی بـە مەعریفەی ژیارەکانی پێشوو و سەردەمی هاتنی پێغەمبەریشی (ﷺ) لـەخۆ گرتـووە، ژیاری فارس و ڕۆم و هیند و چین و میسری کۆن. هـەموو ئەوانـەی کۆکردوەتـەوەو بـە مەنتیقی دیدی دروستی ئیسلامی هەڵبژاردەی کردون و کۆمەڵێ زیادەکاری بنەڕەتی بۆ کردووە. کاتێ ئەورووپا لەڕێی خوێندنگە ئیسلامیەکانی ئەندەلوس و باشوری ئەورووپاوە بەشێوەیەکی گشتی (صقلیە و باشوری ئیتالیا) ئەوەی لە ئیسلام وەرگرت جیاوازیەکـە

بەڕوونی دەرکەوت. موسڵمانان لە ڕێنمایی و بنەڕەتەکانی ئیسلام دا شتێکیان نەدی کە ببێتە بەربەستی ڕێی چالاکی زانستییان، بەڵکو لە قورئان و فەرمودەکانی پێغەمبەردا (ﷺ) هاندانیان بۆ زانست بەدیکرد. بەڵام لەسەردەمی ڕێنیسانسی ئەوروپادا هەڵوێستەکە تەواو جیاواز بوو و ئەوروپا لەو بنەڕەتەوە کە ئوممەتی ئیسلامی خوێندنگە ئیسلامیەکان لە باکوری ئەفریقا و باشوری ئەوروپا فێریان کردبوون کەوتنە وەرگرتنی هۆکار و پێناوەکان.

دووەم: موسڵمانان کاتێ لەسەر بنەمای ئیسلام پەروەردە بوون زانییان مەسەلەی گرنگیدان بە لایەنی زانستی بە پلەی یەکەم پەرستشەو تەنها بەدەست هێنانی شتێ لە هێزیان زاڵ بوون لەم دنیایەدا نەبووە. کاتێ موسڵمان دان دەنێت بە بەرزی کاری خوا لەم بوونەدا ئەوا خوای گەورە دەناسێ.

ئەو ئایەتە قورئانیانەم ژماردن کە مرۆڤ هان دەدەن تا بڕوانینە بوون. بینیم لە سەروو حەوت سەدو پەنجا ئایەتدان. ئەمە لەپاڵ ئەوەش دا مەسەلەکە دەبێ ئەرکی جێگیرایەتی مرۆیی و بەکارهێنانی بوون بەو جۆرە ئەنجام بدات کە خوا دەیەوێت. نەوەی یەکەمی موسڵمانان (کە نەوەی پێشەنگ بوون) جیاوازییان نەدەکرد لە نێوان زانستی ئەزموونی و زانستە شەرعیەکانی فیقە و تەفسیردا. موسڵمان شارەزای گەردوونی و موفەسیر و پزیشك و فیقهنایش بوو.

سێیەم: ئیسلام دیدی کامڵ و مرۆیی بۆ زانست دامەزراند جیا لە مەسەلەی پشکنین کە لە مەعریفەدا هەیە. ئەو مەعریفانەی ڕۆژئاوا لەڕێی تایبەتمەندی وردەوە وەریانگرتو وادەکەن مرۆڤ لە بازنەیەکی بەرتەسك دا پەنگ بخوات. بیردۆزەی ئەوان بۆ ژیان تەواو جوزئیە و دیدێکی نا مرۆڤانەیە چونکە کامڵ نیە. دیدی کامڵ ئەوەیە مرۆڤ بتوانێ لەو ڕوانگەوە یاساکانی خوا لە بوون دا بناسێ و ئەرکی جێگیرایەتی

لەسەر زەوی دا بە جوانترین شێوە بەجێ بگەیەنێت. هەرکات یاسای زیاتر بناسێ مەسەلەی بنیادی ژیان لەسەر زەوی دا بۆی ئاسانتر دەبێ.

چوارەم: تێگەیشتنی موسڵمان لە سروشت لەسەر ئەرکی خۆیەتی لە ژیان دا (پەرستشی خوا و جێگیرایەتی لەسەر زەوی دا) ئەمەش گرنگ و بنەڕەتیە چونکە هەردوو لایەنەکە لە ئەرکیان دا تەواوکەری ئەوی ترن. تێگەیشتن لە پەیامی مرۆڤ لەو چوارچێوەدا چەمکی ئیسلام لە پەرستشی خواو هەوڵدان بەدوای ڕۆزی دا لە چوارچێوەی بڕوابوون بە خواو هەوڵی زانستخوازی لە بازنەی ئیمان دا وەك پەرستش بەدیدەهێنێت.

دکتۆر زەغلول نەجار بەچاکی شیکاری ئەو مەسەلە دەکات و دەڵێت: ئەرکی سەرشانمانە بەرەو ڕووی واقیعی ئەو خوێندنگەیەمان ببنەوە کە ئەو زانستە ڕۆژئاواییە دەخوێنن کە نکوڵی دەکات لەخوا، ئەو فەلسەفەش کە دان نانێ بەخوادا ئەو زانستە کۆمەڵایەتیانەی نکوڵی لە خوا دەکات، ئێمە ناتوانین پیاوانێکی باوەڕدار بە خواو پێغەمبەرەکەی بین لەکاتێك دا پەیمانگاکانمان وانەیەك دەخوێنن کە نکوڵی بوونی خوا دەکات.

ئەو مامۆستایانەی لە خوێندنگە و پەیمانگەکانمان دا وانە دەڵێنەوە تۆوی گومان لە دڵی گەنجان دا دەچێنن سەبارەت بە گومان خستنە سەر ئیسلام و درێژە بەو هەوڵەیان دەدەن خەڵکی قەناعەت پێبێنن ئیسلام ئایینێ نیە کە ژیاری هەبێ و مەدەنیەتی نیەو بنەمای سیاسی و نیزامی ئابوری نیە، ئەگەریش هەیبێ ئەوا شیاوی پێویستیەکانی سەردەمی ئێستا نین. هەوڵ دەدەن بڵێن یاسا ئیسلامیەکان بۆ سەردەمی ئێستا ناگونجێن.

هۆکارێکی سەرەکی دواکەوتنی زانکۆکانمان لە جیهانی ئیسلامی دا لەگەڵ زۆرییان‌و بوونی پێداویستی بەردەستیان دا ئەوەیە لە دیدێکی ئیسلامیەوە لێنەڕیوون و

پابەندبوونێکی ئەخلاقییان نیە، بەڵکو لەسەر نیزامی ڕۆژئاوایی و بیری ڕۆژئاوا دامەزراون یان زانکۆی ڕۆژئاواییین لە خاکی ئیسلامی دا. ئەمەش جۆرێ لە تێکەڵ بوونی لای خوێندکاری موسڵمان دروست کردووە سەبارەت بە ڕۆشنبیری سنورداری ئیسلامی خۆی. کێشەکە تەنها لە زانست دا نیە، بەڵکو لە دروستکردنی زانستی دایە و ئامانجی بوونیشی لە فەلسەفەی ڕۆژئاوایی دایە و لە مەعریفەدا نیە هێندەی لە ئەخلاقی مەعریفەدایە. ئەو نیزامە فێرکاریەی ڕۆژئاوا سەرەڕای ئەوەی لە دانانی یاساو بنەمای فێرکاری و زانستی دا پێشکەوتنی بەرچاوی هەیە و لە بنیادی کەسی تایبەتمەندی مەسەلە جیاجیاکان دا لە ئاستێکی باش دایە، بەڵام لە لایەنی بنیادی مرۆڤەوە داڕماوە. کۆنگرەی ستۆکهۆڵمی ساڵی ١٩٨١ز. کەلەژێر ناونیشانی (زانست و تەقەنیەت لە ژیاری ڕۆژئاوایی لە ئیسلام دا) بەسترا ئەو بڕیارەی دەرکرد: پێشکەوتنی زانستی و تەقەنی ئێستا هەڕەشەیە بۆ مرۆڤایەتی سەبارەت بە سەرەنجامێ کە تەنها خوا دەیزانێ، چونکە کێشی چەکی خەزنکراوی ئەتۆمی و کیمیایی و وێرانکەری لای هەردوو لای ڕکەبەر (ڕوسیا و ئەمریکا) گەورەترە لە لەناوبردنی چەندجارەی ژیانی هاوچەرخ و خەڵکیش لە ڕۆژئاوادا بەرامبەر بەوە دوو هەڵوێستیان هەیە: یان خۆبەدەستەوەدان بۆ ئەو واقیعە و دەڵێن ئەمە قەدەری مرۆڤایەتیە و دەبێ بەرەو کۆتایی بڕوات. یان هەڵوێستی بەرپەرچدانەوەی گشتی لەسەر ئەو بنەڕەتەی ئەوە بەڵایەکەو بەهۆی پێشکەوتنی زانستیەوە هاتووەو دەبێ لەناوی بەرین و جارێکی تر بگەڕێننەوە بۆ ژیانی سروشت.

بەو جۆرە جیهانی ڕۆژئاوا کاتێ ئەو زانستانەی نوسین (کە لە خاکی ئیسلام و خوێندنگەکانمان دا دەخوێنرێن) لە دیدێکی ملهوڕی تەواو نا ئاینیەوە نوسیونی، دواتر کە خۆی گەیشتە کۆتایی ڕێ ئەوەی گواستەوە بۆ جیهانی ئیسلامی. ئەمە وایکرد بارێکی ترسناک دەربکەوێ. موسڵمانان کاتێ ئەو نووسینە زانستیانەیان

دەخوێندنەوەو بینییان ملهوڕییان تێدایە دوورە پەرێزییان لێکرد. لەوانە ئەزهەر کە لە ئەزهەر دا برێ جوگرافی زان و بیرکاری ناس و گەردوون ناسی هەبوون، دواتر ئەزهەر ڕوویکردەوە خوێندنی لێکۆڵینەوە ئیسلامیەکان بە تەنها چونکە بینی ئەو ڕێگەی مەعریفەی بەرەو جیهانی ئیسلامی هێنراوە ملهوڕیەکی تەواوە، بۆیە لە ڕووی دا وەستاو ئەوەش بوو بە بەرامبەر ئەو ڕەوتە ملهوڕیە بە تەواوی بوەستێ و پشتگوێی بخات و وازیان لێبێنێ یان قبوڵی بکات بەو گومانەی پێناوێ بێ بۆ گرتنەبەری هۆکار، ئێمە ئێستا بەهۆی دواکەوتن لە ئەرکی ئیسلامیمان کە بنیادنانی زەویە کەوتوینەتە کێشەکەوە بەهۆی ئەو دواکەوتنەی ناو ڕۆشنبیری ئیسلامیمان بە لایەنە حەقیقیەکانیو جیابوونەوەیەکی زانستی نێوان ئایین و ژیان کە ئەمڕۆ موسڵمان پەیڕەوی دەکات.

لێرەوە پێویستە بە دەستی خۆمان خوێندنگە زانستیەکانمان بنیاد بنێین تا ڕێ نەدەین بە بێگانە تا لە وڵاتی موسڵمانان دا یاسا و بنەڕەتی زانستی دابنێ. مەسەلەی بوژاندنەوە لە دەرەوەی مەسەلەکەیە بنەمای پێشکەوتنی زانستی لە بنەڕەتەوە تێکدەشکێنێ چونکە هەر گەنجێ بە چاوپۆشی لە بەرکەوتنی لەگەڵ چالاکیەکی شاڵاوی ترسناکی هزری ئەوا لە ئەگەری ئەوەدایە ببێتە ڕاوی کڵێساو جولەکە و بەکرێ گیراوەکانیان و بزووتنەوە هەواڵگریە ڕۆژئاواییەکان. هەموو ئەوانە هۆکاری دەروونین کە ڕێ نادەن گەنجان گەشەسەندنی زانستییان هەبێ، ئەمە سەرەڕای ئەوەی ئەمڕۆ زۆربەی زانکۆ ڕۆژئاواییەکان بڕوایان وایە موسڵمان پێویست ناکات بەباشی فێربکرێ و دەکرێ تەنها شەهادەیەکی پێ بدرێ کە پێویستیەتی، بەڵام کاتێ لە وڵاتی خۆمدا بنەمایەکی زانستی دادەنێم ئەو دەزگایەك دادەنێ تا کاری لەسەر بکات. بنەما زانستیەکە وەك درەختێ وایە پێویستە ڕەگ و ڕیشەی بچن بەناخی زەوی دا تا بتوانێ بەرهەم بگرێ.

هەندێ کەس لە جیهانی ئیسلامیمان دا بڕوایان وایە نەگونجاوە موسڵمانان بگەنەوە بە کاروانی زانستی ئەورووپا و ئەمریکا، چونکە چالاکی کورتکردنەوە بۆ ماوەی دواکەوتەیی دوورەدەستە. لەڕاستی دا زانست و تەقەنی لەو مەسەلە مەنتیقیانەن کە تەلیسم نین تا عەقڵی ئیسلامی نەتوانێ لێیان تێبگات. دەگونجێ ئەوەی بە مەوزوعیەت بچێ بۆیان بکاتە ئەوپەڕی ئەوەش کە کۆمەڵگەکانی تر پێی گەیشتوون چونکە ئەو تا کۆتایی هەنگاوی ئەوان وەردەگرێ. بۆیە هەوڵی گەیشتن بەوە بە هیچ جۆرێ مەحاڵ نیە بە مەرجێك هۆکارەکان بگرینە بەر و دەست بکەین بە بنیادنان و دامەزراندنی پەیمانگا زانستیەکانمان.

## *بە ئیسلامی کردنی زانستە کۆمەڵایەتیەکان:

بانگەواز بۆ ئازادکردنی زانستە کۆمەڵایەتی و مرۆییەکان لە ملکەچبوون بۆ چەمکە مادديەکانی زانست و یاساکانی ئەزموونگەری دەرکەوت. هەروەك هەڵەی زانا کۆمەڵایەتیەکان لەوەدا دەردەکەوێت لێکۆڵینەوەکانیان مەوزوعیەتیان هەیە و ئەنجامخوازیەکانیان ناتەواون. لێرەوە زانستە کۆمەڵایەتیەکان بە ناتەواو دادەنرێن. دواتر سەبارەت بە زانستخوازی موسڵمان جێی مشتومڕ نین، ئەمە بڕیاری زانا کۆمەڵایەتیە موسڵمانەکانن لەپێش هەموویشیانەوە دکتۆر ئیسماعیل فاروقی ڕەحمەتی خوای لێبێت کە ئەوە دەخاتە ڕوو ئیسلام پاڵپشتی وەسیەتەکانی خوایە یان ئەو فەرمانە ئەخلاقیەی کە تایبەتن بە کۆمەڵگە، پەیوەندیشی هەیە بە نیزامی کۆمەڵایەتی ناو ئوممەتەوە. ناکرێ ئوممەت بێ ئەوە پێشڕەوی هەبێ، ئیسلام سنوری گەورەیی مەسیحیەتی تێپەڕاندووە لەکاتێك دا مەسیحیەت ڕزگاری لە بازنەی نیاز واتە هەستی شەخسی ساتێکی دیاری کراودا دەزانێت. ئەوا ئیسلام لەڕێی کارەوە (ژیانی گشتی لە بازنەی کات و شوێندا) دایدەنێت. ئیسلام بڕوا بوون بە ڕۆژی دوایی لەپێناو پاڵپشتی

ئەو سەردەمە مێژووییەی بیرو بەها و یاسا و دامەزراوەکان دا داناوە، بەها ئایینی و ئەخلاقیەکان تاکەکەسی نین بەڵکو لە بازنەی ئومەتدان.

ناکۆکی نێوان چەمکی ئیسلام و چەمکی ڕۆژئاوا دەگەڕێتەوە بۆ جیاکاری کۆمەڵگەی ڕۆژئاوایی لەنێوان زانستەکان و بەها جەوهەریەکان دا لەژێر ناوی بنەمای واقیعیەت، ئەمە بۆتە هۆی دارمانی ئەخلاقی و دڵنیایی کۆمەڵگە لە ئەنجامی ئەو لێکۆڵینەوە جنسیەی کینزی ئەنجامی دا هۆشیاری خستە سەر زینا و جەختی کردەوە سەر ڕێگەی سکپڕی.

بێگومان تەنگژەی هەموو بیری ڕۆژئاوا جەخت دەکاتەوە سەر جیاکردنەوەی بەهاکان. جیاکاری نێوان بیردۆزەو پەیڕەو، جیاکاری نێوان زانستەکان و ئەخلاق، جیاکاری نێوان زانستەکان و پابەندی تاکەکەسی ﴿وَكُلُّهُمْ آتِيهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَرْداً﴾ زاڵبوونی چەمکی بیردۆزەی (کۆمەڵ).

لێرەوە بزاڤی بێداریخوازی کەوتە دارشتنەوەی ئیسلامیانەی زانستە کۆمەڵایەتیەکان (زانستە کۆمەڵایەتیەکان زانستی کۆمەڵناسی زانستی مرۆڤ زانستە سیاسسەکان زانستی ئابوری و مێژوو و جوگرافیا و دەروونناسین. ئەو زانستانە جیان لەو زانستە بەرتەسکانەی جەخت دەکەنەوە سەر بەدیهێنانی دەست ڕۆیی بەسەر بوون دا، دیدی زانستی سەرچاوەیەك بوو بۆ خستنەگەڕی چەند وزەیەکی زۆر بۆ لێکۆڵینەوەو قۆرخکاری سروشت.

دکتۆر ئیسماعیل فاروقی دەڵێت دەبێ سیفەتی ئیسلامی بدرێ بەسەر زانستە کۆمەڵایەتیەکان دا چ پەیوەست بە تاك یان کۆمەڵ، پەیوەست بە مرۆڤ یان سروشت، ئایین یان زانست، خۆیشی بخاتەوە ژێر ئاڵای یەکخواپەرستی پوخت: (خوا دروستکەرە هۆکارەکان دەسازێنێ و ئامانج و مەبەستی هەموو شتێکە لە بوون دا) با مەعریفەش

ڕووەو پەیوەست بوون بچێ، پابەندبوون بە ڕەوتی خوایی کە دابەزاندووە تا بەختەوەری و کامەرانی بۆ مرۆڤایەتی بهێنێ.

پێویستە لێکۆڵینەوەی زانستە مرۆیی و کۆمەڵایەتیەکان گرنگی بدات بە جێگیرایەتی مرۆڤ لەسەر زەوی دا. لێکۆڵینەوەی ئیسلامی دان نانێ بە دابەش کردنی زانستە مرۆیی و کۆمەڵایەتیەکان دا، بەڵکو داخوازە لقەکانی لێکۆڵینەوە ڕیزبەندی بکرێنەوە و دابەش بکرێن بۆ زانستە سروشتیەکان و زانستەکانی تایبەت بە ئوممەت کە مرۆڤ و کۆمەڵگە لەخۆدەگرن.

زانستە سروشتیەکان کاردەکەن بۆ دۆزینەوەی وردەکاری ڕەوتی خوایی لە چوارچێوەی شتە ماددیەکان و ئەوی تریش (مەعریفەی مرۆیی یان زانستە مرۆییەکان) لە چوارچێوەی کاروبارە مرۆییەکان دا. بێگومان پێدانی سیفەتی ئیسلامی بەسەر زانستە کۆمەڵایەتیەکان دا دەبێ کار بکات بۆ نیشاندانی پەیوەندی حەقیقەت لەگەڵ ڕەوتی خوایی پەیوەستی دا. جا ڕەوتی خوایی ئەو پێوەرە دادەنرێ کە پێویستە حەقیقەت کار بکات بۆ ئەوەی شوێنی بگرێتەوە، چونکە شرۆڤە باری واقع هەرگیز پێویست بەوە ناکات بێئاگابێ لەوەی پێویستە شتەکان لەسەری بن.

پێویستە ڕەوتی خوایی لە کاروبارە مرۆییەکان دا دابنرێ و ویستی خوا لە کۆمەڵگەو ئاکاری کاری مرۆیی دا بێتەدی. ئەوە واتای پێدانی سیفەتی ئیسلامیە بە زانستە کۆمەڵایەتیەکان.

دکتۆر ئەبوبەکر ئەحمەد باقادر دەڵێت: سەرکەوتوویی و کارایی زانستە کۆمەڵایەتیەکان لە دەوڵەتە پیشەسازیەکان دا ئەوەی لە ئەندێشەی هەندێ بیریار دا ورووژان

دووە کە پابەندیەکی ئەندامەکی نێوان تەسنیع و گەشە و نەشونما و نێوان گەشەسەندنی زانستە کۆمەڵایەتی و ئابووریەکان هەیە. خوێندنگەکانی زانستە

کۆمەڵایەتیەکان و لێکۆڵەرانی عەرەب بۆ دوو دەستە دابەش بوون: دەستەیەك لە مارکسیەت و ڕێبازی مارکسیەتیان وەرگرت و دەستەیەکیش خوێندنگەی لیبرالییان وەرگرت کە لە سەر چەند ئەگەر و بیردۆزەیەك وەستا بوو لەنێوەندی ڕۆشنبیری دا بۆ کەشێکی ناوچەیی دانەمزرابوون، گرنگی دانی لێکۆڵەرانی عەرەب بە گواستنەوەی زانستە کۆمەڵایەتیەکان بوو بەشێوەیەکی دەقاو دەقی بێ شرۆڤە لە قاڵبی نوسینی خوێندنگەکان کە لە بابەت و مەسەلەکان دابڕابوون. ئەو باسانەی واقعی عەرەبی و ئیسلامی سەپاندوویەتی و لێکۆڵەر تیایدا دەژی. بەشداری زانستی لە بواری لێکۆڵینەوە لە کۆدەنگی ئایینەکان یان پێناوەکانی کاریگەری پەیوەندی بە جەماوەرەوە نابینرێ، ئەمە لە هەمان کات دا کە ڕەوتێکی ڕۆشنبیری پابەند نیە تا لە شیکاری دا بەها و نمونەی باڵای کۆمەڵگەی ئیسلامی لەخۆگرتبێ.

لێکۆڵینەوە ڕۆژئاواییەکانی پەیوەست بە زانستە کۆمەڵایەتیەکانی بواری ئیسلام شێواوو بارگرژن، چونکە ماکس ڤێبەر لە لێکۆڵینەوەکەی دا سەبارەت بە ئیسلام– تەنها هێرشی نەبردووەتە سەر ئیسلام، بەڵکو نکوڵی کردووە لە هەندێ بنەمای لێکۆڵینەوەی لە شیکاری کۆمەڵایەتی دا، لەکاتێك دا بڕوا وایە ئیسلام ڕۆڵێکی سەرەکی دیوە لە زۆربەی ئەو ڕووداوانەدا کە جیهانی ئیسلامی کارلێکی لەگەڵ دەکات، بەڵکو کاریگەری ئیسلام پێکهاتەی هەردوو یەکەی هۆشیار و ناهۆشیار لە پێکهاتەی شەخسی موسڵمانان دا ڕیشەی قوڵی هەیە. ئیسلام لە بیروباوەڕو شەریعەت و مەزهەبو مێژوو و زانستو شکۆی دا ئەو لاوازیانەی موسڵمانان بەدەستیەوە دەناڵێن لەڕووی وەستان و هێزو کرانەوەدا ڕۆڵێکی گەورەو دیاریان هەبووە، بەڵکو کاریگەرییان هەبووە لەو هۆشو تێگەیشتن و شیکارەی کۆمەڵگە ئیسلامیەکان پیایدا تێدەپەڕن.

چەند هۆکارێکی ئابوریو ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتی و سیاسی و هۆکاری تر هەبوون کە کاریگەریەکی زۆریان هەبوو لەسەر ئەو گۆڕانانەی لە جیهانی ئیسلامی دا ڕوویان

دەدا و کلیلی تێگەیشتنیش لێی زانینی پەیوەندی نێوان ئەو هۆکارە جۆراو جۆرانە و ئەو چوارچێوە ئیسلامیە بوو کە لەخۆی دەگرت.

جا موسڵمانی ئاسایی (کە زۆرینەی دانیشتوانی وڵاتانی ئیسلامی دەگرێتەوە) پەیوەستی ئیسلامە، بیردۆزەیەك لە کارلێك لەگەڵ ئەو کەشە کۆمەڵایەتیەدا چەمکەکانی ئیسلام دادەڕێژێ کە لەسەر حیسابی تێگەیشتنی لەو چەمکانە تیایدا دەژی.

بۆیە تێگەشتنی ئەو چوارچێوە ئیسلامیەی کەسی موسڵمان لە سایەی دا دەژی پێویستە بۆ لێکۆڵینەوەی ئەو کۆمەڵگە ئیسلامیانەی زۆربەی دەوڵەتانی جیهانی سێیەم دەنوێنن، لێکۆڵەری موسڵمان پێویستە لەنێوان مارکسیەت و لیبرالیەت دا بەرتەسك نەبووبێتەوە. لە دیدی گشتگیری ئەودا ئیسلام بۆ هەموو لایەنەکانی ژیانی تاکەکەسی و کۆمەڵایەتیەکە نەسقێکی هزری پێکدەهێنێ کە دەکرێ بە ئایدۆلۆجیای سێیەم دابنرێ. دیارترین شتێ موسڵمان دەینوێنێ کۆکردنەوەی وتەو کار و نیاز و پابەندیە بە یەکەوەو نمونەو بەها ئیسلامیەکان دەبەخشێ.

بەداخەوە لێکۆڵەرانی هەر جۆرێکی زانستە کۆمەڵایەتیەکان کە دەرچووی زانکۆ ڕۆژئاواییەکانن لە زانستە ئیسلامیەکان دا هیچ پشك و شارەزاییەکیان نیە. ئەوەی تەواو پێویستە ئەوەیە لێکۆڵەرانی زانستە کۆمەڵایەتیەکان پاشخانێکی ئیسلامی چاکیان هەبێ تا یارمەتیان بدات بۆ ئەنجامدانی لێکۆڵینەوە کۆمەڵایەتیەکان و بردنەوە بنەڕەتی خوێندنگەیەکی سەربەخۆی کۆمەڵایەتی.

لێکۆڵەری ئیسلامی دەبێ شارەزای دیدی گشتی ئیسلامی (بیروباوەڕ)و چەمکە ئیسلامیەکانی خوا و بوون و گەردوون و مرۆڤ و کۆمەڵگەو هەندێ لێهاتوویی بنەڕەتی زانستەکانی زمان و ئصولی فیقه و چەمکی فەرموودە و زمان بێ بەجۆرێ بتوانێ خێرا بەهێزانە بگەڕێتەوە بۆ وەرگرتنی نمونە پێوەریەکان.

پێویستە زانستە ئیسلامیەكان پەیوەست بە زانستە كۆمەڵایەتیەكان بخوێنرێن تا بەوە بكرێ بەسەر عەلمانیەتی خوێندن دا سەركەوین، چونكە كێشەی بە عەلمانی كردنی خوێندن دەستكردی داگیركەرە و دامەزراوە زانستیەكانیش تا ئێستا نەیانتوانیوە لە دەستی دەرباز بن. مەبەستمان پێی چالاكی جیاكردنەوەی تێڕوانینی ئیسلامیە لە بەشەكانی تری ناو چوارچێوەی خوێندن. چالاكی چەكدار كردن لە بڕیاردەری ئەكادیمی دا پلەپلە هەڵكۆڵراوە و نابێ ماددەیەكی سەربەخۆ هەبێ بەو واتایەی چارەسەر ڕیشەیی بێ. زیادەیان جیا لە ڕێبازی خوێندنیش نیە. هەروەها لێكۆڵینەوەی كێشەكانی كۆمەڵگە ئیسلامیەكان كە بیردۆزە ڕۆژئاواییەكان نەیانتوانی كێشەكانی چارەسەر بكەن یان لە بازنەیەكی زانستی دا بیخەنە ڕوو لەبەر چەند هۆكارێكی بەهایی و ئایدۆلۆجی.

هەروەها فەرهەنگی ئیسلامی ڕەنگدانەوەی ئیجتیهادی لێكۆڵەری كۆمەڵایەتیە لە تێگەیشتنی لە دەقەكانی قورئان و سوننەت، ئێمە هەرگیز فەرهەنگی جیهانی بەجارێ بەرپەرچ نادەینەوە بەڵام بە یەكجاریش وەریناگرین، بەڵكو وەك خاوەن هەڵوێستی نەزەری لەسەر بنەمایەكی پێوەرو پێوان كارلێكی لەگەڵ دەكەین بەجۆرێ یارمەتیدەرمان بێ تا پەیڕەو و كارلێكمان هەبێ و لەو فەرهەنگە هەڵبژێرین كە فەرهەنگی مرۆیی دەنوێنێ.

لە دیدی ئێمەدا پێویستە بەرامبەر ئەو ڕایە هیچ نەبێ لە ڕێبازی بنەڕەتی بنیادی دیدی ئیسلامی بپارێزین.

# باسی یەكەم

## (هەوڵی دەرچوون لەڕێی داخراو)

بەرامبەر گەردەلولی بیری ڕۆژئاوا كە هێزە دەرەكیەكان بەرەو ڕووی ئاسۆی بیری ئیسلامی خستیانە ڕوو و زیاد لە سەد ساڵ بە ئامانجی شاڵاو و دەورەدان و گەمارۆ و دەست بەسەرداگرتن خەریك بوون موسڵمانان هەڵوێستێكی یەكلاكەرەوەیان هەبوو، ڕۆژئاوا دەیویست ئیسلام و بنەڕەتی ڕۆژئاوایی بكات و موسڵمانان بباتە بازنەی بیری ڕۆژئاوایی مەسیحی جولەكە یۆنانی و ڕۆمانی و پاشكارە دیموكراتی و ماركسی و صەهیۆنیەكانی لە سەردەمی نوێ دا ﴿وَلَن تَرْضَى عَنكَ الْيَهُودُ وَلاَ النَّصَارَى حَتَّى تَتَّبِعَ مِلَّتَهُمْ﴾ (البقرة) ئەوان بە هیچ یەك لەو چەمكانە ڕازی نابن كە لەو ماوەدا خرانەڕوو و بە تەوفیق و سەركەوتن یان بانگەواز بۆ پەیوەستی فەرهەنگی ئیسلامی بە بیری سەردەمەوە ناودەبرا یان هەوڵی تری جگە لەوانە كە لە بنەڕەت دا شكستیان خوارد و بە قەڵەمڕەوی ڕۆژئاوایی ناڕازی بوون تەنها قۆناغی ئیلهام بەخشی تەواو و دەورەدانی تەواوی كۆتایی بارەكەی لێدەكەوتەوە. لەو كاتەوەی لەسەردەمی نوێ دا ئەو ڕەوتە دەستی پێكرد ناودارە بیریارەكان سەرەتا كەوتنە بانگەواز بۆ ڕاستكردنەوەی بیروباوەڕو گەڕانەوە بۆ سەرچاوەكان دواتر بەرپەچدانەوەی گومانەكان بەو جۆرەی جەمالەدینی ئەفغانی ئەنجامی دا (الرد على الدهرين) یان موحەممەد عەبدە لە كتێبەكەی دا (الأسلام والنصرانية بين العلم والمدنية) یان نوسینەكانی ڕەشید ڕەزا و فەرید وەجدی و موحبەدین خەتیب كە ئاشكراكردنی نەخشەكانی شاڵاوی ئەنجام دا بەوەرگێڕانی كتێبی (شاڵاو بۆ سەر جیهانی ئیسلامی)، هەروەها كۆمەڵێ هەڵوێستی بەدواداهات و تێكشكاندنی گومانەكانی ڕۆژهەڵاتناسی و موژدەبەری تا ئەوەی كتێبی (دیدی ئیسلام) ڕاستی پیلانی ڕۆژهەڵاتناسی و ڕۆژئاواگەری نیشان دا بەوەی پیلانیان دانابوو بۆ بە ڕۆژئاوایی كردنی ڕۆژهەڵات، واتە بە ڕۆژئاوایی كردنی موسڵمانان.

هەنگاوەكانی بەرەنگاربوونـەوەی هەوڵـەكانی وەرگێڕانـی بـیری یۆنـانی و فەلـسەفی كۆن و بیردۆزەكـانی فرۆیـد و دۆركـایم و سـارتەر و مـاركس و مـاركۆز و كەسـانی تـر دەركەوتن كە لە زانكۆكان دا وەك زانست دەخوێندران نەك وەك بیردۆزەو ئەگـەرێ كـە شیاوی ڕاشت و هەڵەش بن.

لەڕوانگـەی ئـەو جەنگـە یەكلاكـەرەوەدا كـە تـا ئێـستاش بەردەوامـە تروسـكەیەكی ڕووناكی نوێ لەڕێی ژمارەیەك پیاوی بەویژدانەوە دەركەوت كـە حەقیقـەتی ئیـسلامیان دەزانی و ساختەی ئەو پیاوانەیان ئاشـكرا دەكـرد كـە درۆیـان دەكـرد و هـەوڵیان دەدا گومـان بخەنـە سـەر ئـایین و پێغەمبـەران و مێـژوو و زمـان و شـەریعەت و ئـەو ڕۆڵـەی موسڵمانان هەیان بوو.

تومـاس كارلیـل و درابـەر و گۆسـتاف لۆبـۆن و برناردشـۆ دەركـەوتن، دواتـر ئـەو چاكەكارانە دەركـەوتن كـە موسـڵمان بـوون: عەبدولكـەریم جرمـانوس، ئـەتیان دینیـە، موحەممەد ئەسەد (لیونولدفابسس) دی كاستری، لۆرد هێڵی، دكتۆر خالیـد شـلدریك و دەیان كەسی تر كە بە ویژدانەوە دەیانڕوانیە ئیسلام و بوونە تیـشكێكی ئاشـكرای نـاو تاریكی پیلانەكانی بێدەنگیەك كـە ڕۆژئـاوا لـە بنـەڕەت دا لـەڕێی كڵێـساوە ڕێبـەری دەكـرد تـا ڕۆژئـاوا لـە ئیـسلام تێنـەگات و موسـڵمانانیش بـەخراپ تێبگەیـەنن لـە چەمكەكانی ئایینی خۆیان.

ئەوە ئەو قۆناغە بوو كە ئێستا لەم لێكۆڵینەوەدا پێی دەگەین تا دەگەینە گارودیو بۆكای و مەریەم جەمیلە و ئەریك فۆرم.

١- زانایانێكی ڕۆژئاوایی بە ئاشكراكردنی خراپە و داڕمانی ژیاری ڕۆژئـاوا جیهانیـان لەرزاند.

٢- نەگونجانی ئەو ژیارە بۆ پاراستنی مرۆڤایەتی مرۆڤ.

٣- لە پێشڕەوی ئەوانەدا (شپنگلەر- أفول الغرب) دواتر (ئـەلكس كاریـل - مـرۆڤ ئەو نەزانراوە) لە هەمان كات دا كە موسڵمانان گەرم بوون بـۆ ئاشـكراكردنی سـاختەی بیردۆزە ڕۆژئاواییەكان زانایانی بەویژدانی ڕۆژئاوا مافی موسڵمانانیان لە بنیادی ڕێبازی

ئـەزموونی دا بـۆ موسـڵمانان دەگێڕایـەوەو دارمـانی بیردۆزەکـانی داروین و مـارکس و فرۆید و سارتەریان لە دەیان کۆنگرەی زانستی دا ئاشکرا دەکردن. هـەروەها ئامانجـە داگیرکـاری و صـەهیۆنیەکانی پـشت ئـەو بانگەوازانـەیان ئاشـکرا دەکـردن. هـەروەها سەرەتا گەلێکی تر دەرکەوتن کە نهێنی بارگرژی زانستەکان و ژیاریان ئاشـکرا دەکـرد، ئەوەش کەموکورتی دیدی خوایی بوو کە نەیبوو. هەروەها بارگرژی کۆمەڵگەکان لەبـەر کەموکورتی دیوی ئەخلاقی بوو کەنەیان بوو، سەرەڕای ئاشکرا کردنی خراپـەی کتێبـە کۆنەکان و شڵۆقی و نەگونجانی نێوانیان.

لێرەوە دیاردەیەکی نـوێی مەترسـیدار دەرکـەوت کـە بریتـی یـە لـە: دیـاردەی ئـەو بیریارانەی ڕۆژئاوا کە لەگەڵ هەموو ژیارەکان دا گفتوگۆیان دەکرد. دواتر پەنایان بردە بەر بیری ئیسلامی، ئەوە کۆمەڵێ عەقڵن کە هۆشیاری و خۆسەپێنی و هەڵگەڕانـەوەیان بەسـەر ئاسـتی بـیری مرۆییـدا هـەبوو، ئیـسلامیان دەکـردە ئامـانج و پێنـاوی ڕزگـاری مرۆڤایەتی، ئەوەشیان بەوە ڕاڤە دەکرد جیهانی ڕۆژئاوا لە ئەنجامی سوانێ کە تووشی بـووە بـەرەو ئیـسلام دێ، چـونکە چـەندین دەسـتە پـەرت دەبـوون و هەڵدەگەڕانـەوە چونکە ئامانج و پێناویان لەبەردەست نـەدەدەبینرا. ئەمـە دەربڕینـی گارودیـە کـە مایـە پووچـی ئیختیارەکـان بڕیـاری کـەوتنی دەدەن بـۆ چـەند دەسـتەیەکی دیـاری کـراوی ڕۆژئاوا کە تیایدا بزاڤی سوان هاتـە دی. ئـەو سـوانەش بووبـە بەشـێکی جیابوونـەوەی چەرمەسـەری دەروونـی سـەرەڕای پێـشکەوتنی مـاددی، هەنـدێ لـە لێکۆڵـەران لـە گەشەسەندنی گەل و ژیارەکان دا پێیان وایە:

ئیسلام کـە سروشـی خواییـە هـاتووە تـا تواناکـانی بـیری مـرۆڤ تێپـەڕێنێ، ئـەوەی بانگەشـەی ئـەوە دەکـەن لـە شـاخەکانی مەعریفـەدا خـەزنی کـردووە، بیریـان چـووە مەعریفە ڕێژەییە و ناکرێ بە کۆتایی حوکمی لەسەر بدەیت، ئەمەش بـەپێی دەربڕینـی دکتۆر ڕوشدی فەکار کە پێی وایـە ئیـسلام بـەردەوام بەڵگـەی هەیـە بـۆ قـسەی و نـەك

تەنها لەم سەردەمەدا بەڵکو لە سەردەمەکانی دواتریش دا ئامادەبوونی خۆی هەیە چونکە یاساکەی خواییە و پێش ئەوەی یاسایەکی چارەسەری بێت یاسایەکی خۆپارێزییە و بنەما ساکارە نەماوەکانیشی پێوەرە چەسپاوەکانت بۆ ڕوون دەکەنەوەو ڕاستگۆو پاك دەبن لەگەڵ دەروونت داو موحاسەبەی دەروونت دەکەن بێ ئەوەی پێویست بکات بە موحاسەبەی کەسانی تر.

دیاردەی گەڕانەوەی زانایانی ڕۆژئاوا بۆ ئیسلام دیاردەیەکی جێ باسەو دەبێ تۆمارو شرۆڤەی هەبێ، هەندێ ئەو دیاردەیە دەگێڕنەوە بۆ (ڕێگەی داخراو) کەبەڕێی لەدایك بوونی سەختی دا فەلسەفەکانی ڕۆژئاوا چوون و ئیسلام وەك بەدیلێکی مەنتیقی بۆ مایە پووچی فەلسەفە وەزعیەکان هات و ئەمڕۆ ئیسلام وەك ڕێی ڕزگارکەریەك بۆ مرۆڤایەتی نیە.

ڕێبەرانی بیو پایەکانی فەنلسەفە لەسەدەی بیستەم دا بریتین لە: هایدگەر، کبارس، سارتەر، مارکس، لەوەدا پێکدەگەن کە جیاوازیەکی ژیارن وەك ئەنجام هاتووە چونکە مرۆڤی ئەم سەردەمە مرۆڤی سەرسام وەستان و ڕاڕایی و بێ هیواییە، مرۆڤێکە لە بەکارهێنان دا تێر نابێ و بەدوای خۆشگوزەرانی دا دەگەڕێ.

ڕۆژئاوا گاڵتەی دەهات بە سپاردە و نەیپاراست و وای دەزانی ئەوە مەسەلەیەکی سادەو گاڵتەیە و هەموو شتێ لای ئەو یاری بوو. دواتریش بەرهەمی ئەو بەکەم زانین و قۆرخکاریەی بەخششەکانی خوا دەبینن. ئەمەش بە ڕوونی لە دەیەکانی کۆتایی دا دەرکەوت کە یاریە مادیەکان و ڕێگەی داخراوی ژیاری ئەوروپا و دەرکەوتنی دیاردەکانی سەرسام بوون و بەکارهێنان و فرە جۆری دەرکەوتن.

بەکارهێنانی ترسناکی بەردەستیە کەونیەکان بەجۆرێ بوو وایاندەزانی جیهان لە ماوەی سەدەیەك دا بەرەو خنکان دەچێ. لە بیانوو هێنانەوەی ئەوەش دا دەیان وت هۆکاری ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ شێوەی مرۆڤی سەردەم کە کار دەکات بۆ خراپ

بەکارهێنان و هەوڵی بردنی ئەزموونەکانی بوون بە ڕێگەیەکی تێگەیشتوانە یان نا تێگەیشتوانەی جۆرێ لە زێدەڕەوی و زۆر بەکارهێنان لەگەڵ بوونی ئەوپەڕی نەگونجان دا. لێرەدا کەس هەیە هیچی نیە بۆ خواردن و هەمیشە هەموو شتێکی هەیە و تا ئەوپەڕ دەڕوات و دواتر چی ماوەتەوە دەبێتە پاشەڕۆ. هەموو ئەمانە بوونە پاڵنەری کۆمەڵێ زانا و بیریار لە مەیدانی جیهانی هزری دا وەك بەدیلێکی مەنتیقی بۆ لێکهەڵوەشانی فەلسەفە وەزعیەکان.

سەرەڕای تەنگژەی ئێستای موسڵمانان ئیسلام بە بەردەوامی دەتوانێ هەموو بوون ڕزگار بکات نەك تەنها بۆ ڕزگاری گەلێ یان کیشوەرێ، بەڵکو دەبێتە ڕزگارکەری ئەم تەنگژەیە نەك لە ڕێی داهێنانی بەهێزترین مووشەکەوە بەڵکو لەڕێی گێڕانەوەی مرۆڤ بۆ باری دروستی خۆی.

ئەم تەنگژەیە جیهان بەرەو ئیسلام دێنێ و ئاراستەی ڕۆژئاواش لە خاڵێکەوە ڕووەو ئیسلام دەست پێدەکات کە لێکهەڵوەشانی بیری ملهوڕی ماددیگەریە هەر لە سەرەتاوە و چوونە ڕووەو بوونی خوای گەورە. جۆرە بیردۆزەیەك لە ڕۆژئاوادا زاڵە و کودەتایەکی هزری دەنوێنێ. ئەوەش ئاشکراکردنی ساختەی بیردۆزەی (ڕێکەوت و پێویستی)یە، دیارە زانا زیرەك و ژیارەکانی زانستی زیندەوەرزانی و زانستی ژیان و چەندین زانستی فیزیایی زۆرجار ئەو بیرانەیان دەخەنەڕوو کە ڕاڤەیەکی سەر بیردۆزەی (ڕێکەوت و پێویستی)بۆ بەدیناکەن چونکە بووە بە بازنەیەکی نەزەری بێ سنور، بۆ نمونە بیردۆزەکەی هۆیل دەڵێ هیچ ڕێککەوت و هیچ زەرورەتێ نیە و ئەم بوونەش بە ئاراستەیەکی خوایی ڕێ دەبڕێ. ئەوەی بیردۆزەی سەرهەڵدان و پەرەسەندنی (داروین)ی هەڵگێڕایەوە بەوەی وا دەبینێ ژیان لەسەر زەوی دا سەریهەڵداوە و بەڕێکەوت بووە و گەشەشی هەر ڕێکەوت بووە. ئێستا پریشکەکەوتووەکان و بوونی پاشماوەی بوونە گەردوونیەکانی تریش چەسپاون. هەروەها بیردۆزەکەی داروین کەوتە

چاڵێکی قووڵەوە کاتێ زانایانێ وەك تیووتی دەیانوتەوە گوایە مرۆڤ لە بنەڕەتی مەیموونەوە هاتووە و بەهیچ جۆرێ ئادەم (علیه السلام) باوکی مرۆڤایەتی نیە.

بەو جۆرە دەبینین زانایانی ڕۆژئاوا کەوتوونەتە ئاشکراکردنی هەڵەی ڕێی خۆیان، بیریاری فەرەنسی (رینیه بارگاتبل) لە کتێبەکەی دا (ئاسنی جادووگەر) دەڵێت: لە دیاردە بەرچاوەکانی سەردەمی ئێستامان گرنگیدانەوەیە بە مەسەلە ڕۆحیەکان، ئەمەش لە هەموو شوێنێ و لەناو هەموو خەڵك دا و لە تەمەنە جیاجیاکانیشدا دەبینین. ئەو بیرکردنەوە مادديەی ماوەی سەدەیەکی زاڵە کاتی بەسەر چوو و زانا ماددیەکانیش خۆیان سەلماندیان بە تەنها ماددە بوون ناجوڵێنێ و ئەو جیهانەی ئەمڕۆ ئاشکرای دەکەین تەنها یاریەکی گەورەی میکانیکی نیە، بەڵکو لە بیرۆ ڕۆح دەچێ، یەکێ لە گەورەکانی لێکۆڵینەوەی زانستی (زانکۆی برنسیۆن) دەڵێت گیانی ماددی بە دیاردەی بوونەوە بۆ ئەم سەردەمە بەس نیە و دەبێ لەپشت دروست کردنی بوونەوە توانایەکی ڕۆحی بیریاری گشتگیری هەموو بوون هەبێ.

## *دوای شکستی ئایدۆلۆجیاکان ئیسلام هات:

چاودێرانی سیاسی و کەسانی تریش لایەنەکانی ئەو گۆڕانە ڕوون و قوڵەیان لە گەورە بیریارانی ڕۆژئاوادا بەوە داناوە کە ڕەوتێکی بەهێز لە ئەورووپادا بیروباوەڕی ئیسلامی سەردەخات و زۆربەی بیریار و ڕۆشنبیرانی ئەورووپاش بە باشی دەزانن خوا یەکە و داهاتووش بۆ ئیسلامە. ئەوان بە بیرو ڕۆحیش بڕوایان بەوە هەیە بەڵام بەداخەوە زۆربەیان لەترسی دەسەڵات کە ڕقی لە ئیسلامە ناوێرن ئەوە دەربڕن.

گۆڤاری (لاکیو بینیەرو لحیون) کە گەورەترین گۆڤاری کاسۆلیکیە لە فەرەنسا دەردەچێت لە ئەهرامەوە (٢١/١٠/١٩٨٢)دا هەواڵێکی بڵاوکردەوە کە ڕۆژنامە جیهانیەکان لە پەڕەی یەکەمیان دا بڵاویان کردبوویەوە نزیکی سی بۆ پەنجا هەزار فەرەنسی لە ماوەی چەند ساڵێکی کەم دا موسڵمان بوونی خۆیان ڕاگەیاندووە، ئەو

ژمارە گەورەش کو موسڵمان بوون هەموو نێوەندە کۆمەڵایەتیەکان و ئاراستە هزریەکان دەگرنەوە لەنێویان دا کەسی وەك ڕۆجیە گارودی هەیە کە لە هەواداران و پیشتوانانی مارکس بوو، هەروەها میشیل کودکوینز زانای لێکۆڵینەوە تیشکیەکان، هونەرمەندانی وەك مریس بیگاری سەماکار و ئامادەکاری سەماکاران و مامۆستایانی زانکۆی وەك فانش مۆنتی و بیرنیوامیشانی زانای گەورەو دیاری مێژوو. گۆڤارەکە دیاردەی کۆچکردن بۆ ئیسلامی بەوە وەسف کردووە تەنها ئەو سەربازیانە دەگرێتەوە کە لە ماوەی بوونی فەرەنسی لە باکوری ئەفریقا و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دا لەگەڵ ئیسلام دا ژیاون. گۆڤارەکە سەرسامی خۆی بۆ ئەو دیاردەیە دەربڕێ لە کاتێك دا ئیسلام لە ڕۆژنامەکانی ئەوروپا و ئەمریکاوە هەڵمەتی توندی دەبرێتە سەر چۆن ئەو پێشڕەویە دەکات؟.

ژمارەی موسڵمانانی ئێستای ئیسپانیا دەگاتە نیوملیۆن کەس کە لە هەموو شارە ئیسپانیەکان دا بڵاوبوونەتەوە و ڕۆژ دوای ڕۆژ زیاد دەکەن، هەندێ مزگەوتی مەدرید کە جێی موسڵمانان نابێتەوە و لە شەقامەکان دا نوێژی هەینی دەکەن و مانگی ڕەمەزانیش هەروا دەکەن نوێژەن دەکرێنەوە. لە مەدرید بە هەوڵی خۆیی و ئەوەی ڤیلای هەیە بە هەندێ ژوور کە دەیانکەنە یەك مزگەوت دروست دەکەن و خەڵکی گەڕەکەکە دەیکەنە مزگەوت بۆ نوێژکردنیان تیایدا.

وەك نوسەر دەریدەبڕێت (هۆکارەکانی ئەم ڕابوونە خۆی دەبینێتەوە لە شکستی ژیاری ڕۆژئاوایی و شکستی هەموو ئەو ڕەوتانەی ئەوروپا ناسیونی و پەیڕەوی کردون لە ماوەی دوو سەدەی ڕابردوودا. لێرەوە ئەوروپی و نا ئەوروپیەکانیش ڕووە ئیسلام دێن. زۆربەی ئەو ئەوروپیانەی لەگەڵیان دەژین پێشبینی ئەوە دەکەن داهاتوو بۆ ئیسلام و نەمری بۆ ئیسلامە. لە چەند وتەیەکی تری بڵاوکراوەدا لێکۆڵەرێکی ڕۆژئاوایی دەڵێت: دوای ئەوەی هەموو ئایدۆلۆجیاکان مایەپووچ بوون و ڕۆژی ئیسلام هات و

ئیسلامیش لە دوو لاوە لە ئەورووپا ڕەگ دادەكوتێ، لایەنی ئاكاری و لایەنی ڕۆشنبیری. بانگخوازان پێشبینی دەكەن لە پێكهاتەی موسڵمانی ئەورووپی خاوەن كەسایەتی بەهێزی وادا سەركەوتووین كە بتوانێ لە كەش و هەوای ئەورووپی دا كاریگەری هەبێ.

لێكۆڵینەوەیەك بە ناونیشانی (ئایا ئیسلام جارێكی تر دەچێتەوە ئەورووپا) دەڵێت: دیاردەی پێشوازی دانیشتوانی ئەورووپا بۆ هاتنە ناو ئایینی ئیسلام بە دەستە دەستە دوای ئەوەیە كە ڕاستی ئیسلام و كرۆكی قورئانیان بۆ ڕوون بووەتەوەو دەزانن قورئان چیە و ڕۆڵی موسڵمان لە بەختەوەری مرۆڤایەتی دا چی یەو چۆن بۆ سەركەوتنی ڕۆحی و ماددی و مەعنەوی دەستیان دەگرێت.

ڕۆژنامەی سەندەی تەلەگرافی بەریتانی كە هەفتانە دەردەچێ (لە ژمارە یەكەمی مانگی ڕەجەبی ١٤٠٤كۆچی دا) بابەتێكی بڵاوكردەوە كە تیایدا باس لەوە دەكات ژمارەی موسڵمانان لە بەریتانیادا بەڕێژەی دووسەد و پەنجا لە سەد لە ماوەی دە ساڵی ڕابردوودا زیادی كردووە و ژمارەیان لە ملیۆنێك تێپەڕیووە (پێشتر لە ساڵی ١٩٧٤ز. دا ژمارەیان ژوارسەد هەزار كەس بوو) هەمان زیادبوونیش لە فەرەنسا و ئەڵمانیای ڕۆژئاوایی دا ڕوویداوە و ژمارەی موسڵمانان لە هەردوو وڵات دا گەیشتووتە چوار ملیۆن و نیو پاش ئەوەی لە ١٩٧٤. دا دوو ملیۆن بوون.

ئێستا لە بەریتانیادا زیاد لە سەد مزگەوت هەن و لە چەندین خوێندنگەی بەریتانی دا ئایینی ئیسلامی دەخوێندرێ، لە فەڕەنسا ڕێبەری حزبی بەرەی ڕاستی نیشتمانی توندڕەو هۆشیاری دا لەمەڕ مەترسی كشاوی ئیسلامی بۆ سەر فەڕەنسا و لەبەرنامەی (ساعة الحقیقة) دا وتی مەترسیەكە خۆی دەبینێتەوە لە تەقینەوەی دانیشتوانی جیهانی ئیسلامی دا كە خەریكە شاڵاو دەباتە سەر فەڕەنسا و خاكی دەگرێ.

بڵاوبوونەوەی ئیسلام بەو فراوانیە لە سەرەتای سەدەی پانزەی كۆچی و فراوان بوونی بازنەی كشانی ئیسلامی هۆكارێكی ڕاستەوخۆی نەبوو، بەڵام دانیشتوانی نا

موسڵمانی جیهان ڕوویان کردبووە جەنگی ئیسلام و گوێیان لێ دەگرت و لەبارەیەوە دەیانخوێندەوە. لێرەوە ئەو گەلانە بەتەواوی تێگەیشتن ئیسلام ئەو ئایینە باڵایە کە دەکرێ پەیڕەو بکرێ و تاکە ئایینی دروستە بۆ چارەسەری هەموو کێشەکانی مرۆڤایەتی و دەتوانێ ڕێی داهاتوو لەبەردەم گەلانی مرۆڤایەتی دا ڕووناك بکاتەوە، ئیسلام ئەو ئایینە بەهێزەیە کە بەرگەی هەموو ئەو گۆڕانانەی گرتووە کە هەوڵیان داوە بەدرێژایی سەدەکانی ڕابردوو ڕێ بگرن لە دەرچوونی گەورەی. مەگەر ئەورووپای ڕۆژهەڵاتی تا دەرگاکانی ڤیەننا تا پایتەختی فەرەنسا نەچوو، مەگەر ئەندەلوسیش ئیسلام نەبوو، مەگەر کشانی ئیسلامی لە خاکی فەرەنسادا تا شاری سانس نەچوو کە دوانزە کیلۆمەتر لە باشوری پاریسی پایتەختی ئێستای فەرەنساوەیە، مەگەر ئیسلام نەگەیشتە سویسراو باشوری ئەڵمانیا و موسڵمانان دەستیان نەگرت بەسەر شاخەکانی ئەلب دا و بەرپێرەوەکانی نێوان ئیتاڵیا و فەرەنسا و ئەڵمانیا و نەمسادا نەڕۆیشتن؟.

وڵاتانی ئەمڕۆی جیهان تێگەیشتنێ لە ڕێنمایی و چەمکەکانی ئیسلام بەخۆوە دەبینن هەر لە خاکی یابان و کۆریاو کەمبۆدیا و فلیپینەوە. هێزی قورئان دەتوانێ هەموو دوژمنایەتی ڕێی ئیسلامی بشکێنێ. گەلانی کیشوەری ئەورووپا کە ململانێی مەزهەبی و هزری و بیردۆزە ئایدۆلۆجیاکان و شێوە ڕەگەز پەرستیەکان هارپیونی هەستیان بەوە کردووە پێویستە ئەوە وەرگرن کە قورئانی پیرۆز دەیبەخشێت.

شێخ حامید خەلیفە ئیمامی مزگەوتی لەندەن دەڵێت: پێشوازیەکی ئینگلیزەکان بۆ ئیسلام دەبینرێ بەهۆی مایە پووچبوونی ژیاری ئەورووپی لەڕووی بەهاکان و خنکان لە ژیانی ماددی دا تا بناگوێیان لە خنکاندان، هەندێ لەو ژیانە ماددیە بێزاربوون و بۆ دەربازبوونێ لەم ژیارە وێنرانکەرەی مرۆڤایەتی مرۆڤ دەگەڕێن، کە ئیسلام دەبینن ونبووەکەی خۆیان دەدۆزنەوەو وەرگرتنەوەی ڕۆحی دەبینن. لەسەر دەستی خۆم نزیکەی شەست کەس موسڵمان بوون، دوێنێش پزیشکێکی هیندۆکی موسڵمان بوو و

شووی کرد بە کوڕە پزیشکێکی موسڵمان. من دوای ڕاگەیاندنی موسڵمان بوونیان بەدوای با حاڵیان دا دەچم و بەو کتێبانەی بە وردی باسی ئیسلام دەکەن یارمەتییان دەدەم و هەر پرسیارێ وەڵام دەدەمەوە کە دەیخەنە بەردەمم. لە گوندی (تۆرسن) ژمارەیەکی زۆری موسڵمانانی ئینگلز فێر دەبن، لەوڵا سەد خێزانی موسڵمان هەن کە زۆربەیان لەڕێی موسڵمانێکی ئینگلیزەوە موسڵمان بوون بەناوی عەبدولقادر کە لەسەر دەستی یەکێ لە سۆفیەکانی مەغریبی ئیسلامی موسڵمان بووە.

## * ئەوانەی لە ڕۆژئاوا بەدوای حەقیقەتدا دەگەڕێن:

دوو مەسەلەی دیار پێویستیان بە هەڵسەنگاندن هەیە:

١- موسڵمان بوونی کەس گەورەو بەرچاوەکان.

٢- موسڵمان بوونی ڕۆشنبیران.

**یەکەم: کەسە بەرچاوو گەورەکان:** موسڵمان بوونی ئەم کەسانە دیاردەیەکی گرنگە (موحەممەد ئەسەد، گارودی، بۆکای، ئەلیسۆن) هەندێکیش ئەگەر چی موسڵمان نەبووین بەڵام بەڕێزەوە دەڕواننە ئیسلام، پێشڕەوی ئەوانەش نوسەری کتێبی (سەد گەورەی جیهان) لە پێش هەموویانەوە موحەممەدی هێناوە، یان گال بیرل لە کتێبەکەی دا (ئیسلام لەسەر ئاستی بوون) کە دەڵێت: ئیسلام بەهیچ جۆرێ وەك ئایینێکی بەرتەسکی ناوچەیەك یان وەك ژیارێ کە لە سەردەمێکی ڕابردوودا دەرکەوتبێ لێکۆڵینەوەی لەسەر ناکرێ، بەڵکو وەك ئایینێکی هەموو شوێنێکی ئەم جیهانە و زیندوێتی و دینامیکیەکەشی هەر لە دەرکەوتنیەوە تا ئەمڕۆ دواتریش چالاك دەبێت، ئیسلامی کەونی یان ئیسلام لەسەر ئاستی کەون یان ئیسلام لە دیدەکەونیەکانی لەڕووی کات و شوێنەوە سەیردەکرێ. بە وردی جەختی کردووەتەوە سەر قورئانی پیرۆز و بەوردی خوێندویەتیەوە چونکە شارەزایی چاکی لە زمانی عەرەبی و زانستە ئیسلامیەکان دا هەبووە و لەلایەك و بوارە جیاجیاکانەوە لێی

كۆڵیوەتەوەو بۆ ئەوەش مەعریفەی بەرفراوانی خۆی لە زانستەكانی كۆمەڵناسی و مێژوو و ئەنسرۆپۆلۆجیاو زمانەوانی ئایینە بەراوردیەكان دا بەكارهێناوەو تەواو سەرسامە بە ئیعجازی قورئانی و بەرزبوونی لەسەر شێوەی مرۆیی. ئاماژەش دەكات بە سەختی وەرگێڕانی واتاكانی قورئان بۆ زمانی فەڕەنسی و دەبێ وەرگێڕ جڵەوی زمانی عەرەبی لەدەست بێ و شارەزای مێژوو و ڕۆشنبیری و شیعر و موعەلەقاتی عەرەب بێ، چونكە قورئانی پیرۆز كتێبێكی عەرەبی ڕوونەو ئەوەی تاودەداتە وەرگێڕان دەبێ شارەزای باری جوگرافی و مرۆیی و مێژوویی و ئابووری و سیاسی دووركەی عەرەبی سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) بێ بەتایبەت ئەو ماوەیەی قورئان دابەزی. شارەزای ئەو بارەش بێ كە ئایەتەكانی تێدا دابەزیون (أسباب النزول) چونكە قورئان چەند لایەنێكی لەخۆگرتووە و ئەوەی دەیەوێ واتاكانی وەرگێڕێ دەبێ باسی گرنگترین لایەنەكانی قورئانی پیرۆز بكات نەك لایەنی مێژوویی یان زمانەوانی بەڵكو قورئان سروشێكی خواییە كە چەند لایەنێكی جەوهەری و ڕاستی نەمری نا پەیوەست بە زمان و كات و شوێن لەخۆ دەگرێ و ڕاست و وەستاوە لە ڕابردوو و ئێستا و داهاتوویشدا.

باسی ئیسلام دەكات و چۆن زۆربەی ڕۆژئاواییەكان پێی سەرسام بوون و دەڵێت ئاینێكی كردەیی پەیوەست بە بوون و ژیانی ڕۆژانەیە، لەوەش دا ئایینێكی دوورە پەرێز لە كەون و بەرزتر لە بوونە، ئایینێكە مەبەستی یەكخواپەرستی و یەكخستنی نێوان تاك و خەڵك و گەلانە، پشت دەبەستێ بە كتێبێ كە هیچ پووچیەكی تێدا نیە، بەڵام داوا دەكات گۆڕان و پەرەسەندن ڕوویدات. هیچ شتێ نیە بۆ چاكسازی بارەكان گۆڕان و پەرەسەندن بخوازێ و بە پێوەری ئیسلام بڕیاری لەسەر بدرێ وەك فەرمان بە چاكە و ڕێگری لە خراپە، زیندوێتی و سەلامەتی ئیسلام لەلایەكەوە لەوانەوەیە كە دەمیارێزن و لەلایەكی تریشەوە لە نوێكەرلنیەوەیەتی. نوێكەران پاڵپشتی ئیسلامن بۆ

زامنی ڕێی ڕاست و بەردەوامی زیندوێتی لە هەموو سەردەمەکان دا و لە ئوممەتی ئیسلامیش دا هیچ ئیمتیاز و پیرۆزیەکیان نیە و ڕێکخستنێکی کەهنوتی ئایینیان نیە، هەر سەردەمەو ڕۆڵێکی گەورەی بێ شومار هەیە. چاك تیرل دەڵێت: کاتێك لێکۆڵەر بەو جۆرەی هەیە لە ئیسلام دەکۆڵێتەوە واتە وەك ئەوەی تیایدا دەژی و گەلە ئیسلامیەکان پەیڕوی دەکەن– و لە پەیوەندی نێوان ئیسلام وەك واجبی خۆی و نێوان ئیسلامی واقعی ئێستامان بکۆڵێتەوە لێکۆڵەر دەبینێت ئەو پەیوەندیانە بە گۆڕانی سەردەم و کۆمەڵگە و هەڵسوکەوتە ئاکاریەکان دەگۆڕێن. هەروەها دەبینن لێکۆڵینەوەی پەیوەندی نێوان ئیسلامی نمونەیی و ئیسلامی واقعی بە لێکۆڵینەوەی فیقهناسان و گرنگیدانیان بە ئیجتیهاد و لێکۆڵینەوەی دادوەرانی گرنگی پێدەرو زانایان‌و ئیمامانی مزگەوتەکان و ڕێبەرانی تەریقەتە جیاجیاکان دەبێت. هەموو ئەوانە لە ڕابردوودا هەوڵیان داوە بە تەواوی لە ئیسلام تێبگەن و بەسەر واقعدا پەیڕەوی بکەن تا ئاستی بەرزبێتەوە بۆ ئەو ئامانجانەی کە لە ئایین ڕازی بن. هەیانە سەرکەوتوو بووەو هەیانە خۆی گومڕا بووە و خەڵکیشی گومڕا کردووە، ئەوانەی لەم سەردەمەدا هەوڵ دەدەن تاکگەرایی و فرەجۆری و ڕاوبۆچوون و نموونەی باڵا و نەریت و یاساکان پێکەوە بگونجێنن دەبێ تاقی بکرێنەوە بە گشتگیری و قوڵی هەموو کاریگەریە دەرەکیەکان و فشاری کۆمەڵگە پیشەسازیەکان و فشاری دەزگا ڕاگەیاندنەکان بەسەر کۆمەڵگەی هاوچەرخی ئیسلامی، لەم ڕوانگەوە ڕێی چاکسازانی نوێگەری باوەڕدار بە زیندوێتی و بەردەوامی ئیسلام ڕوون دەبێتەوە.

نوسینەکانی نوسەرانی ڕۆژئاوا بۆ دوو بواری گرنگ دابەش دەبن، یەکەمیان ژیاری ڕۆژئاوایی و ئەو مەترسیانەی لە ئەنجامی جیابوونەوەی لە دیدی خوایی توشی بوون (گارودی ئەو باسەی هێناوە سەرەڕای دوو لێکۆڵەری تریش) (باسێکی تایبەتمان لەسەر هێناوە). دووەمیان گۆڕانی نوێی تێگەیشتنی کتێبە پیرۆزەکان، ئەمەش دکتۆر

بوكای باسی كردووەو گەورە زانایان و بیریارو لێكۆڵەرانێ كە موسڵمان بوون كاتێ باس لە ئەزموونی تایبەتی خۆیان دەكەن باسیان كردووە، لەمەش دا پشكێكی گەورەی تیشكی سەر ئەو مەسەلەیەمان لەبەردەمدان.

موحەممەد ئەمان هوبوهم (ئەڵمانیا) وەڵامی ئەو پرسیارە دەداتەوە كە دەڵێت: بۆچی ئەمڕۆ ڕۆژئاواییەكان گرنگی دەدەن بە ئیسلام؟ چەندین هۆكار هەن، چونكە ڕاستی بەهێزی بەردەوام دەبێت، بنەمای ئیسلامی لەسەر بنەڕەتی بنەمای مرۆیی و سروشتی و سەرنج ڕاكێشیە بەجۆرێ تەواو كاریگەرە بە گەڕان بەدوای حەقیقەت دا، با بۆ نمونە باس لە بنەمای یەكخواپەرستی بكەین كە چۆن مرۆڤ ڕێزی بەرزی مرۆیی دەبێ و لەدەست خورافە ڕزگار دەبێ و چۆن بنەمای یەكسانی نێوان مرۆڤەكان لەسەر ئەو بنەمایە دێتە دی كە خوای گەورە دروستكەریانە و ئەوانیش بەندەی یەك خوان و بڕوایان بە یەك خوا هەیە، بەشێوەیەكی تایبەت سەبارەت بە دڵنیایی بە سەردەچاوەی ئیلهام و دلێریەك دادەنرێت كە ترس نازانێ و ئەمانێ هەیە كە دوای ئەوە ئەمان نیە، ئیمان بە ژیانی دوای مردن كاریگەریەكی كارای هەیە لە پێوەرەكانی مرۆڤ دا، ئیدی ژیانی دنیا ئامانجی چێژەكانی نیە بەڵكو زۆربەی چالاكی مرۆڤ دەبێ پەیوەست بێ بە چاكسازی بارمان لە ڕۆژی دوایی دا و هەستكردن بە ڕۆژی دوایی، سەرەڕای ئەوەش مرۆڤ بەدوای ئەوەدا دەگەڕێ دوور بگرێ لە سوكی و نزمیەكان و هانی بدات بۆ ئەنجامدانی كارە زۆر چاكەكان، تەنها ئەوە تاكە زامنی ڕزگاریە لە دەست ئاگر لە ڕۆژی دوایی داو بڕوابوون بەوەی مرۆڤ دەبێ لەبەردەم خوادا دادپەروەرانە و بێلایەنانە موحاسەبە بكرێ، توانای هەموو شتێكی هەیە كە وامان لێدەكات دووجار بیربكەینەوە پێش ئەوەی تووشی تاوان بین، ئەمەش گەورەترین و چاكترین توانای بەهێزو یەكلاكەرەوەیە لە جیهاندا.

مەسەلەی دووەم كە ڕۆژئاواییەكان بەرەو ئیسلام ڕادەكێشێ جەختكردنەوەیە لە بنەمای لێكبوردن سەرەڕای ئەوەی نوێژی ڕۆژانە وریایی بۆ مرۆڤ دەگێڕێتەوە. هەروەك

مانگی ڕۆژوو مرۆڤ فێری خۆ ڕێکخستن و زاڵکردنی خۆی بەسەر هەست و سۆزەکانی دا فێر دەبێ. گەورەترین دەستکەوتی ئیسلام سەرکەوتنی بوو لە پێکهاتەی گیانی ڕەچاوی سنورە ئەخلاقیەکان بە دەروونی هەڵگرانی دا بێ زۆر و فشارێکی دەرەکی. موسڵمان هەر جۆرێ بێ بڕوای تەواوی بەوە هەیە بەوەی لە قسەو گوفتاری دا ملکەچی خوایە، ئەم هەستەوە لە هەمیشە دووری دەخاتەوە لە تاوان و مرۆڤیش بە فیترەت حەز بە چاکە دەکات. ئیسلامیش ئاشتەوایی دەروونی و سەلامەتی عەقڵ پێشکەش بە شوێنکەوتووانی دەکات. ئەمەش کۆمەڵگەی هاوچەرخی ڕۆژئاوایی بەدوایدا دەگەڕێت. لەژێر سایەی چەند نیزامێکی جیاجیادا ژیاوم. ئەوانە نیزامی ژیانن وەك چۆن بارودۆخم بۆ گونجا تا لێکۆڵینەوە بکەم لەسەر چەند مەزهەبێکی جیاجیا، ئەو ئەنجامە کۆتاییەی پێی گەیشتم ئەوەیە ئیسلام ئایینی کامڵە. شیوعیەت لەلایەنە هەڵخەڵەتێنەرەکانیەوە کەسە سادەکان ڕادەکێشێ. هەروەك ئەو دیموکراتیەتە ڕۆژئاواییە شەیدای خۆی هەیە، بەلام مەزهەبێ نیە دیدێکی جوان و تەواوی بۆ ژیان هەبێ بەو جۆرەی ئیسلام بۆی دەڕوانێ، بۆیە ڕێی ئیسلامم گرتەبەر. ئیسلام ئایینێکی نەزەری تەواو نیە، بەڵکو ئایینێکی کردەییە کە لەسەر ئیسالەت دامەزراوە، ئەمەش دابەش نەبوو بۆ چەند شانەو بەشێ، بەڵکو ملکەچی تەواوە بۆ ویستی خوا.

سەبارەت بە مامۆستا موحەممەد صدیق (موسڵمانی ئەڵمانی) باس لە لایەنێکی تری دیدی ئیسلام دەکات. سەبارەت بە خۆم ئیسلام وەك چالاکیەکی دۆزەرەوەی فیترەتم وایە، بۆم دەرکەوت ئیسلام وەك ڕێبازی ژیان وایە و لەگەڵ هەموو بەشەکان دا لەگەڵ فیترەتی مرۆیمدا یەکانگیر دەبێ ﴿فِطْرَةَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ اللَّهِ ذَٰلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ﴾.

موسڵمانانێ لە ڕۆژئاواو ڕۆژهەلات سەرسامی خۆیان بۆ ژیاری ڕۆژئاوایی دەربڕیوە، بەڵکو سەرسامانە دەکەونە دوای، ئەوانە دەبێ بیریان بێ برتراند راسلی فەیلەسوفی ئینگلیزی چی دەڵێ: خەڵکی لە ڕۆژئاوادا ناتوانن گەشە بدەن بە لایەنی مرۆیی ژیان

بەهەمان ئەو چەندێتیەی کە گەشە بە لایەنە مادديەکەی دەدەن. هەموو هەنگاوێ ڕووەو پێشەوە لە داهێنانەکانی ماددەدا هەنگاوی ڕووەو لەناوبردنی مرۆڤن. پێویستە لەسەرمان هەمیشە بێدارین و خۆمان نەخەینە بەر سۆزی ئەو ژیارە، پێویستە ئەوەی لەگەڵ ئیسلاممان دا دەگونجێ لێی وەرگرین و بۆگەنی و خراپیەکانی فڕێ بدەین.

ئەمەش شتێکی گونجاو و ئاسانە کاتێ بەڕوونی و ڕێنموونی بڕوامان بە ئیسلام هەیە، خوا بە ویستی خۆی ڕێنموونی دەبەخشێ، ژیاری ڕۆژئاوایی چارەسەرێکی نیە بۆ جگە لە کێشەکانی ژیاری ماددی. شوێنەوارە وێرانکەرەکەشی لەسەر ژیانی مرۆیی دەبینین. خێزان داڕما و پەیوەندی سۆزی نێوان تاکەکان وەستا، بۆیە ئەگەر بمانەوێ بەڕاستی مرۆڤ بین و هەڵسوکەوتی مرۆڤانەمان هەبێ دەبێ بەتەواوی دەستبەرداری نەریتی کوێرانەی ژیاری ڕۆژئاوایی بین.

ئافرەتی ڕۆژئاوایی لە ئیسلام دا چەمکێکی تری بۆ هەیە، خاتو نادیە زۆنال دەڵێت: من بۆ کەموکورتیەکانی ناو کتێبەکان دەگەڕام و وەك فەڕەنسەیەکان ڕەخنەم لە ئیسلام دەگرت بەتایبەت لە مافی ئافرەت دا، بەڵام کاتێ سروشتی ئیسلامم زانی ئەو بیروباوەڕەی لە ئەندێشەم دا بوو گۆڕاو بڕوام هێنا بەخوا و دانم نا بەوەی ئیسلام تاکە ئایینێکە کە لە ئاسمانەوە دابەیوە، چونکە ئیسلام خەڵاتی زۆری کردم و لە ژیانم دا هەموو شتێکی گۆڕی. ئێستاش بیرو وتەم سەرتاپا گۆڕا، تەنانەت بەرگیشم گۆڕی هەروەك جۆرێ لە ئازادی پێ بەخشیم، هەر کەس لەم سەردەمەدا لەسەر ئیسلام شت بڵاودەکاتەوە ڕەنگدانەوەی حەقیقەتە. قورئان بانگی کردم بۆ ئیسلام.

دواتر دیاردەیەك هەیە کەسانی ڕێنمونیکراو بۆ ئیسلام کە نەوەی ڕۆژئاوای وا لێدەکات ڕۆڵی بانگخوازی ببینن، یەکێ لە بەریتانیاو یەکێ لە فەرەنسا.

پاشبەکشەی (کات ستفیس)ی گۆرانی بێژی ئینگلیزی لە شانۆی گۆرانی ڕۆژئاوایی لە ساڵی ١٩٧٥ز. دا لەبەر موسڵمان بوونی بوو. پێش ئەوە سەرقاڵی چەپڵەو هاواری ناو

هـۆڵی شـانۆ بـوو، هـەروەك بـۆ ڕۆژنامـەی (ئیـسلامیك ریفیـو) قـسەی كـردووە بـە خوێندنـەوەی سـورەتی یوسـف دڵـی پـڕ گریـە بـووە، لێـرەوە نـاوی یوسـف ئیـسلامی بۆخۆی هەڵبژارد. ژنەكەشی لە پاریس وەك شا جـوانی باشـور هەڵـسوكەوتی دەكـرد و دوای موسـڵمان بـوونی بـەناوی (مەلیكـە موسـڵمانی باشـور) ناسـراو نـاوی (ئەمینـە حەسەن)ی بۆ خۆی هەڵبژارد تا دوای موسڵمان بـوونی ئـەو نـاوەی هـەبێ و هاوسـەری یوسف ئیسلام بێ.

چیرۆكی ڕێنموونی و موسڵمان بوونی ئەو ئافرەتە ئەوەبوو كە گوێی لە دەنگی بانگ بووە هاواری دەكرد (حي على الصلاه) هەستی كردووە بە شەفافیەتێك بانگی كـردووە بۆ پێویستی وردبوونەوە لـە ئیسلام، چـووە بـۆ مزگـەوتی پـاریس تـا لەسـەر دەسـتی مامۆسـتای زانكۆكـە موسـڵمان بـێ، یوسـف ئیـسلام چـوویە مەڵبەنـدی بانگـەوازی ئیسلامیو موسڵمانان بە نمونەی باڵا سـەیریان دەكـرد. دەڵێـت لـە قورئـان دا وەڵامـی هەموو پرسیارەكانم دەست كەوت، ئیـسلام بـانگی كـردم و منـیش چـووم بەدەمیـەوە. كڵێساش تێكی شكاندبووم و هیلاكی و لەناوچوونی پێدام، بەرەو قورئانی نـاردم كاتـێ نەمـدەتوانی وەڵامـی پرسـیارەكانی نـەفس و گیـان بدەمـەوە. ئـەوكات ئـەم ئایەتـەم خوێندەوە: ﴿يُخْرِجُ الْحَيَّ مِنَ الْمَيِّتِ وَيُخْرِجُ الْمَيِّتَ مِنَ الْحَيِّ﴾. مۆسـیا ئـایینی پێشووم بوو و ئیسلام ئایینی ئێستامە. بڕوایەكم بە خوا هەبوو، بەڵام كڵێسا پێی نەوتم ئەو خوایە چی یە، نەمدەتوانی بگەم بە حەقیقەتی ئەو خوایەی قسەی لەسەر دەكرد. بیرەكە ئاڵۆز بوو. بیرم دەكردەوە لە ژیانێكی نوێ، بیرم دەكردەوە لەو بەختەوەریـەی كە لەناو بانگ و كڵێساش دا بەدیم نەدەكرد، تەقەم دا لە دەرگای بوزیەت و فەلسەفەی چینی و كەوتمە دوای بورجەكان، بەڵام هەموو ئەوانە لام هاشوهوش بوون. دواتر چووم ڕووەو شیوعیەت و گومانم ئەوە بوو چاكە لەوەدایە سـامانی جیهـان بەسـەر خـەڵك دا دابـەش كـرێ، بـەڵام بینـیم شـیوعیەت لەگـەڵ فـیترەت دا ناگونجـێ، دواتـر هەرچـەند

ئەملاولام کرد هەستم کرد بیرو باوەڕێ نیە وەڵامم بداتەوە. ئەو ڕاستیەی بۆی دەگەڕام بۆم ڕوون بوویەوە و موعجیزەکە ڕووی دا کاتێ براکەم نوسخەیەکی قورئانی پیرۆزی پێ بەخشیم، بیرم دەکردەوە لەو ئیسلامەی کە لەدیدی ڕۆژئاوادا بە دەمارگیری سەیر دەکرا و دەوترا موسڵمانان بێگانەن. بۆ یەکەم جار هەستم بەوەکرد قورئان بەناوی خوا دەست پێ دەکات. دەستەواژەی ﴿بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ﴾ کاریگەری بۆسەر دەروونم هەبوو. قورئان بە پەرستیشی خوای تەنها و پەروەردگاری هەموو جیهانیان دەستی پێکردو جەختی لە ڕاستیەکان و دروستکراوەکان دەکردەوەو دەیوت خوا تەنهایەو هیچ هاوەڵێکی نیەو تەنها هێز لای خوایە، ئەمەش واتایەکی نوێ بوو. ئەمەش هاودەم بوو بە بڕوا بوون بە خواو بە ڕۆژی دوایی و مانەوەی هەمیشەیی ڕۆژی دوایی، بۆیە تۆ پارچە گۆشتێ نیت کە ڕۆژێ ببیتە خۆڵەمێش وەك ئەوەی زانایانی زیندەوەرزانی دەیڵێن. ئەوەی لەم ژیانەدا دەیکەیت ئەو بارەت دیاری دەکات کە دوارۆژ تیایدا دەبیت.

سەبارەت بە کۆیلایەتی و مافی ئافرەت: حوکمی ئیسلام بۆ ئافرەت تەواوکاری کەسێتی ئازادیەتی. هەر کەس بەو بەرگەوە (بەرگی ئیسلامی) لە فەرەنسا بمبینێ وا دەزانم سەرسام دەبێ و منیش لەوەدا هەست بە ئازادی تەواو دەکەم چونکە پلەی حەقیقی ئافرەتم وەرگرتووە، ئەوەی ڕۆژئاواییەکان دانی پێدا دەنێت، لای ڕۆژئاواییەکان ئافرەت شتێکە بۆ سود وەرگرتن یان سود لێ وەرگرتنی. ئەو گەورەییەم زانی کاتێ ئیسلام بەخشیویەتی. لە ئیسلام دا ئافرەت بەهای تەنها ڕوخساری نیە بەڵکو بەهای مەعنەویەو ڕێزێکی گەورەی هەیە. من زۆر هەشت بە خۆشی دەکەم دوای ئەوەی بۆ یەکەم جار ئیسلامم وەرگرت.

ئەم نمونەو دەیان نمونەی تر داهاتوی ئیسلام لە ڕۆژئاوا دەخەنە ڕوو کە لێکۆڵەران چاویان لەسەر ئەو کودەتا مەترسیدارەیە کە ئیسلام لە جیهان دا ئەنجامی دەدات و

ئەمڕۆ هەموو ئەورووپای گرتووەتەوە. وەك ئەنریکوجار بیالدی ڕۆژهەڵاتناسی ئیتاڵی دەڵێت ئیسلام بووە بە باسی سەرەکی و کەس بڕوای نەدەکرد تیشکی ئیسلام لە ئەورووپا دەرکەوێ چونکە ئەورووپا دوور بووە لە ئیسلام و دژی جەنگاوە.

سەبارەت بە داهاتووی ئیسلام لە ئەورووپا یەکێ لە لێکۆلەران دەڵێت: ئەو ڕاستەی بەڵگە هێنانەوەی ناوێ ئەوەیە ئیسلام هەموو ڕۆژێ دوو کەسی نوێ لەخۆ دەگرێ، ئەمەش تایبەت نیە بە دەستەیەکی دیاری کراوی بارێکی تایبەت یان دەستەیەکی مرۆیی کە بارو مێژوو و نەریت و بیروباوەڕی خۆی هەبێ یان ڕەوتێکی دیاری کراوی ژیاری هەبێ کە تەنگژە و چەرمەسەری و نارەحەتی خۆی هەبێ. لە ئەورووپا و ئەمریکادا هەرچەند کەش و هەوای جەنگە خاچیەکان و هەوڵی بێکۆتای شێواندنی وێنەی ئیسلامی تێدایە، بەڵام مەڵبەندە ئیسلامیەکان ڕۆژانە پێشوازی دەکەن لە چەندین کەس کە لە ئاست و تەمەنی جیاجیادا موسڵمان بوونی خۆیان ڕادەگەیەنن، مەسەلەی ئیسلامی بەچەند دیدێکی جیهانی دەجولێ و گەورەترە لەوەی لە کۆمەڵ یان ڕەگەز یان گەل یان ڕەنگێك دا بەرتەسك بکرێتەوە.

هەڵەی بیروباوەڕی مێژوویی و ژیاری پەیوەستکردنی ئیسلامە بە ڕەگەز یان گەل یان کۆمەڵێکەوە، ئیسلام لە هەموو شوێنێ هەیەو خراوەتەڕوو، بۆ هەموو مرۆڤێکیش هەیە سەرەڕای ئەو هەوڵانەی دوژمنانی بۆ لەناوبردنی دەیخەنە گەڕ تا بڵاونەبێتەوە و سەرنەکەوێ.

ئەورووپا لە داگیرکاری نوێی بۆ جیهانی ئیسلامی و هەر لە جەنگە خاچیەکانەوە لەڕووی مێژووییەوە ئەوپەڕی هەوڵی داوە بۆ شکاندنی شان و شکۆی ئیسلام لە کەش و هەوای خۆیدا و هەوڵی داوە بەربەستی لەبەردەم دا دابنێ تا نەگاتە ئەورووپا، ئەمەش بەهۆی پاڵنەری کینەی مێژوویی خاچپەرستیەوە، بەڵام لەڕووی هزریەوە سەرکەوتوو نەبوو هەرچەندە لەڕووی سەربازیەوە سەرکەوت.

بزافی ڕۆژهەڵاتناسی ڕۆڵی خۆی هەبوو لە پەردەپۆشکردنی عەقڵی ئەوروپی تا تیشکی ئیسلامی پێ نەگات و هەوڵی داوە دووری بخاتەوە و دژ بە ئیسلام و موسڵمانان کار بکات. ئیدی چی نەسارنی لە ئەوروپادا هەیە هەست دەکات بە دەمارگیری و کینەی دژ بە ئیسلام. لە ئەندێشەی موسڵمانان دا سەبارەت بە ئەوروپا ماوەی ئەو کینەی داگیرکەرە و وێنەی پەرتبوون و ئەو ئەزموونە ماوەتەوە کە بەسەر جیهانی موسڵمانان دا پەیڕەو کرا.

سەبارەت بە ڕۆژی دوایی: لە قورئان دا ناوی نوسەرێکم نەدی و هەوڵیشم دا بەدوای هەڵەی قورئان دا بگەڕێم کەچی هیچم نەدۆزیەوە. هەمووی لەگەڵ بیرۆکەی پوختی یەکخواپەرستی دا دەگونجێ. ناوی هەموو ئەو پێغەمبەرانەم تێدا بینی کە بەڕێزو ڕێزدار کراون و جیاوازی نەکراوە لەنێوان هیچکامیان دا، ئەگەر فەزڵی پێغەمبەرێ بدەیت بەسەر پێغەمبەرێك دا ئەوا یەکبوونی پەیامەکان تێکدەشکێ، تێگەیشتم ئیسلام هەمان ئەو ئایینەیە کە هەر لە سەردەمی ئادەمەوە نێردراوە بۆ خەڵك. خەڵکیش بە درێژایی مێژوو دوو بەش بوون: یان باوەڕدار یان بێ باوەڕ. قورئان وەڵامی هەموو پرسیارەکانی دامەوە، بەوەش تەواو هەستمکرد بە بەختەوەری چونکە حەقیقەتم دۆزیەوە ﴿لاَ إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ قَد تَّبَيَّنَ الرُّشْدُ مِنَ الْغَيِّ﴾ کاتێ موسڵمان بوونی خۆمم ڕاگەیاند هەستمکرد تازە لەدایك بوومەتەوەو زانیم لەگەڵ براکانم دا کە بەندەی موسڵمانی خوان بەرەو کوێ بڕۆم، لە باشترین سەرچاوەکانی ئیسلامەوە ڕووەو ئیسلام چووم، ئەویش قورئان بوو. ئەگەر مرۆڤێ بانگی بکردمایە بۆ ئیسلام داواکەیم قبوڵ نەدەکرد لەبەر باری شێواوی موسڵمانان و شێواندنێ کە دەزگاکانی ڕاگەیاندن لە ڕۆژئاوا ئەنجامی دەدەن. دواتی ژیانی پێغەمبەری خوام خوێندەوەو هەستمکرد بەو سامانە زۆرەی ناو ژیانی پێغەمبەر (ﷺ). موحەممەد موسڵمانان بانگ دەکات تا وەك ئەوە نەکەن کە نەسارا لەگەڵ عیسا (علیە السلام) کردیان. ئێمە پێغەمبەرمان

خۆشدەوێ چونکە خوا خۆشیدەوێ و لەبەرئەوەی پەیامی خوای بۆ هێناوین. مۆسیقام لەبیر کرد چونکە ئیسلام بە مۆسیقا ڕازی نیە. ئیسلام هەوڵ دەدات بۆ دروست کردنی پیاو، پێویستە وەك ئەوەی خوا دەیەوێت خێزان و منداڵەکانمان پەروەردە بکەین، نەك بە مۆسیقا و گۆرانی خێزان و منداڵەکانمان لەناو ببەین. چونکە کاتێ بیروباوەڕە ناخیەکان ناتوانن بەختەوەری و ئارامی لە دەروون دا بێننەدی خەڵکی پەنا دەبەنە بەر مۆسیقاو گۆرانی.

ئەو ملیۆنەها دۆلارەش کە هەم بوو بەخشیم بە بانگەوازی ئیسلامی، بە هەموو مرۆڤێکی نا موسڵمان دەڵێم با بێلایەنی و مەوزوعیەت و بێ لایەنگیری بۆ بیروباوەڕی خۆی یان بۆ موسڵمانان قورئان بخوێنێتەوە، چونکە ئەوەی تێدا دەبینێ کە قەناعەتی پێ دەکات و دەبینێ ئەوە فەرمایشتی خوایە. ئەو پێشڕەویە بیۆلۆجیەی ڕۆژئاوا بەدیهێناوە بوویە هۆی کەنارگیری ئایینی مەسیحی لە ژیانی خەڵك لێرەدا. چونکە مەسیحیەت دژی ئەو پێشکەوتنە بوو، دواتر بەرەبەرە دەستبەرداری هەندێ ڕای خۆی بوو و بنەماکانی شێوان و گۆڕان. بەڵام دووبارە نەیتوانی دڵی ئەو خەڵکە ڕاکێشێ کە زانستیان کردبوو بە ئایینێ بۆ خۆیان لەبیری مەسیحیەت و لەگەڵ ئایینی نەسرانیەت دەجەنگان و دژی هەر ئایینێ بوون. لێرەدا خەڵکی ئایین لە ژیان و زانست جیا دەکەنەوە بەڵام ئەگەر ڕۆژئاواییەکان ئیسلامیان بناسیایە ئەوە زۆر دەگۆڕا، چونکە هەموو مرۆڤێ پێویستی بە ئایین هەیە.

هەڵوێستی ڕۆژئاواییەکان بەرامبەر مردن هەڵوێستێکی یەکپارچە ترس و بیمە لە نەزانراو بۆیە لە مردن دەترسن. هەروەك بڕوایان نیە بەدوای مردن، جولەکەش بڕوایان وایە ژیانی دنیا کۆتای ڕێگەیە. بڕوانە جوانی ئیسلام کە حەساسیەتی نوێ و ویژدانی زیندوو و هەست و بەرپرسیارێتی لە دڵی موسڵمان دا دروست دەکات، ئەمەش بەهۆی نیعمەتی بڕوابوون بە ڕۆژی دوایی. پیاوی ڕۆژئاوایی بڕوای وایە ئیسلام ناهێڵێ ئازاد

بێ و تام و چێژ لەو ژیانەوە ببینێت. ئێمەش بۆ ئەوەی لە عەقڵیەتی مرۆڤی ڕۆژئاوایی تێبگەین دەبێ سەرەتا لە بنەڕەتەکانی ئەو عەقڵیەتە تێبگەین. کۆمەڵگەی ڕۆژئاوایی کۆمەڵگەیەکی بتپەرستی یەو لەخوا بێئاگایە. بۆیە وەك لە فەرهەنگی جەماوەرییان دا ئەفسانەو وێنە و پەیکەر هەیە و مەیدانیان پڕە لەو شتانە وا مرۆڤ ڕادەهێنن. کاتێ نەسرانیەت هات لەگەڵ کلتوری یۆنانی ڕۆژئاوایی تێکەڵ بوو و دیدیان بۆ مرۆڤ گۆڕا بە دانانی بەخوا و بە عیسایان دەوت خواو سیفەتی خواییان پێدا. بەمە ڕۆژئاواییەکان کەوتنە کێشەیەك کە پێویستیان بە چارەسەری بوو چونکە وا دەیانڕوانیە مرۆڤ کە کاملە، بەڵام مرۆڤ هەڵەی هەیە و بەلاوازی دروست کراوە و کاملی تەنها بۆ خوایە.

*سەبارەت بە پێغەمبەر موحەممەد (ﷺ): ڕۆژئاواییە موسڵمان بووە نوێکان قورئان دەزانن و پێغەمبەر موحەممەدیش بە وێنەیەکی نوێی جیا لەو وێنەی کە وێنایان دەکرد دەناسن. دکتۆر مایکل دی ئیبالسا مامۆستای زانکۆی مەدرید دەڵێت دانەنانی ئاستی حەقیقی پێغەمبەری ئیسلام لەلایەن ڕۆژئاواوە دەگەڕێتەوە بۆ نەزانیو ڕقی سیاسی و بنەمای ئایینی مەسیحی. مەسیحیەکان لە سەرەتای دەرکەوتنی ئیسلامەوە بڕوایان وابوو پێغەمبەر موحەممەد هەر تەقی و مەسیحیەو لەسەر گومڕاییەو تەنها ڕێبەری دەستەیەکی لادەری ناو مەسیحیەتی ڕۆژهەڵاتە. هەروەك بڕوایان وایە لە سەرکردەکانی جەنگ بووە و ئەو نەزانییەش چەندین سەدە بەردەوام بووە.

کرۆس ئیزنابزت دەڵێت لەوانەیە بەدرێژایی مێژوو خاوەن بانگەواز نەبێ هێندەی مەحەممەد بە ستەم بەر تانە و سوکایەتی بدرێ، هیچ تۆمەتێکی خاوەن بنەڕەتی سیاسی یان ئایینی نیە وەك ئەو تۆمەتەی بەرە ڕووی ئیسلام کراوەتەوە. سەرچاوەکەشی ئەوە نیە ئیسلام بەدرێژایی سەدەکانی ناوەڕاست یەکەم دوژمنی سیاسی مەسیحیەت بوو بێ، بەڵکو لەبەرئەوەیە کە ئیسلام هەر لە سەرەتای

دەرکەوتنیەوە ململانێی ڕیشەیی لەگەڵ ئەو شێوە سیاسیانەدا هەبووە کە زاڵن بەسەر بزاڤە یەکەمیە مەسیحیەکان دا. جەنگە بەردەوامە سیاسیەکانی نێوان وڵاتانی ئیسلامیو مەسیحیەت تا جەنگە خاچپەرستی و داگیرکاریەکانی کۆتاییش زۆربەیان ڕێگربوون تا ڕێ نەدەن بەوپەڕی مەوزوعیەت و ڕێزەوە بڕواننە پێغەمبەرو دامەزرێنەری ئایینی ئیسلام.

دواتر گۆڕانی نوێی مەسیحی بەرامبەر موحەممەد ڕوویدا بەرامبەر نەزانی مەسیحیەکان لەڕووی پێغەمبەردا و بەرەبەرە بەهۆی ئەو لێکۆڵینەوە مێژووییانەی نوسەرە ئەورووپیەکان لە سەدەی نۆزدە و بیست دا ئەنجامیان دا ئەو نەزانینە نەما. بڕیاری پێشوەختی دژ بە موسڵمانان گۆڕا. ئێستا لە ئەورووپا بابەت بە بانگەشەی مەوزوعیەت لەسەر موحەممەد دەنوسرێ. چەند مەسیحیەکی بەهێز هەن کە بە مەوزوعیەت لەسەر ئیسلام و پێغەمبەرەکەی دەنوسن. هەروەها نەریتی خۆیان بەکاردەهێنا وەك پشت بەستن بە بنەمای یەکسانی نێوان مرۆڤەکان. هەروەها ڤاتیکان دەڤێکی بڵاوکردەوە تیایدا دەیوت: کڵێسا بەو چاوەوە سەیری موسڵمانان دەکات کە خوای تەنهای تاکی زیندووی بەهێزی میهرەبان دەپەرسترا خوایەك توانای هەموو شتێکی هەیە و دروستکەری ئاسمان و زەویە و خەڵکی دواندووەو موسڵمانانیش بە هەموو هەستێکیان ملکەچی فەرمانی خوان وەك چۆن ئیبراهیم ملکەچی بوو. موسڵمانان مەسیح وەك پێغەمبەر بەرز ڕادەگرن یا وەك خوایەك دانی پێدانەنێنن. هەروەها دایکی عیسا بەڕێزەوە سەیردەکەن و بەوپەڕی تەقواوە باسی دەکەن. دواتر هیوایان ڕۆژی دواییە. کۆڕی ڤاتیکانی پیرۆز داوای دەکرد ڕابردوو لەبیر بکرێ و هەوڵ بدرێ هەردوولا لەیەك تێبگەن.

ئەمە بانگەوازێکە بۆ لابردنی بڕیارە سلبیە پێشوەختەکانی لای زۆربەی ئەورووپیەکان. دوای ئەو ئەو سەرچاوە خواییەی پەیامی موحەممەد دێ کە سەختترین

خاڵە، چونکە ناکۆکی ڕیشەیی نێوان دوو بیروباوەڕی ئیسلامی و مەسیحی لەوەدایە. ئەمە ئەو بانگەوازەیە کە بانگخوازانی گفتوگۆ دەبوو هەڵیگرن. بانگەوازێکە هەر لە سەرەتای دەرکەوتنیەوە هەڵوێستێکی یەکلاکەرەوەی هەبوو ڕووەو پێش دەیبرد. بەڵکو ئەوەی بە تەواوی لەنێو دەرکەوتنی دیاردەی ئیسلام لە ڕۆژئاوادا دەرکەوت هەڵوێستێکی تەواو سەخت و بەرگریکاری سەرکەشی بوو بەو جۆرەی لە باسەکانی دواتر دا باسی دەکەین. پێویستە لێرەدا ئاماژە بکەین بە کتێبی دەزگا ڕۆژئاواییەکان زۆر قسەی لەسەر دەکەن. ئەویش کتێبی (**سیرة محمد**)ی نوسەری ڕۆژئاوایی (مارتن لنگر)ە کە لە ساڵی ١٩٣٨ز. موسڵمان بوو و ناوی خۆی گۆڕی بە ئەبوبەکر سیراجەدین. ئەبوبەکر گەڕایەوە بۆ سەرچاوە یەکەمەکان: قورئان و سوننەت و صەحیحی بوخاری و موسلیم و (**الطبقات الکبری**)ی ئیبن سەعد و مەغازی واقیدی و تا لەو ڕوانگەوە کتێبەکەی لەسەر ژیانی پێغەمبەر (ﷺ) بنوسێ.

دوای ئەمە پرسی زانایانی ڕۆژئاوا دێ سەبارەت بە هەڵوێستیان لە ئیسلام دوای ئەوی خراپی مەنهەجی ڕۆژئاوا و ئایدۆلۆجیا و مەزهەبە دەروونی و کۆمەڵایەتی و سیاسیەکانی ڕۆژئاوا دەرکەوتن.

دکتۆر ڕوشدی فەکار لە کتێبەکەی دا (نهایە العمالقە) ئەوەی ئەنجام داوە و دەڵێت بۆ گەڕان بەدوای حەقیقەت دا ڕێی بە پێشەنگ و نموونە دانانی هەڵکەوتەکان هەیە، بەڵام چەند نیشانەیەکی پرسیار هەمیشە خۆیان دەنوێنن دوای خوێندنەوەی چەند بیرێکی جیاجیای ژیاری ڕۆژئاوا هەر لە بیری مارکسی و بوونگەرایی و تەصەوریەوە، خود لەکوێیە و بۆکوێ دەچێ؟ ئامانج چیە و ڕاڤەی بوون و ڕاستی دروست کردن و دروستکەر چیە؟ دکتۆر ڕوشدی فەکار لێکۆڵینەوەی لەسەر فەلسەفەی خاوچەرخی ئەمانە ئەنجام داوە (سان سیمۆن، ئۆگەست کۆنت، کارل مارکس، هۆبەرت سینسر، سارتەر) بەڵام چی بینی؟

یەکەم: دیاردەی گومانی ڕوون لە هەموو نوسینەکانی فەیلەسوفانی بیری ئەورووپی لە سەدەی نۆزدەو بیستەم دا.

دووەم: هەڵگەڕانەوەی لە خوا. لێدانی ئیمان بە پێنوسەکانیان و تێکشکاندنی هێما ئایینیەکان.

ئەوان هەوڵیان دەدا ئەو یاسایانە بدۆزنەوە کە لە گەون دا بارەکان بەڕێ دەکەن تا بتوانن نهێنیەکانی بزانن و گومانیان وایە دەتوانن تەلیسمەکانی نەهێڵن. چۆن گەیشتنە بازنەیەکی خاڵی لەگەڵ خولانەوەی دا گەڕانەوە سەرەتای ڕێیان. گەورەیی عەقڵ لەبەردەم نهێنیەکانی ناکۆتاییی دا سەر دادەنەوێنێ و هەموویان دان دەنێن بە بێتواناییان لە ئاست بەرەنگاربوونەوەدا یان لەبەردەم ئیمانی مێشوولەیی ڕازیکەر یان ڕوونی ناڕازیکەردا.

سان سیمۆن دژ بە بیروباوەڕ بوو و لە دیدی قۆرخکاری کڵێساوە دەیڕوانیە مەسیحیەت و لە بانگخوازانی ئاڕاستەی دووفاقی یان دوو لایەنە (ئایین و زانست) بوو، سەبارەت بە خوا ئەوا سان سیمۆن تەنها گەیشتە ئەوەی بڵێ خوا لە هێزی سروشت دا خۆی دەنوێنێ.

سەبارەت بە ئۆگەست کۆنت ئەوا بە چەمکی تەواوی وەزعی ئایین دەخاتەڕوو. بەمە کەوتۆتە چاڵێکی بێ بڕیار. کاتێ ئیسلامی خوێندەوە وای بینی زیاتر لە قۆناغێکە و وەسفکردنی ئیسلام بەوەی تێرکردنی خود سیفەتەکانێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەش دا ئۆگەست کۆنت موسڵمان نەبوو و وەك سان سیمۆن هاوڕێی ملهوڕی مایەوە.

سەبارەت بە سارتەر ئەوا لەپێش مردنی دا داوای کرد قەشەیەکی ناو گوندێکی سادەی بۆ بهێنن، قەشەکە هات و ئەویش دانی نا بەشکستی خۆی دا.

کارل مارکس وتی ئایین سەرخۆشکەری گەلانە، مەبەستی قۆرخکاری کەهەنووتی چینایەتی ناو مەسیحیەت بوو. بیردۆزەکەشی لەسەر هەڵوێستی کڵێسا لە ڕۆژئاوادا دانایان ئەوەی ناوی نابوو (استغلال الكادحين) (قۆرخکردنی کرێکاران).

سەرسامی ئەوانەی کە ڕۆژئاواگەرانی هاوپێستمان پێشکەشی ئێمەیان دەکەن و وایان نیشان دەدەن لوتکە و پێشەنگن بەو جۆرەن و دواجار باریان ئاشکرابوو.

# باسی یەكەم

## ( ژیاری ڕۆژئاوا لەدیدی بیریارانی ڕۆژئاوادا )

هەر لە ڕۆژی یەكەمەوە كە چەمك و واتاكانی ڕۆژئاوا لە ئاسۆی بیری ئیسلامی سەردەمی نوێدا خرانەڕوو و زانایانی موسڵمان پێداچوونەوەیان بۆ كردن و نەیاری ئەو چەمكانەیان لەگەڵ یەكخواپەرستی دا خستەڕوو و بێتوانایی بەخشش و بارگرژی ئەو چەمكانەش بەرچاو خران و تەنا كەمێكیان وەرگیران. بەڵام ئەوانەش پاش كەمێك دەركەوتن و ئەو ژیارە یەكسان نیە و چەمكێ لە پشتیانەوەیە (ڕۆما پێشەنگەو چواردەوری كۆیلەن)و هەموو ئەوەی پێشكەشی جیهانی ئیسلامییان كرد چەمكی ڕەگەزپەرستی و دیدی نا یەكسانی بوو بۆ موسڵمانان و ڕەنگ جیاكان و ئەوانەی لە بنەڕەتی ڕۆژئاوا نین. لە هەمان كات دا شاڵاوەكان دژ بە خودی ئیسلام بوون تا گومان لەسەر بیروباوەڕو پێغەمبەر (ﷺ) و مێژووی ئیسلام و قورئان و زمانی عەرەبی بوروژێنن بەنیازی هەوڵی تەگەهەڵچنین بە ئوممەتی ئیسلامی بەبیری ڕۆژئاوا و ڕێ نەدان بە ڕۆشنگەران تا نەگەنە لای تیشكی ئیسلام. بەڵام خوای گەورە بڕیاری خۆی زاڵ كردو لە ڕۆژئاوادا چەند دەرگایەك كرانەوە كە بە چاوی ڕێز و سەرسامیەوە سەیری ئیسلامیام دەكرد و چەند دەنگێكی كەم دەركەوتن و باسی گەورەیی موسڵمانانیان كرد سەبارەت بە پێشكەش كردنی ڕێبازی ئەزموونی و چەمكە زانستیەكانی مێژوو و ئابوری و چەمكی ژیار و شارستانیەت.

یەكێ لە گەورەترین كەسانی بانگەوازی ئیسلامی سەردەمی نوێ كە مامۆستا حەسەن بەننا بوو هات و هێرشی بردە سەر ژیاری ڕۆژئاوایی و ساختەی ئەو ژیارەی ئاشكرا كردو موسڵمانانی بانگ كرد بۆ بەرەنگاربوونەوەی و خۆپاراستن لە تێكەڵ بوون لەگەڵ ئەو ژیارە. دواتر هۆشیاری لە خودی ژیاری ڕۆژئاواییەوە دەركەوت كاتێ

خراپیو پەرتی و داڕمانی ئەو ژیارە دەرکەوت کاتێ زانستە کۆمەلآیەتی و مرۆییەکانی جولەکە تیرۆریان کرد. دەریش کەوت بانگەواز بۆ داڕماندنی ژیاری ڕۆژئاواو ئاشکراکردنی خراپی بیری ڕۆژئاوا بووە بە زەرورەتی جەتمی ئەو قۆناغەی کە تیایدا بزاڤی بێداریخوازی ئیسلامی دەچوویە بازنەی ڕابوونەوە وەك پێشەکیەك بۆ قۆناغی ڕاپەڕین، بارەکە مرۆڤکاری کتێبە کۆنەکان و خراپی ئەو کتێبانەی ئاشکرا کرد. هەر دەبوو بەرەو ڕووی شەپۆلی سەرسامی و شوێنکەوتەیی ڕۆژئاوا بینەوە، چونکە لە هەمان کات دا ئەو ژیارە بەکەم دانانی ئوممەتی ئیسلامی و فەرهەنگی ئیسلامی لەخۆدەگرت. لە ئەنجامی هاتنی ئەو بەرنامانە بۆ خوێندنگەکانمان کە هەولیان دەدا بیردۆزەکانی ڕۆژئاوا بەسەر پرسی موسلمانان دا بسەپێنن. لێرەوە پێویستمان بەوە هەیە چەند ڕاستیەکی بنەڕەتی ئاشکرا بکەین بۆ ڕاستکردنەوەی ئەو ڕێیە:

یەکەم: ئەو ژیارە ڕۆژئاواییە زالە لە ئیسلامەوە و بە بنەڕەتە بنەڕەتیەکانی لێنەوی، دواتر لە ئیسلام لایدا و ئێستاش وا لە قۆناغی داڕماندایە چونکە لە ڕێبازی خوا لایدا و کەوتە شوێن حەز و ئارەزووەکانی مرۆڤ. ئەو تەنگژەش کە لە ڕووی کۆمەلآیەتی و ئابووریەوە خەریکە مرۆڤ و ژیاری ڕۆژئاوا لەناودەبات سەرچاوەکەی نەبوونی دیدی خوایی یە لەو ژیارەدا و کەمتەرخەمیەتی لە گرتنەبەری ڕێی ئیسلام و کارکردنیەتی بۆ لەناوبردنی بەهاکان و زێدەڕەوی لە خەرجکردنی سامان و زێدەڕەوی بەکارهێنان دا.

دووەم: ژیاری هاوچەرخی ڕۆژئاوا نەیتوانی سپاردەی دادپەروەری و سۆز و برایەتی مرۆیی لەخۆ بگرێ و هەموو ئەوانەی گۆڕی بە ستەم و توندی و دەروونی مرۆڤایەتی پڕ کرد لە ترس و بیم و هەموو پێناو و ڕێیەکی گرتەبەر بۆ سەپاندنی ڕێبازێکی ژیانی مرۆیی کە لەسەر تاکگەرایی زالّ یان کۆمەلبوونی خۆسەپێن وەستابێ. گەندەلی هەردوو ڕێبازەکە و دەستەوسان بوونیان لە بەخشین دا دەرکەوت.

سەبارەت بە بەخششی ئیسلام ئەوا ڕۆژئاوا زۆر ئەوەیان لەبیر کرد و نکوڵییان لێکرد تا دەرکەوت ناچارن دانی پێدا بنێن.

یەکەم: موسڵمانان پێش ڕۆژئاواییەکان کەوتن و ڕۆژئاوا دوای سەدان ساڵ گەیشتن بە ڕێبازی لێکۆڵینەوەی زانستی. ئەگەرچی بەرامبەر مێژوو و بانگەوازی ئیسلامی بەویژدان نەبوون، بەڵکو لە نوسینەکانیان دا ئارەزووی دەمارگیری بەسەریان دا زاڵ بوو.

ئیسلام چەمك و واتاکانی باڵایانە لەو بوارەدا پێشکەش کرد کە گرنگترینیان ئەخلاقیەتی هەڵسوکەوت و ناساندنی چاکەی کەسی پێشتر بوو، هەروەك ڕایگەیاند زانست لە ئیسلامدا هەموو زانستە ئایینی و دنیاییەکاانیش دەگرێتەوە، ئەمەش ڕووە و بنیادی کەون و دامەزراندنی کۆمەڵگە چاکەکانە. لەمەش دا لەگەڵ چەمکی ماددی ڕۆژئاوادا جیاوازە کە تەنها چاوی لای لایەنە ماددیەکانە و پابەندی ئەخلاقی و دیدی خوا ویستی بەرامبەر کۆمەڵگەو ژیاریش لەبیر دەکات.

دووەم: ڕۆژئاوا لەپێش ئیسلام دا وا وێنای نەخۆشییان دەکرد کە شەیتانە و دەچێتە جەستەوە، پێغەمبەر (ﷺ) یەکەم کەس بوو هاواری چارەسەرکردنی کرد (تداوو فأن الله لم نزل داء إلا انزل له الدواء علمه من علمه و جهله من جهله). ئەگەر ڕێنماییەکانی ئیسلام نەبوونایە ئەورووپا بەردەوام بە بۆنە ئایینیەکان چارەسەری نەخۆشی دەکرد. لەسایەی ئیسلام دا پزیشکی موسڵمان لە بەش و ماوەکانی خیلافەتی ئیسلامی دا هەڵکەوتن و پاشاو سەرکردەکانی ڕۆژئاواش بۆ چارەسەری خۆیان بانگهێشتیان دەکردن و دەستەیان دەنارد بۆ زانکۆکانی قورتوبە و قاهیرە و بەغداد تا لەوێ فێری هونەری پزیشکی بن. ئیسلام شێوەیەکی نوێی هێنا کە پزیشکی بیروباوەڕی بوو. واتاکەشی پەیوەستی ڕێنماییە دروستەکانە بە بیروباوەڕو پەرستشی

مرۆڤەوە، بەمەش ئەو ڕێنماییانە نموونەی پیرۆز ڕاگیری و گوێڕایەڵی ناو دەروونی خەڵکیان دەبێ. ئیدی نوێژ بێ دەست نوێژ و پەرستش بێ پاك و خاوێنی نابێ.

برناردشۆ سەرسامە بەو ڕێنماییە پزیشکیانەی کە پێغەمبەر (ﷺ) سەپاندنی بەسەر کۆنگرەی مەدینەدا و ئیسلامیش کۆمەڵگەکانی لە هەموو شێوەیەکی توندو تیژی و ڕاڕایی جەرگەی گەندەڵی ڕزگار کرد وەك شێوەکانی قومار و بێئابڕوویی و مەی نۆشی، بەڵکو ژیانێکی پاکۆ بۆ موسڵمانان ئامادە کردووە.

ڕێنماییەکانی ئیسلام موسڵمان هان دەدەن بۆ خۆڕاگری و ئیمان و تووڕە نەبوون لەکاتی نەبوونیدا یان خۆنەکوشتن لە کاتی موسیبەت دا. بۆیە ڕووداوی خۆکوشتن لە کۆمەڵگە ئیسلامیەکان دا لەچاو کۆمەڵگە ئەوروپییەکان دا زۆر کەمە.

هەروەك ئیسلام چەند بیردۆزەیەکی لە پەروەردەی جنسی دا خستنەڕوو لە پێش خوێندنگەی هاوچەرخ دا. بۆیە نهێنیەکانی جنس و پێکهاتەی کۆرپەلە و گەشەسەندنی لە سکی دایکی دا فێری موسڵمان کردووە. پاشان ڕاشکاوانە شێوەی ڕاستەوخۆی جنسی دروستی و ڕێی چارەسەری لە نەخۆشی جنش لەڕێی پاك و خاوێنیەوە بۆ موسڵمان ڕوونکردووەتەوە.

هەروەها ئیسلام پزیشکی بۆ هەموو خەڵك دانا نەك بۆ یەك چین وەك ئەوەی لای ئیغریقەکان باو بوو. (ئەمە وەرگیراوە لە کتێبی **الطب الوقائي** ئەحمەد شەوقی فەنجەری).

موسڵمانان یەکەم کەس بوون خولی خوێنیان بە وردی وەسف کرد کەچی سێ سەدە دوای ئەوە لە چەند دەقێکی وەرگێڕاوی کتێبی (ابن النفیس)ەوە ڕۆژئاواییەکان وەریانگرت و درایەوە پاڵ پزیشکە ڕۆژئاواییەکان. دکتۆر یوسف سفت دەڵێت: ئیبن نەفیس یەکەم پێشەوای هارفی پزیشکی ئینگلیزی بوو. ئیبن نەفیس یەکەم کەس بوو دەورەی بچوکی خوێنی بە چەمك و واتایەکی ئەزموونی ئاشکرا کرد و بیردۆزەکەی

گالینۆسی تێکشکاند. هەروەها چەمکی پزیشکی ئیسلامی بیردۆزەی چارەسەرنەکردنی ئەو نەخۆشیانەی تێکشکاند کە گوایە هیچ هیوایەکی چارەسەریان نیە. بیردۆزەی پزیشکی تایبەتیشی لەنابرد و پزیشکی دانا بۆ هەمووان.

بەخششی موسڵمانان لە مەیدانی پزیشکی دا نەوەستا و چووە مەیدانەکانی تریش، بەڵام ئایا هەڵوێستی ڕۆژئاوا چۆن بووە (هەڵوێستی ڕۆژئاوا نکوڵی تەواو بوو لە بەخششی ئیسلامی، ئەمەش زۆر درێژەی کێشا تا هەندێ کەس هاتن کە بەرامبەر موسڵمانان ویژدانیان نواند).

سبنسەر فامبری دەڵێت: یەك زانا ناتوانێ لە گومەزی زەرد ڕامێنێ بێ ئەوەی ناوێکی عەرەبی بێنێ، زانایەکی سروشتی ناتوانێ شیکاری گەڵایەك بکات یان بەردێ بپشکنێ بێ ئەوەی وانەیەکی عەرەبی بیرنەیەتەوە. هیچ دادوەرێ ناتوانێ ڕۆژێ بەسەر ببات بێ ئەوەی بنەمایەك وەربگرێ کو عەرەب دایناوە. هیچ پزیشکێ ناتوانێ لەگەڵ بازنەی نەخۆشیەکی ناسراوی کۆنەوە هەڵسوکەوت بکات بێ ئەوەی ڕووی لە ڕای پزیشکێکی عەرەب بێ. هیچ گەشتیارێ ناتوانێ ڕووەو کەنارو کونجەکانی ئاسیاو ئەفریقا بچێ بێ ئەوەی پشت ببەستێ بە زمانی عەرەبی، چونکە تەواو بڵاوبووەتەوە بەجۆرێ هەندێ بێ زێدەڕەوی جەخت لەوە دەکەنەوە پێنج یەکی خەڵکی سەر زەوی بە عەرەبی دەدوێن. ئەگەر ئەوەمان بیرکەوتەوە کە موسڵمانان لە ماوەی هەشت سەدەدا لە ئەندەلوس دانەری گەورەترین زانستەکان بوو. ئەوا بەداخەوە دەبین کە بڕوامان وابێ ماددەیەکی دیاری نەکراوی هونەری مێژوو و زانستەکان و کۆمەڵایەتی و مافەکان لەو خاکەوە پێمان گەیشتبێت).

زانای دیار دیڤۆنیت لە کتێبەکەی دا (پۆزش بۆ موحەممەد و ئیسلام) دەڵێت: (دەبێ ئەوە بزانین زانستە سروشتیەکان و گەردوون و زانستی بیرکاری و زانستەکانی تریش کە لە سەدەی دەیەمەوە ئەورووپایان بوژاندەوە لە قورئانەوە وەرگیران. بەڵکو

ئەورووپا زۆر زیاتر لەوە قەرزاری ئیسلامە. چونکە ئەو ئایینە یەکە دەستورەی فەرمانی کردووە بە دیموکراتیەت و ڕێگری کردووە لە خۆسەپێنی بە فەرمایشتی ﴿وَشَاوِرْهُمْ فِي الأَمْرِ﴾ ﴿وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُمْ﴾ بەمە دەرگای مافە نوێکانی لەبەردەم مرۆڤدا کردوەتەوە. بەگشتی موسڵمانان ئەورووپایان لەو سەردەمی تاریکیە ڕزگار کرد کە لەوپەڕی تاریکی دا بوو. ئەوان ڕۆژئاواییان لە تاریکیەوە بەرەو ڕووناکی بردو شوێنەواری پزیشك و ئەندازیارییان بۆ پاراستن. بەڕاستی موسڵمانان بە مامۆستای ئەورووپا دادەنرێن) ئەمە دانپێدانانی جەمسەر و گەورەکانی بیری ڕۆژئاوان. ڕۆژئاوا زانستە ئەزموونیە ئیسلامیەکانیان وەرگرتن و لە ئەخلاقیاتە بنەڕەتیەکانی زانست دایانماڵین و سەرچاوەی بنەڕەتی خواییان بۆ ژیار لەبیر کرد. بەوە لە تەنگەڵانەوە بەرەو تەنگەڵان چوون، لە کەنارگیری و دوورگیری لە ژیانەوە کە بەستبوونی بەرەو بێئابڕووییەك کە لە ناوی بردن.

پرۆفیسۆر سیمۆن جارجی دەڵێت: ڕۆژئاوا پایە ڕۆحیە ڕۆشنبیریە ئایینیەکانی لەدەست دان و ئیتر شتێ نیە پاڵی پێوە بدات. ئایینی نەسرانیەت پایەکانی خۆی لەدەستدان و چوون بەرەو ڕۆحیانەت کۆتایی هات و لە دەروونەکان دا کوژایەوە. ئیدی لە ڕۆژئاوادا جۆرێ لە بۆشایی و جۆرێ لە لەدەستدانی گشتگیر دەرکەوت کە نەوە گەنجەکان پێی داخ دەبن. من بڕوام وایە ژیاری ڕۆژئاواییمان ئێستا لە سەرەمەرگدایە. ئێمە ژیارێ دەبینین کە لە ڕکەبەریدایە و خەریکە دەمرێ، دەبێ ژیارێکی نوێی لێ پێکبێنێ. ئێمە لە چاڵێکی تاریك دا دەژین و تا ئێستاش چاوەڕێی ئەو ڕووناکیەین کە ڕێمان نیشان دەدات.

جاك برل دەڵێت: جگە لە ئیسلام ئایینێ نیە بۆ هەموو بوون بۆ بیروباوەڕێ بگونجێ کە گیانی مرۆڤ و مرۆڤبوونی لەو تاریکیە مادیە دەربکات کە تیایدا داکەوتووە.

لێرەدا جۆرە یەك دەنگیەك لەسەر داکەوتنی ژیاری ڕۆژئاوایی هەیە، دکتۆر ماکس فریش دەڵێت: ئێمە لە بۆشاییەکی ئایدۆلۆجیدان بەو واتایەی چەمك و ئایدۆلۆجیاکانی بەردەستمان مارکسیەت لەلایەك و لیبرالیەتی سەرمایەداری لەلایەکی ترەوە بوونەتە پێناوی پەیڕەو نەکراوو ناواقعی. ئەو بۆشاییە ئایدۆلۆجیاییە زۆر مەترسیدارە. دەقێکی ئایدۆلۆجی بە واتای بیروباوەڕی و هێزی ئەو بۆشاییە بەهایە واتە کەموکورتی بەها- بەدوای ئەمەدا بەشێکی گەورەی زمانی سیاسەت و چەمك و واتاکانی تەنها چەند دەربڕینێکی ڕەواجپێدەرن بێ مەزموونێکی حەقیقی.

ئێمە دەزانین جیهان پەیوەست و دیدەکانی لایەنە بیری و عەقڵیەکانی لەدەست داون، کاتێ باسی مەسەلە شەخسیە خۆییەکان دەکەین تەنها لەسەر ئاستی تاك نیە بەڵکو لەسەر ئاستی نەتەوەیی و نیشتمانیە. چونکە ئەو پرسە تەنها ڕووەو جیهانی ڕۆژئاوانیەو جیهانی سێیەمیش دەگرێتەوە. ژیاری ئەمریکی داڕمانێکی ژیاری دەنوێنێ بە بەراورد لەگەڵ بنەڕەت ئەورووپیەکان دا، ئێمە تەکنەلۆجیامان هاتە ڕێ و لە ژیانمان دا ڕەگی داکوتا و پێشکەوتنێکمان هاتەڕێ کە لە بنەڕەت دا داوامان نەکرد بوو. لەگەڵ ئەمەش دا دەبێ لەگەڵ ئەو شتە نوێیانەی دا هەڵسوکەوت بکەین کە پێشکەشی ئێمەی دەکات.

جیهانی سێیەم ئاڵودەی بەرهەمی جیهانی یەکەمە و کۆمەڵێ سلبیات و ڕەگەزی وێرانکەری لەخۆگرتووە. تەکنەلۆجیای جیهانی یەکەم لە وێنە سەرکەشە سلبیەکەی دا جیهانی سێیەم تێدەپەڕێنێ، ئێمە ژیارێکی نوێ یان ژیارێکی تەواو پێشکەش بە جیهانی سێیەم ناکەین وەك چۆن لە مێژووی ژیاری کۆن دا ڕووی دا. ڕەگەزێکی نا ژیاری هات کە بەسەر هەموو لایەنەکانی ژیان دا سەرکەوت.

زانایانی ڕۆژئاوا باسی ژیاری یەك دید دەکەن: مارکلیزی فەیلەسوفی ناسراوی ئەڵمانیا وا وەسفی دەکات کە ژیاری یەك دیدە، ئەویش تێربوونی بەکارهێنانە، لە سایەی ژیاری یەك دیدی بەکاربەری دا پیاو هەواڵی مەرگی باوك یان دایك دەبیستێ لەبری ئەوەی ئازارێکی ڕۆحی بەرکەوێ تا مردن و حیساب و کورتی ژیانی دنیای

بیربخاتـەوە، کەچـی دڵخـۆش دەبـێ و ئـارەزووە ماددیەکـەی دەکرێتـەوەو دەڵێـت زۆر باشەە سامان و ماڵی چاك بە میرات دەگرین.

کارەساتی بەتەمەنەکان لە کۆمەڵگە پێشکەوتووەکان دا کە بێـزراون ئەوەیـە دەبـێ بڕۆن، ئەمەش دەردێکـی ڕۆژئاواییەکـە سـەرەتاکانی لـە شـارە گـەورەکانی ئێمـەش دا خەریکە دەردەکەون.

ژیاری ڕۆژئاوایی بە هەردوو بەشی لیبرالی و مارکسیەوە دەناڵێنێ بەدەست تەنگژەی کۆمەڵگەی ئیسلامی و لەرزەی بەها و تەنگژە کاراکـانی گەیشتن بـە خۆکوشـتن لەبـەر چەند هۆیەکی پووچ یان نا ئامادەیی بەردەوامی هۆشیاری لـەڕێی بـەکارهێنانی مـاددە هۆشبەرەکان یان قۆرخکاری بەخششی مرۆیی ئاڵوگۆڕ پێکراوی وشکی هەستەکانەوە.

ئەمە سەرەڕای ڕقی کوڕ بۆ باوك و نامۆیی نێوان نەوەکان، کێشەی کێشەکانی مرۆڤ ئەوەیـە کێـشەیەکی لانـەبێ. مرۆڤـی ڕۆژئـاوا دوای چارەسـەری کێـشەکانی لـە بـارێکی نەبوونی ئایینی دایە کە کارێکی بێ سنوری پێ دەکات. ژیـاری مـاددی ڕۆژئـاوا لەسـەر داروپەردووی ئایین دامەزراوە و جەخت دەکاتەوە سەر ژیـاری تەکنـەلۆجیا یـان ژیـاری ئامێر. ئەمە ژیارێکی بێ دڵ و هەست و ویژدانـە و ژیـاری مرۆڤایەتیـە بـێ ئامـادەبوونی خودی مرۆڤ.

سۆرکن ئاماژە دەکات بە دارمانی ژیاری ڕۆژئاوایی و دەڵێت: ژیـانی کۆمەڵایـەتی لـە ژیاری هەستی دا تەواو پێچ و ئاڵۆزە. خەبات تیایدا لە پێناو کامـەرانی دا تونـدە. ئـەوا ئەو کـات هـەوڵی ئـەودیو چێژەکان هاوسـەنگی عـەقڵی و ئـەخلاقی وا دادەڕمێنـێ کـە دەزگای عەصەبی زۆربەی خەڵک بەرگەی فشاری ترسـناکی بـەرەو ڕووکـراوی نـاگرێ و هەڵدەوەشێ، مرۆڤ لەو ژیارەدا نمونەی باڵای نیە و ژیانی پڕ لە ململانێی شـێواوە بۆیـە دەبێتــە داوی خــەیاڵ و پاڵنــەرەکان و هاوســەنگی خــۆی لەدەســت دەدات و بــەرەو هەڵمەتی توندی وێرانکەری خۆپاسارتن دەکەوێ.

ئەوەی چەسپاوە ئەوەیە بارگرژی عەقڵی هاودەمی خۆکوشتنە چـونکە یـەك هۆکـار هەیە، ئەویش بارگرژیە کۆمەڵایەتیەکانن، مرۆڤ کاتێ لە کۆمەڵگـە کـەنار دەگـرێ ڕووەو خۆکوشتن دەچێ، ڕووداوەکانی خۆکوشتن لە کۆمەڵگـەی ئێـستادا زیادییـان کـردووە و

ئەوەش بەو تەنگژەدا تێدەپەڕێ کە پەیوەندیەکانی خێزان هەڵدەوەشێننەوە و زیاتر خەڵك کەنارگیر دەکەن و ناسەقامگیر و نائارامن و لەنێو کۆمەڵگە و دامەزراوەکان دا هەڵدەگەڕێن، ئەمە سەرەڕای زیاد بوونی ویستەکانی مرۆڤ کە تەنها بە پێکدادان لەگەڵ بەرامبەردا دێنەدی. ئەمە وا دەکات تاك لە کەشێکی پڕ لە ڕق و دوژمنایەتی دا بژیت.

سۆرگۆن دەڵێت: ژیاری هزری گرنگی نادات بە خۆشگوزەرانی ماددی و نایگۆڕێ، بەڵام ژیاری هەستی لەسەر ڕەچاوێکی ماددی وەستاوە و هەموو هێزی خۆی بەکاردەهێنێ بۆ بەدەست هێنانی زیاترین ماددەو پشت دەبەستێ بە زانست و هونەرەکان لەپێناو زیادکردنی بەرهەم و بازرگانی دا، بە داگیرکردنی گەلە لاوازەکان و بردنی سامانیان دەتوانن خۆشگوزەرانیەکی بەرفراوانتری ماددی بۆ خەڵکەکەیان دابین بکەن. بەڵام چەند هۆکارێکی تر هەن گومانیان لە دڵنیایی بێهیوا دەکات: لەوانە لێکهەڵوەشان و جەنگ و شۆڕش و توندی و ڕەقی و لێکهەڵوەشانی ڕەوشتی کە دڵنیایی ناهێڵن. لێرەوە ژیاری ئێمە بە مەترسیدارترین ماوەی ئینتیقالی مێژوویی مرۆڤایەتی دا تێدەپەڕێ، بەدوای ئەم ڕۆڵ و ماوەش دا چەند شۆڕش و پشێویەکی بێوێنە دێن، دیارترین دیاردەش زۆری تەنگژە و بارگرژی ئابوری و ڕووداوی کارەسات و تاوان و بڵاوبوونەوەی نەخۆشیە عەقڵیەکانن.

ئارنۆلد توینبی باس لە مەترسیدارترین دیاردەکانی شارستانیەت دەکات:

## *بتپەرستی دەوڵەتی هەرێمایەتی لە ڕۆژئاوا:

فوئاد موحەممەد شبل دەڵێت: لێکۆڵینەوەکانی توینبی سەبارەت بە داڕمان و لێکهەڵوەشانی ژیارەکان ئەوەیان لێکەوتەوە هۆکاری هەموو باری جۆرێ لە سەرکوتی چارەی خۆنوسین ڕەچاو هەڵکردنە لەگەڵ زێدەڕۆیی کۆمەڵگە لە مافی دا لە ئاڕاستە کردنی ویستی خۆی بۆ خۆی دامەزراندووە. توینبی ئەو ڕایە دەسەپێنێ بەسەر ڕای گشتە کۆمەڵگەی ڕۆژئاوایی دا و دەبینی پاڵی داوەتەوە بەڕێی پەرستشی چەند بتێکەوە.

بەڵام لەنێو ئەو بتانەدا بتێ هەیە کە لە نێوان دوو جەنگی جیهانی یەکەم و دووەمدا پەرستشی بەسەر بتەکانی تردا زاڵ بووە، ئەویش بتپەرستی دەوڵەتی هەرێمایەتیە. توینبی دیاردەی بە پیرۆزدانانی دەوڵەتی هەرێمایەتی تا پەرستنی بە هەرەشە کارێکی ترسناکی ڕۆژئاوا دێنێ، لە دوو ڕوانگەوە: یەکەمیان ئەوەیە ئەو پەیوەستیە بتپەرستیەی دەوڵەتی هەرێمایەتی بیروباوەڕی ئاینی حەقیقی زۆرینەی دانیشتوانی جیهانە کە مرۆکی ڕۆژئاوایی بەسەر دا دراوە. دووەمیشیان ئەوەیە ئەو عەقڵیەتە پووچە هۆکاری لەناوچوونی زیاد لە چواردە ژیارە. دەکرێ ژمارەشیان شانزە ژیار بن لەنێو بیست و یەك ژیاردا. لە جەنگی وادا کە برا برای دەکوشت و توند و تیژی بەرکاردەهات لە ئەنجامی پەیوەستی بە دەوڵەتی هەرێمایەتیەوە. ئەمەش گەورەترین هۆکاری بڵاوی لەناوبردن بوو.

توینبی پێی وایە تەنگژەی کۆمەڵگەی ڕۆژئاوایی ڕۆحانیە نەك ماددی، چونکە هەرچەند ئەو کۆمەڵگەیە لە پێشکەوتنی ماددی دا گەیشتبێتە لووتکە ئەوا هەست بە برسێتیەکی ڕۆحی دەکات. ئەگەر دەروونە ڕۆژئاواییەکان ڕاڕایی بۆشایی ڕۆحیان هەبێ ئەوە دەرگا دەکاتەوە بۆ چەند شەیتانێکی وەك نەتەوایەتی و فاشیزم و شیوعیەت، دەی تاکەی بێ باوەڕێکی ئاینی بەرگەی ژیان دەگرێ.

مرۆیی ڕۆژئاوایی کارەساتی بەسەر خۆی دا هێناوە بەهۆی خستنەگەڕی هەموو هەوڵەکانی تەنها بۆ زیادکردنی بەختەوەری ماددی. ئەگەر ویستی بۆ دەربازبوون بگەڕێ تاکە ڕێگەی دابەشکردنی ئەنجامەکانی هەوڵە ماددیەکانیەتی لەگەڵ زۆرینەی ڕەگەزی مرۆیی دا، ئەوانەی کە لە بواری ماددی دا سەرکەوتوو نەبوون.

ئەگەر ئەوەشی بۆ زیاد بکەین لە ڕۆژئاوادا و مافی مرۆڤ نیە و هیچ زامنێ بۆ مافی مرۆڤ نیە جگە لە شەریعەتی ئیسلامی کە لەسەر بنەمای دادپەروەری و ئازادی و

یەکسانی وەستاوە. یاری دیموکراتیەتیش پیلانێکی لەخشتەبەرە، چەند دیاردەیەکی تریش هەن دەبێ لەم بوارەدا باسیان بکەین:

١- ترس و بیمێ کە بووە بە بەشی کۆمەڵگە ئەوروپییەکان دەگەڕێتەوە بۆ لێکهەڵوەشان و گرتنەبەری بیردۆزەی خۆڕزگارکردنی جنسی، واتە لێکهەڵوەشان لە کۆتە ڕێکخەرەکانی پەیوەندیە جنسیەکانی تاك، ئیدی شەهوەت یان چێژی کراوەی جنس لای هەندێ بڕیار وەك چارەسەری هەموو کێشەکانی مرۆڤ وایەو ڕزگارکردنی ئافرەتیش لە کۆتی ڕێکخستنی شەهوەتی جنسی هۆکاری چەندین کێشەی کۆمەلایەتی بووە، ئەو بیردۆزە سەرشێوێنەرانە بوونە هۆی ڕزینی کۆمەڵگەکان.

٢- دیاردەی خۆکوشتنی عەلمانیەکان: بێگومان چەند هۆکارێکی قوڵی پەیوەندی نێوان بەرزبوونەوەی ڕێژەی خۆکوشتن و دووری لە حوکمی ئایین هەن (وەك دکتۆر حەسەن شەرقاوی دەڵێت). کاری خۆکوشتنی هەندێ کەسی دیاری ناو بیریارانێ کە تایبەتمەند بوون بە خۆڕزگارکردنی عەقڵی و نکوڵی ئایینە ئیسلامیەکان بەڵگەیەکی ڕوونی مایە پووچی ژیاری ڕۆژئاوایە. زۆرێك لەسەر بیرۆکەی خۆکوشتن نوسینیان هەیە وەك ئەندریە مالرۆ لە کتێبەکەی دا (باری مرۆیی) بیرکامی نوسەریشی دەڵێت: دەکرێ خۆکوشتن شتێکی گەورەتر بێ لە تەنها بێهیوا بوون و تەحەدی.

بێگومان هۆکاری بێهیوایی دەگەڕێتەوە بۆ بێئومێدی ناو مەزهەبە ماددی و عەلمانیەکان و سنورداری عەقڵیان. ئارسەر کسلەر مارکسیەتی وەرگرت و کردی بە سەرچاوەی ڕۆمانەکانی، دواتر ساختە و دەستەوسانی و کەمی لێکهەڵوەشان و لاوازیو پووچی بانگەشەو نەزۆکی بانگەوازەکەی بۆ دەرکەوتو بێهیوا بوو تا گەیشتە بێهیواییەکی کوشندەی وا کە بەرەو خۆکوشتنی دەبات وەك ئەوەی بە پێچەوانەی گارودیەوە کردی، گارودی ئاشکرای کرد مارکسیەت ڕێگەیەکی داخراوەو تەنها لە ئیسلام دا هیوا هەیە بۆیە موسڵمان بوو.

هەروەها جاکوب مۆرنۆ (لە گەورە بیریارانی بیری عەقڵی لە ئەمریکا و ڕێبەری خوێندنگەی دەروونی کۆمەڵایەتی) گەیشتە تەنگژەیەك و خۆی خستە ناو داوی عەلمانیەت و نەیتوانی دەرچێ، زۆر دڕندانە خۆی کوشت و بڕیاری دا تا دەمرێ هیچ نەخوات و نەخواتەوە.

ڕۆژنامەکان ساتەوسات هەواڵی مایەپووچی و خۆکوشتنی ڕێبەرێکی مارکسی یان بوونگەرایان فەلسەفە ملهوڕیەکانمان پێدەدەن. ئالتۆسیر کە لەبە تواناترین فەیلەسوفە ماددیگەراکانی فەرەنسا بوو تاوانێکی دڕندانەی ئەنجام دا کە کوشتنی ژنەکەی بوو کاتێ لەسەر جێگەدا لەپاڵی دا بوو. بۆیە برا بۆ نەخۆشخانەی نەخۆشیە عەقڵیەکان. هایدی گاردنی ڕاگری فەیلەسوفانی سەردەم لە ئەوروپا مایەپوچی عەقڵی و بۆشایی فیکری و ئەو تەنگژەی ڕاگەیاند کە عەلمانیەکان پێی گەیشتوون و دەڵێت: ئێمە لە شەوی ئەوروپادا دەژین، سارتەر لە سەرەمەرگی دا ڕایگەیاند فەلسەفەکەی تووشی شکستێکی زۆر سەختی کردووە، ئەمە واتە چارەسەری ڕیشەیی مەسەلە هاوچەرخەکانی مرۆڤ لە بیردۆزە ماددی یان تەجریدی یان عەقڵانی یان میسالیەکان دا بەدیناکەین، چونکە هەموو ئەوانە گەیشتوونەتە ڕێی داخراوو مایەپووچی عەقڵی یان تەنگژەی دەروونییان تووش بووە، مرۆڤیش تەنها لە ئاین دا ئاسایش و نا ئارامی بەدیدەکات.

دکتۆر مەجد عەلی بار دەڵێت: شتێکی گاڵتەجاڕیە لەپێناو چاندنی دڵێك دا کە هیچ گرنگیەکی نیە زیاد لە دەیان ملیۆن منداڵ ساڵانە بەهۆی بەدخۆراکی و نەخۆشی سکچوونەوە بمرن، ئەمە ژیارێکی ڕووتەنی زۆرەوە و تەواو سەرسامی خۆیە تا ئەوەی کڵێساکەی بانگەشەی خوایەتی دەکات.

هەموو ساڵێ لە جیهانی ئیسلامی دا دە ملیۆن منداڵ بەهۆی برسێتی و کەمی خۆراك و سکچوونەوە دەمرن. دەکرێ بە دابین کردنی خۆراك بۆیان ڕزگار بکرێن، بەڵام

ژیاری شلۆقی ڕۆژئاوا ئەوە ناکات و ملیۆنەها دۆلار خەرج دەکات بۆ چالاکی چاندنی دڵ. بەو پێیە چەند دڵێکی بێسوود دەگۆڕێ بە دڵی مەیمون و سەگ و بەراز.

دکتۆر برنارد دەڵێت: من هەست بە ویژدان برینداری دەکەم کاتێ ئەفسەری چالاکی چاندنی دڵ بووم، وانازانم بەو کارەم مرۆڤم بەختەوەر کردبێ چونکە ئەو دڵانەی گۆڕیومن زۆر ناژین بەڵام ژیانی خاوەن دڵەکانم کردووە بە زنجیرەیەك سەختی و سەلاری و ناڕەحەتی.

لەو قۆناغەی پێشووی سەرەتاکانی سەدەی پانزەی کۆچی دا ئەو هاوارانە هۆشیارکەرەوە بوون بۆ ئەو ڕابوونە ئیسلامیەی کە موسڵمان بوونی گەورە بیریاران هێماکەی بوو، چەند نوسینێکی بەرفراوان و مەترسیدار دوور لەچاو بوون، بەڵام ئەمە دەرگای لەبەردەم لێکۆڵەرانی بە ویژدان دا کردەوە:

کتێبی (الله أكبر) عەبدولکەریم جەرمانۆس. کتێبی (أفول الغرب)ی ستنگلەر.

کتێبی (ئیسلام لە دووریان دا)ی لیوبۆلد فابس (موحەممەد ئەسەد).

کتێبی (مرۆڤ ئەو نەزانراوەیە)ی ئەلیکس کاریل.

کتێبی (موحەممەد پێغەمبەری خوا) ئیتان دینتیە.

سەرەڕای نوسینەکانی جەمالەدینی ئەفغانی و موحەممەد عەبدە و عەبدولحەمید بن بادیس و ئیقبال و مالیك بن نەبی و حەسەن بەننا و مەودوودی و نەدەوی کە هەموویان هەستی ڕۆڵی نوێیان بێدار کردەوە و تیایدا گارودی و بۆکای و ئەلیسۆن دەرکەوتن.

دەبینین موحەممەد ئەسەد دەڵێت: لەگەڵ چەمکی هێمنی مرۆیی بۆ ژیان زیاتر سۆزداریم هەبوو تا ڕەوتی ژیانی خودایی باوی ناو ئەورووپا، ئەمەش بەرەبەرە وایکرد بەدوای هۆکارەکانی ناکۆکی دا بگەڕێم، ئەمەش تەنها بە لێکۆڵینەوە لە ڕێنماییەکانی ئیسلام تەواو دەبوو. بەهۆی چاك تەواوکردنی ئەو لێکۆڵینەوەمەوە وام لێهات ئیسلام وەربگرم. بەڵام توانی لە ئاسۆیەکی نوێی کۆمەڵگەیەك دا چاوم بکاتەوە کە نەگونجانی

تیا نیە و لەوپەڕی برایەتی حەقدان ئیدی جیاوازی تەواوی نێوان ئیسلام و ئیمکانیاتە میسالیەکانی ناو ڕێنمایی ئایینەکەیانم بەدیکرد، ئەم دۆزینەوەو سەرسامیە بەرامبەر ئەوەی بووە و ئەوەی ئێستا هەیە وایکرد هەوڵبدەم لە دیدێکەوە لە حەقیقەت نزیک ببمەوە کە سۆز و خۆشەویستی تیایە، ئیدی خۆمم لە بازنەی ئیسلام دا دۆزیەوە، ئەو ئەزموونێکی پوختی ئەندێشەیی بوو کە وایکرد لە ماوەیەکی کورت دا قەناعەت بکەم تەنها هۆکاری دارمانی کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری موسڵمانان دەگەڕێتەوە بۆ وەستانی هەنگاو بە هەنگاویان لە شوێنکەوتنی گیانی ڕێنماییە ئیسلامیەکان، بینیم ئیسلام هێشتا ماوەو هەیە بەڵام تەنها گیانە.

بە هێندەی هەست کردن بە ڕەقی و چەندێتی چالاکی ئەو ڕێنماییانە بە هێندەی کاریگەرییان لە دەروونم دا پرسیار دروست بوو سەبارەت بەوەی بۆچی موسڵمانان لە ژیانی کردەییان دا پەیڕەوی ناکەن. بە وردی بە میوانداری چەندین بیرباری ئیسلام لەسەر ئەو مەسەلە دوام تا ئەوەی وا خۆم ڕاهێنا قسەی بۆ موسڵمانان بکەم وەك پارێزەرێکی ئیسلام لە پای پاڵدانەوەو دەست لێبەردانی ئەوان، هەستم نەدەکرد بەو گەشەسەندنەی کە بەسەر بارم دا هاتبوو تا لە پاییزی ساڵی ١٩٢٥ز. دا ئەوکات لە شاخەکانی ئەفغانستان بووم حاکمی هەرێمی (شاب) پێی وتم: تۆ لە ڕاستی دا موسڵمان نیت بەڵام بەڵام هەست بەوە ناکەیت. ئەم وشانە شۆکێ بوون بێدەنگیان کردم، بەڵام کاتێ لە ساڵی ١٩٢٦ز. دا گەڕامەوە بۆ ئەوروپا ئەنجامی سروشتی هەڵوێستی خۆمم بینی کە موسڵمان بوون بوو، زۆر پرسیارم کرد بۆچی موسڵمان بووم، دەبێ دان بەوەدا بنێم وەڵامم پێ نیە، چونکە من کاریگەر نەبووم بە تەنها

لایەنێکی ئیسلام، بەڵکو کاریگەر بووم بە هەموو بنیادی سەرسوڕهێنەری ئیسلام لە پەیوەستی دا. تا ئەم ساتەش ناتوانم لایەکی ئیسلام بەسەر لایەکی تری ئیسلام دا بدەم، وەك ئەوەی من دەیبینم ئیسلام کارێکی نموونەیی ئەندازیاری تەواوە کە هەموو بەشەکانی تەواو یەکانگیرن تا ئەو ئاستەی پاڵپشتی یەکدی دەبن لایەنە چاکەکان نیشان دەدەن. لەوانەیە ئەو هەستە بێ کە هەموو ڕێنماییەکانی ئیسلام لە شوێنی دروستی خۆیان دا باڵاتر لە باس و وەسف دانراون. لەوانەیە هەستە بێ زاڵ بوویێ بەسەر هەستم دا.

# باسی دووەم

## (گارۆودی سەرچاوەیەکی نوێی تێگەیشتن لە ئیسلام)

لەسەر شانی هەموو ئەوانەوە کە هێرشیان بردەسەر ژیاری ڕۆژئاوایی و بیری ڕۆژئاوایی گارۆودی هات کە گەورە بە چاوێکی مارکسی پلەبەرز بوو تا سەرلەنوێ چەمکەکان وەرگرێ و دایانڕێژێتەوە بەو دیدە ڕاستە دڵنیایەی کە ئیسلام ڕزگارکەری مرۆڤایەتیە لە سەردەمی نوێ دا. گارۆودی دوو شت کۆدەکاتەوە، ئەو شایەتی دارمانی ژیاری ڕۆژئاواو بەڵگەی تاکە داهاتووی مرۆڤایەتیە لە سایەی ئیسلام دا، لە چەمك و واتای کەسێکەوە کە پێی وابوو لەوانەیە مارکسیەت شتێ ببەخشێ بە جیهان، بەڵام لێی بێهیوا بوو تا بینی ئەوەی کۆمەڵگەی ئەمڕۆی ڕۆژئاوا و مرۆڤایەتیش پێویستی پێ هەیە لە ئیسلام دا هەیە. دیارترین بڕیاریشی لەو بارەوە بریتی بوو لە:

<u>یەکەم:</u> توانانی ئیسلام بۆ پەیوەستکردنی پێناو و ئامانجەکان، ئەمەش ئەو ئەرکە گرنگەیە کە ژیاری ڕۆژئاوایی نەیتوانی بیکات و سەرچاوەیەکی ئەو ڕووشانە سەختە بوو کە تووشی بوو و بەرەو لەناوچوونی برد.

<u>دووەم:</u> سوور بوون لەسەر دیدی خوایی بۆ کۆمەڵگە و ژیارەکان و دانان بە دەسەڵاتی باڵا دا کە ئەویش ئەو دیدەیە ژیاری ڕۆژئاوایی بەتەواوی لەبیری کردووە و بووەتە هۆی دەستەوسانی و پەرت بوونی، گارۆودی لە بنەڕەت دا پێی وایە نکوڵی لە خوا گەورەترین هەڕەشەی سەر ژیار و بیری ڕۆژئاوایە.

<u>سێیەم:</u> بیرۆکەی کۆمەڵ بوون و کاری چاك لە بەرژەوەندی کۆمەڵگە.

<u>چوارەم:</u> ملە جیڕێی ڕۆژئاوا بۆ بیرو فەرهەنگی ئیسلامی و لەبیرکردنی ئەو ڕۆڵە گرنگەی کە موسڵمانان لە بوارە زانستە ئەزموونی و بوارەکانی تردا بینییان.

<u>پێنجەم</u>: وەك گەڕانەوە بۆ سروشی قورئانی لەڕێی ڕاستی ئیسلام دا چارەسەر بۆ ئەو کێشانە هەیە کە ڕۆژانە لە ژیان دا هەن بێ ئەوەی تێکەڵیان بکەین بە نەریتی نموونەیی ئەمریکی یان سۆڤێتی یان ئاڕاستەی ڕووەو هاوچەرخی لەگەڵ ئاڕاستەی ڕووەو ڕۆژئاوا چوون تێکەڵ بکەین.

<u>شەشەم</u>: چەمکی دەوڵەت و ماف لە ئیسلام دا پێچەوانەی چەمکی دەوڵەت و مافە لای ڕۆمان و پێناسەی مالکیەت لە ئیسلام دا سەبارەت بە مافەکان جیایە و جیاوازیەکی زۆر هەیە لەگەڵ ماف و شەریعەتە ڕۆمانی و خواییەکان دا هەروەك چەمكو واتایشیان لە یەك جیان، جا تەنها خوا مالیکەو سەرپەرشتی کار و ئەزموونی ئەم بوونەی لەدەستە، بەکارهێنانی مولکیەت ئەنجامی دوورتر لە تاك و لە سوودی شەخسی تاك لەخۆ دەگرێ، لێرەدا بەریەککەوتنی نێوان بیردۆزەی تاکگەرایی و بیردۆزەی کۆمەڵێتی ئیسلامی دەردەکەوێت. حوکمی ئیسلامیش جیایە لە حوکمی پاشاکان لەسەر بنەڕەتی مافی خوایی و وەك ئەو دیموکراتیەتەی لە دەسەڵاتی دا جەخت دەکاتەوە سەر کەسێ یان حیزبێ لە دیموکراتیەتی ئەسینادا بیست هەزار هاوڵاتی لە پاڵیان دا زیاد لە سەد هەزار کۆیلەی بێ بەش لە هەموو مافێ هەبوون– ئەمەش دیموکراتیەتێکە لەسەر کۆیلایەتی وەستاوەو تەنها بۆ کەسە خاوەن موڵکەکان دیموکراتی هەیە.

جیاوازی نێوان دیموکراتیەت و شورا زۆر ڕوونە: دامەزراوە ڕۆژئاواییەکان لەوانەش دامەزراوەی دیموکراتی لەسەر بنەمای پیرۆز ڕاگرتنی تاك وەستاون وەك ئەوەی مرۆڤ هەموو شتێ بێ لە بوون دا و سەرچاوە و ئامانجی بەهاکانیش بێ، بەڵام شورای ئیسلامی دامەزراوەیەکی تاکگەرایی کۆمەڵایەتیە لە یەك ڕەوتی یەکانگیری تەواودا. کاتێ دامەزراوە ڕۆژئاواییەکان دێنین بە ژەهرێکی دەرەکی ئیسلام دەخنکێنین، ئەو تاکگەراییەی دەگۆڕێ بۆ دانانی تاك بە پێوەر و ئامانجی بەهاکان چالاکی کوشتنی

گیانی کۆمەڵایەتی و باڵایی ڕۆحیە. ئەو باڵاییە ڕۆحیەی مرۆڤ دەکاتە پێناوی ئامانجێ کە بەدیهێنانی پەیامی خواییە.

حەوتەم: ئابووری سیاسی ڕۆژئاوایی خۆی لە دوو وێنەی بۆرجوازی و مارکسی دا دەبینێتەوە، ئەم ئابوریە زانست نیە، با کتێبەکانیش هەوڵی ئەوەی بۆ بدەن، بەڵکو تەنها چەند ئایدۆلۆجیایەکن دانراون بۆ سەلماندنی مەزهەبێ کە بڕیارە یەکلا پێشوەختەکانی دەشارێتەوە (واتە دیدی تایبەتی بۆ مرۆڤ) ئابووری سیاسی وا دەڕوانێ بۆ مرۆڤ کە تەنها بەرژەوەندی شەخسی ڕێبەری دەکات و لەسەر دیدێ وەستاوە کە بەهای مرۆڤ دەورە دەدات، ئەو مرۆڤە ئابووریە تەنها وەك بەرهەمهێن و بەکارهێنەر سەیری دەکات ئەمەش پێچەوانەی مرۆڤە لە دیدی ئیسلام دا. بەڵکو ئابووریە مارکسیەکان ڕەخنە دەگرن لە جیهانی بۆرجوازی، بۆیە موڵکداری وەك یاسای ڕۆمانی ناساندویەتی دەگۆڕێ بۆ موڵکداری تاکەکەسی (مافی سوود و سوودگیری) بەڵام لە چەمکی ئیسلامی دا ئەوە ئەرکێکی کۆمەڵایەتیە، واتە بەرژەوەندی تاك بەردەوام بۆ بەرژەوەندی کۆمەڵە. لەم بنەما بنەڕەتیەی بنەمای قورئانی لە بواری ئابووری دا سەرکۆنەی سوو وەردەگرین نابێ دوور بگرین لە مشتومڕو بەڵگەخوازی لە کاتی لێکۆڵینەوە لە جیاوازی نێوان فائیدەو سوودا، بەڕای من هیچ جیاوازییەکمان نیە، گرنگ ئەوەیە سوو داکەوتنی بەهای مرۆڤی لێدەکەوێتەوەو سامان بەسەر مرۆڤ دا سەردەخات. ئیسلام کە دیاردەی سوو بەرپەرچ دەداتەوە قۆرخکردنی سامان بەسەر مرۆڤ دا بەرپەرچ دەداتەوە، ئەمەش بەرز ڕاگرتنی بەهای مرۆڤە.

هەشتەم: ژیاری ڕۆژئاوایی بانگەواز دەکات بۆ بەرتەسککردنەوەی ژیان لە (پێویستی و ڕێکەوت) دا وەك زانایانی زیندەوەرزانی دەیڵێن یان بۆ (نامەعقول) واتە بێ واتایی و مەرگی خوا و مەرگی مرۆڤ و مەرگی هەموو شتێ وەك بانگخوازی و هیچگەرایی دەیڵێن. ژیاری نابینی بەتەواوی خۆی بێئاگا کردبێ لە واتای ژیان و مەرگ

بەو جۆرەی ژیاری ئێستای ڕۆژئاوا خۆی لێ بێئاگا کردووە. ئەمە لە ماوەی پێنج سەدە گەیاندیە ڕێگەیەکی داخراو کە دواجار دەیگەیەنێتە خۆکوشتنی هەموو بوون. لەمەشەوە ملکەچ کردنی هەموو ڕاستیەکی واقعی بۆ چەمکی چەندێتی خۆشەویستی و واتا و ئیمان بە کۆیلەگرتن دەخوازێ.

<u>دووەم:</u> ڕۆژئاوا کە هەوڵ دەدات واتا بە ژیان و مێژوو ببەخشێ زانست و دانایی جیاکردووەتەوە واتە پێناو و ئامانجی جیاکردووەتەوە، بزوێنەری سەرەکی پەرەسەندنی زانست و تەکنەلۆژیا لە ژیاری ڕۆژئاوایی دا خۆی دەبینێتەوە لە خۆشەویستی تاك و گەلان بۆ هێزو بەرژەوەندی ڕاستەوخۆ، لە ڕۆژئاوادا زانست ئامانجی دابین کردنی پێویستیەکانە، ئەمە دابەشکاریەکی هاوبەشی نێوان مرۆڤ و ئاژەڵە (خۆراك و پۆشاك و بەرگری کردن لەخۆو هێرش بردنە سەر جگە لە خۆت) بەڵام بزاڤی سەرەکی ئیسلام خۆی دەبینێتەوە لە گەڕان بەدوای پەیوەندی بوونی خواو بانگەواز بۆ کردنی و ملکەچ بوونی ویستی خوا.

## * ئەی ئیسلام چی دەبەخشێ؟

ئەو مایە پووچیەی تووشی هەردوو ڕەوتی ئەمریکی و سۆڤێتی بوو و دوای پێنج سەدە هەژموونی ڕەوای ڕۆژئاوا دەکرێ ئیسلام ڕەگی هیوا لەم جیهانەدا ببوژێنێتەوە، ئەمەش زۆر سەخت نیە ئەگەر بتوانین ئەو بەستوویيە تێپەڕێنین کە ماوەی پێنج سەدەیە تووشی بووە و سەر لەنوێ ئەو بنەمایانە بخەینەڕوو کە هۆکاری گەورەییەکەی بوون.

ئیسلام درێژە پێدەری ئەو ئایینە ئیبراهیمیەیە جولەکەو مەسیحیەت و ئیسلام- کە مرۆڤ بانگ دەکات بۆ بەدیهێنانی ئامانجی باڵای. جارێکی تر ئیسلام دەتوانێ سەر لەنوێ هیوای کۆمەڵگەی ڕۆژئاواییمان زیندوو بکاتەوە، ئەو هیوایەی کە تاکگەرایی

دایرماند، ئیسلام دەتوانێ نمونەی ئەو نەشونمایە بگێڕێتەوە كە جیهان بەرەو خۆكوشتن دەبات. ئیسلام هەر لە دەركەوتنیەوە جیهانی لە دارمان ڕزگار كرد و قورئان هێزی بەرزی خوای ڕاگەیاند و جۆرێكی نوێی كۆمەڵبوونی خستەڕوو و هۆشیاریەكی دیدی حەقیقی مرۆیی و دیدی خواویستی بە ملیۆنەها كەس بەخشی و گیانی ژیانێكی نوێی پێ بەخشین، ئەم بەشداریەی ئیسلام پێشتر بەخشی و دەكرێ ئەمڕۆش لە پێناو داهاتوویەكی گەشی مرۆڤایەتی دا ببیەخشێ لە جیهانێك دا كە بەرزو بالآییەكان لەناوبراون. لەم جۆرە بارودۆخەدا دەكرێ ئیسلام شتێ بە زانست ببەخشێ كە نیەتی و پێویستی پێی هەیە، ئەویش واتای ژیانە. ئیسلام تەنها پەیوەستكردنی عیلەت بە عیلەت نیە، بەڵكو لە دواجاردا هەموو شتەكان دەگەڕێنێتەوە ڕووە و ئامانجی بالآ. لە ئیسلام دا برافی زانست ئاماژەكانی بوونی خوا و چوون بەدەم بانگەوازی و ملكەچ بوونی ویستی و ڕێكخستنی جیهان بەو ئاراستەیە دەخاتە ڕوو. پاشان ناكرێ مرۆڤەكان لەپێناو بەدەست خستنی زانست و تەقەنی وەك پێناوی دەست بەسەرگرتن دا كێبڕكێ بكەن، بەڵكو مرۆڤ دەبێ جێگری خوا بێ لەسەر زەوی دا تا جیهانێ دروست بكات كەلەگەڵ ئامانجی خوایی دا گونجاو بێ.

ئیسلام جیاوازی ناكات لە نێوان بیروباوەڕو زانست و تەقەنیەت دا، بەڵكو لە یەك بنیادی یەكانگیردا یەكیان دەخات هەروەك چۆن لێكۆڵینەوە لە یاساو پێناوەكان و لێكۆڵینەوە لە ئامانج و واتاكان جیا ناكاتەوەو جیاكاری ناكات لەنێوان ئەو هێزەی تەقەنیەت بۆمان دابین دەكات بۆ دەستڕۆیی بەسەر شتەكان دا و پێویستی بەكارهێنانی وەك پێناوێكی پەرستشی خوا.

پێدانی مۆركی ئیسلامی بە زانستەكان ئەوە دەخوازێ فەلسەفەیەكی دروستی ئیسلامی دابنرێ كە وەك فەلسەفەی ڕۆژئاوایی لە كەموكورتی فەلسەفە و بیركردنەوەیەك دا كە تەنها ئیمكانیات و ڕێبازی خۆی لەخۆ دەگرێ بەرتەسك

نەبێتەوە، بەڵکو دەبێ بە پلەی یەکەم ئەو ئامانج و مەبەستانە لەخۆ بگرێ کە دەبێ لێکۆڵینەوەی زانستی بگرنەوە تا ڕێخۆشکەر بێ بۆ گەشەسەندنی مرۆڤ نەک داڕمانی مرۆڤ، کێشەکەش لەوەدایە کە زانستی وەزعی کە ئاشکرا کردنی پێناوەکانە- بەستریتەوە بەو حیکمەتە خواییەوە کە گەڕانەوە بەدوای ئامانجەکان و بەرزکردنەوەی ئامانجە نزمەکانە بۆ ئامانجە باڵاکان بەجۆرێ بگاتە ئامانجی کۆتایی.

جێگیرایەتی مرۆڤ لەسەر زەوی دا واتە کارگێڕی جیهان دراوەتە دەست، بەڵام بەپێی ڕێنماییەکانی خواو لەوەش دا پێناوی بەردەستی بەکارهێنانی ئەو زانستەیە کە یارمەتی دەدات بۆ گەڕان بەدوای ئامانجەکان دا. ئامانجە ئەورووپیەکان بۆ زانست لەمرۆدا ڕێ نادەن مرۆڤ هۆکاری یەکەمی شتەکان بزانێ، دواجاریش هەستی پشت بەستن بەخواو گوێڕایەڵی خوا نابەخشێ. هەروەها دەرفەتی هەستکردن بە ئامانجی باڵا و بنەمای باڵای جیاکەرەوەی نێوان چاکە و خراپە نادات بە عەقڵ، بۆیە پێویستە ڕێگەکە بە پێغەمبەرایەتی ڕۆشن بکرێتەوە بۆ عەقڵ کە بەدوای ئامانجەکان دا دەگەڕێ، پێغەمبەرایەتی وا دەکات مرۆڤ تواناکانی بەکاربهێنێت و ئاراستەیان بکات بۆ ئەنجام دانی ڕۆڵی خۆیان بە چاکترین شێوە.

گەورەمان موحەممەد (ﷺ) تەنها پێغەمبەرێ نەبووە، بەڵکو سەرکردەی دەوڵەتێ بوو کە توانی دوو بنەمای نەمری هەموو کۆمەڵگەیەکی مرۆیی بەدیبهێنێ کە ئەوانیش بریتین لە بەرزی (واتە ئیمان بە بەها ڕەهاکان)کە لە بڕوا بوون بەخواوە هاتووە، لەگەڵ گیانی کۆمەڵ بوون کە بەرپرسیارێتی تاکەکەسی سەبارەت بە داهاتووی خەڵکانی تر دەدات بە هەموو بەرپرسێ، ئەمڕۆ دوای پێنج سەدە قەڵەمڕەوی ڕۆژئاوا وا بەرەو لەناوچوون دەچێ چونکە ئەو دوو بنەمایەی لەبیرکردووە: ئیمان و گیانی کۆمەڵێتی. ئیدی مرۆڤایەتی دەبوو بەرەنگاری چەندین ململانێ بێتەوە لەنێوان ویستی هەموو کەس و ململانێی بۆ بەدیهێنانی ویستە شەخسیەکانی. گاروودی هەوڵی دا ئەوە

بە ڕۆژئاوا بگەیەنێت کە ئیسلام ئەو ئاڵا بەرزەیە کە هاوشانی نیە و ڕزگاری مرۆڤایـەتی تەنها بە گەڕانەوەیـە بـۆ ئیـسلام لـە کـرۆك و ڕێنماییەکانیـەوەو شکستی مەسـیحیەتی ئەمڕۆو بانگـەوازانی سـەرمایەداری و شـیوعیەت دەخاتـەڕوو. ئـەو مەزهەبانـەی لەسـەر ئەنانیەتی مرۆڤ و تاکگەرایی و چینایەتی وەستابوون. خراپە و برسێتی ئەمڕۆ کـە چـل ملیۆن کـەس بـەهۆی برسـێتی و بێبەشـیەوە دەمـرن هـەموو بەرهـەمی ئـەو نیزامانـەن لەسەر مرۆڤایـەتی و خـوێن و لەناوچـوون دەکەنـە بەشـیان. هـەرکات ئیـسلام بنـەمای ڕووناکی خۆی لە بریدا دادەنێ کە خوای تـەنها بەمـەلیك دادەنـێ مـرۆڤ لـە ئەنانیـەت و خۆپاك دانانی کوێرانەی دادەماڵێت.

گارودی دان دەنێت بە گەورەیی ژیاری ئیسلامی بەسەر ژیاری هاوچەرخ دا بـەجۆرێ پێشتر شتی وا نەبووە، بۆیە ڕایدەگەیەنێت:

یەکەم: ژیـار لـە ڕۆژئـاوادا لـە ئیتاڵیـا دا بـە زیندووکردنـەوەی فەرهـەنگی یۆنـانی و ڕۆمانی دەستی پێنەکرد، بەڵکو لە ئیسپانیا دەستی پێکرد کاتـێ زانـست و ڕۆشـنبیری ئیسلامی پرشنگی دایەوە، بـەڵام ئـەو پێـی وایـە ڕۆژئـاوا لـەو زانـستە ئیـسلامیە تـەنها ڕێبازی ئەزموونی و تەقەنی وەرگرتووە و ئەو بیروباوەڕەی پشتگوێ خستووە کـە ئـەو ڕێبـاز و تەقەنیانـە بـەرەو لای خـوا ئاڕاسـتە دەکـات تـا هەمیـشە زانـست لـە خزمـەتی مرۆڤایەتی دا بێت.

دووەم: بڕیــاری ئــەوە دەدات پێــشوازی گــەلان بــۆ موســڵمانان وەك پێــشوازی ئازادکەرانە نەك وەك داگیرکەران، جا لە ئیسپانیا دا زۆرینـەی ئـەو جوتیارانـەی بـەهۆی دەرەبەگەوە باریان سەخت بوو، لە شام و میسریش هەروابوو. هەموو ئەوانـە مـوژدەی خێری هـاتنی موسڵمانان بـوون کـە موسـڵمانان هـاتن کۆت و بەنـدیان لەسـەر لابـردن سەرەڕای ئەوەی ئیسلام نەکەوتـە داخـستنی پەرسـتگاکانی جولەکـەو مەسـیحیەکان و خـاکی لەوانـە داگیرنـەکرد کـە کاریـان تێـدا دەکـرد، بـەڵکو تـەنها بـاجێکی بـچوکی

لەسەردانان، ئەمەش تەنها لەبەرئەوەی ئیسلام بەهێزی بیروباوەڕ بڵاوبوویەوە نەك بە هێزی چەك، ئیسلام گەلە ستەم لێكراو و بەزیوەكانی ژێر دەسەڵات و ستەمی دەرەبەگی و پیاوانی ناوچەیی كڵێسا ڕزگار كرد.

سێیەم: ئیسلام بە پێچەوانەی كڵێساوە جیاوازی ناكات لەنێوان ئایین و دنیادا و سیاسەتیش بەشێكە لە ئیسلام یان هەموو ئیسلامە. ئیسلام عەقڵی ڕزگاریخوازی بوو بۆ گەلانی كەفەتمكران و ئەو بزاڤە ڕزگاریخوازیانەی كە لە چەند وڵاتێك دا هەن.

چوارەم: زانستە ئیسلامیەكان لە جەرگەی ژیاندان و مرۆڤ سەریەخۆو جیا لە مرۆڤ نیە، بەڵكو ئەو زانستانە لە خزمەتی مرۆڤدان و زانایانیش جۆرێ لە مەعریفەیان بە كەنارگیری چارەسەر نەكردووە وەك ئەوەی بە ئامانجی ئیسلام و مانای ژیانی دابنێن.

پێنجەم: بیردۆزەی فرۆیدی ئەورووپی دیدی نەبوونی هەواداری بۆ كۆمەڵ و بۆ پایەكانی ئیسلامەكەی ئەوانی لێكەوتەوەو لەوەشەوە عەلمانیەتێ دەركەوت كە دژی بیروباوەڕ بوو، بەو جۆرە دیدی ئەورووپا بە هیچ جۆرێ بۆ جیهانی ئیسلامی نابێو ئیسلام دوو دیدی بنەڕەتی لەو بوارەوە هەن بۆ هەڵسەنگاندنی ڕۆڵی تاك:

١- باڵای بێ سنور (ئیمان)،

٢- بنەڕەتی ژیانی ئیسلامی بەرەهایی بۆ تاك نیە، بەڵكو بۆ تاكی سەر بە ئوممەتی ئیسلامیە.

شەشەم: نوێگەری پێویستیەكی ژیاریە و ڕۆژئاواگەریش خۆكوشتنێكی ژیاریە، چونكە ڕۆژئاواگەری خۆچواندن و خۆ بە كۆیلە گرتن و نوێگەریش پەرەسەندنی بنەما و متمانەی ژیاریە لە دەروون و پێشڕەوی و ڕێبەرییە. بەڵام ڕۆژئاواگەری ژەهرێكی كوشندەیە، بەڵام نوێگەری واتە گەڕانەوە بۆ پێشینەی كراوە ڕووەو ڕیشەو بنەڕەت بێ هیچ كۆت و بەندێ یان وەرگرتنێ لە داڕشتنی ژیان. ئەم گەڕانەوەیە چارەسەری ژیاری بەردەم موسڵمانانە ئەگەر بمانەوێ لە مێژوودا بوونێكی حەقیقیان هەبێ.

حەوتەم: گواستنەوەی تەکنەلۆجیا لە ڕۆژئاواوە بە شێوەیەکی گشتگیر کار دەکاتە سەر داڕشتنی ژیان و بیرۆکەیەکە کە شبنگلەر و توینبی داوای دەکەن بەڵام ئێمە داوا دەکەین پوختگیری بکرێ، هەر دەبێ خۆمان تەکنەلۆجیایەکی تایبەت بە خۆمانمان هەبێ.

ئیسلام دەتوانێ وا لە مرۆڤ بکات شوێن ڕێی بنەڕەتی ڕووە و خوا چوون بکەوێ تا گەشە و نەشونما بدات بە زانست و تەقەنی و سیاسەت لە بەرژەوەندی مرۆڤ دا. ئیسلام بەردەستی کاراو وزەی هەیە بۆ دۆزینەوەی چارەسەر بۆ ئەو کێشانەی بەرەو ڕوویان دەبینەوە بە مەرجێ نوێگەری و پێشکەوتن لەگەڵ خۆ چواندن بە ڕۆژئاوا لە زانست و تەقەنیەتیان دا تێکەڵ نەکەین، موسڵمانان دەبێ لەسەر بەها و مێژووی خۆیان و دوور لە خۆچواندن بە ڕۆژئاوا پێشکەوتنی خۆیان بگرنەبەر. دەبێ موسڵمانان جیا لە وەرگرتن و خۆچواندن ڕێی نوێ بدۆزنەوە بۆ نەشونما و پێشکەوتن. دەبێ بگەڕێینەوە بۆ قورئان چونکە کانی گەورەی واتای تیایە کە تا ئێستا پەردەیان لەسەر لانەدراوە.

گارودی و بۆکای و ئالسون و چەندی تر هێمای نوێی ڕێی ئیسلامن لە دەیەی یەکەمی سەدەی پانزەهەمی کۆچی دا. ڕۆژێ دێ نەوەکانی داهاتوومان بە بزەوە سەیری ئەو دیاردەیە دەکەن بەجۆرێ ئەو بازنەیە تەواو فراوان دەبێ، بەڵام ئەمڕۆ ئێمە بە دیدی ڕێزی تەواوەوە سەیری دەکەین. لە ماوەی سەدەی چواردەدا ئاسۆی نوێی ئیسلام لە ڕۆژئاوادا خرایە بەرچاو، بەڵام بزاڤی بێداریخوازی ڕۆژانە دڵ و عەقڵی نوێی هەڵکەوتەکان وەردەگرێ لەڕێی ململانێی نێوان زانست و ئایین و ناکۆکی نێوان دەوڵەت و کڵێسادا. هەروەها لە ڕوانگەی کۆمەڵگەیەک کە لە سایەی لێکهەڵوەشانی ڕەوشتی و بێئابڕوویی ڕەهاو سیستم و ئایدۆلۆجیای وادا وەستاوە کە وەک ڕێبازی ژیان دەرکەوتوون. ئێمەش ئەو تیشکە ئاشکراکەرە لە قسەکەی گارودیەوە

بەدیدەکەین کە دەڵێت: (ئیسلامم هەڵبژارد تا لە ترس و لەناوچوونم ڕزگارم بکات) دیارە یەکێ لەو دوو ڕێیەی جیهان هەن بۆ ئاشکرابوونی حەقیقەتی ژیار یان ئیسلام یان خۆکوشتن، گارودی دەڵێت: کاتێ ئیسلامم وەك ئلیین هەڵبژارد مشتومڕێکی بێسنورم لەگەڵ بیروباوەڕەکانی تری مەسیحیەت و جولەکەو مارکسیەت دا ئەنجام دا.ئەوەش کۆتا سەرپشکم بوو لە جولەکایەتی دا کە چەند حاخامێ هەوڵیان دەدا لایەنی خوایی و تەنانەت لایەنی مرۆیی لەو ئایینەدا بگۆڕن و بیکەنە پێناوێ بۆ دەست بەسەرداگرتن یان گۆڕینی ڕق بۆ بارێکی ئایدۆلۆژی، فەلسەفەی مارکسی ناتوانێ کەسی مردوو لەگەڵ کەسێك دا جیا بکاتەوە کە هێشتا زیندووە. مێژوو نێوەندی زەرووری نێوان خوا و مرۆڤ نیە، نێوەندی زەرووری نێوان مرۆڤ و سروشت لە ئیسلام دا هیچ بوونێکی نیە و هەرگیز ئەو زەرووڕەتە بوونی نیە کە فیترەتی مرۆڤایەتی هەڵدەوەشێنێتەوە.

دکتۆر ڕشاد قەتار بە جوانترین شێوە ئەو بارە نیشان دەدات و دەڵێت: سادەکان لە هەموو کیشوەرەکانەوە ڕووەو ئیسلام دێن، لە سەدەی نوێی کۆچی دا من بینیم گەورە هەڵکەوتەکانی بیرو فەلسەفە ڕاکانی خۆبەزلزانی و تەحەدی ڕووەو ئیسلام دێن‌و دەڵێن ئیسلام بۆ کوێ و ئیسلام چیە؟

ئیسلام لەگەڵ بەتواناترین عەقڵەکان دا گفتوگۆ دەکات لە کاتێك دا موسڵمانان لە پاشەکشەدان لەبەر نهێنیەك کە خوا خۆی دەزانێت. ئیسلام لە سەردەمی پاشەکشەی موسڵمانان دا پێشدەکەوێت، ئەمە پێویستی بە تێڕامانە. وەك دەبینین باری موسڵمانان چۆنە کەچی بەردەوام ئیسلام پێشدەکەوێ. بڕوا ناکەم هیچ ئایینێ لەبار بێ و پێشبینیەکانی ئێستا دەربکەون، بڕوام نیە ئایینێکی کەونی لەبارو ئامادە هەبێ لەگەڵ مرۆڤ دا لەباری وەزعی دا هەڵسوکەوت بکات جگە لە ئایینی ئیسلام، چونکە ئیسلام دەست ناگرێ بەسەر عەقڵ دا و ماندەری زانست و داهێنان و هونەر و

مەعریفەیە. ئیسلام ئەو ئایینەیە كە نە لە ڕابردوو و ئێستا و داهاتوویش دا بە شكڵی خوای تێدا نابینرێ چونكە خوا كامڵ و گشتگیرە و خوای هەموو ئایینەكانە، ئێمە پێویستامن بەوەیە موسڵمانی پێشەنگی كردەوەیی بنێرین بۆ ڕۆژئاوا. سەبارەت بە ڕۆژئاواش دیارە دەبێ بانگەوازی ئیسلامی و بەخششەكانی ڕۆژئاوا بگونجێن، ڕۆژئاوا ماندووی عەقڵیەتی خۆیەتی تا ئاستێ برتراندراسل پێشبینی ئەوە دەكات و دەڵێ عەقڵ و عەقڵیەت ڕۆژئاوا بەرەو نا مەعقول دەبات. گۆڤاری زانستیش ئاماژە بەوە دەدات كشانێكی ڕۆژئاوایی ڕووەو ئیسلام هەیە. گارۆودی بە یەكێ لە گەورە هەڵكەوتەكانی فەیلەسوفانی سەردەمەكە لەسەر كورسی جڵەوی كەونی فەلسەفە دانیشت بوو. كتوپڕ بۆی دەركەوت هەرچەندە لە لوتكەدایە كەچی هیچ نیە بۆچی، چونكە ئەو دلێری ئەوەی هەبوو ئەوە ڕابگەیەنێت تەنگژەكە باری گەیشتووەتە لای ئیسلام.

گارودی كە موسڵمان بوو تەنگژەیەك لەنێوان سێ هەڵكەوتەدا ڕووی دا:

١- گالوب مۆرتۆ زۆر بە درندانە خۆی كوشتەوە، زانایەكی گەورەو دیار و ڕاگری خوێندنگەی دەروونی كۆمەلایەتی ویلایەتە یەككرتووەكان بوو.

٢- تویسر كە فەیلەسوفانی ماددی و ماركسی دابەش كردو خاوەنی بەرگریكاری ناسراوی بیردۆزەكەیە بەناونیشانی (لەپێناو كارل ماركس دا) كەسی بەرچاو و جڵەوگیری دیاری ناو ڕۆژئاواو هاوڕێی گارۆودی بوو، كاتێ ژنەكەی لەسەر جێگەدا لەلای بوو هەستاو ژنەكەی كوشت و چوو بۆ كۆشكی ئاسایش تا لەوێ خۆی بە دەستەوە بدات، ئەوكات برا بۆ نەخۆشخانەی نەخۆشیە عەقڵیەكان. ئەو ڕەوت و ڕێگەی بە ئینسكۆبیدیان بێهیوای ناسرابوو گارۆودی ڕووەو ئیسلام هێنا، چونكە عەقڵ لە لوتكەی بەخششی هزری خۆیدا بوو. بیری ڕۆژئاوایی كە ڕەقی و هەڵگەڕانەوەی هەبوو، بیری ڕۆژئاوایی تا ئاستێ گەیشت بە پێشكەوتن و بوونگەرایی و زەروریەتی

خۆی گەیشتە تەنگژە، هەموو تەنگژەکەیان ڕاگەیاند. لە هەموویان پاك ڕاگیرتر ڕاگری فەلسەفەی سەردەم (هایدی گارون) بوو کە فەیلەسوفێکی بوونگەرا بوو سور بوو لەسەر ئەوەی ڕێگەکە ناگاتە هیچ شوێنێك و مرۆڤ کە لەو ڕاڕاییەدایە (کە بە سەوەزەنگ) ناوی دەبرد دەبێ تەحەددای ئەو بیرە بکات. ئەم کەسەش لە لوتکەی ڕاگەیاندنی مایەپووچی دا مرد، وەك سارتەر لەپێش مردنی خۆی دا وتی: فەلسەفەکەم بەرەو شکستێکی سەختی بردم، کاتێکیش لە سەرەمەرگ دا بوو پرسیاری کرد، سارتەر کە بە ڕێبەری گەنجان و خوێندکارانی زانکۆ ناسرابوو لەکاتی سەرەمەرگی دا داوای کرد قەشەیەکی گوندێکی بۆ بهێنن و وتی من حەز ناکەم کاردینال بێ بۆلام چونکە بڕوام وایە ئەو پێغەمبەرێکی، دەمەوێ قەشەیەك بێنن بۆلام. ئەو کەسە سادەیان هێنا بۆلای تا لێخۆشبوون یان دانپێداناانی پێ ببەخشێ، کاتێ پرسیاری لێکرا فەلسەفەکەت بەکوێی گەیاندی؟ وتی فەلسەفەکەم گەیاندمیە کۆتاییەکی شکستخواردووی سەخت، بەڵێ هیچ هیوا و ئومێدێ نیە لە ئیسلام دا نەبێ.

کاتێ گاروودی گەیشتە تەنگژەکە و بە مرۆڤێکی بەتوانا و بیریارێکی دلێریش ناسرا بوو. بەرگریکاری ئیشتراکیەت و مارکسیەت بوو. کاتێ زانی مەسەلەکە تەنگژەو ڕێیەکی داخراوە ڕایگەیاند تەنها هیواو ئومێدێ هەبێ لە ئیسلام دایە، بۆیە ناوی خۆی نا ڕەجا گارودی، واتە هیچ هیوایەك نیە لە ئیسلام دا نەبێ.

سەبارەت بە کۆتا موسڵمانی ناو ژیاری ڕۆژئاوایی کە ناوی دێنین ستیف جۆنسۆن (٢٤ دیسەمبەری ١٩٨٥) کە واتایەکی وای نیە هەرچەندە دیمەنی دەرەکی شێوە بەرچاو بوو، بەڵام کرۆکێکی وای لە خۆنەگرتبوو و چەند کارێکی مەدەنی تەکنەلۆژی دەگرتەوە. ئامانجێ نەبوو تا خزمەتی بکات جگە لە سوودی ماددی ئەو ژیارە. بۆیە گۆڕانێکی گەشە سەندوو ڕووەو ئیسلام دەبینین. بەڵێ ئیسلام یەکەم ئایینی مژدەبەخشە و ژمارەی موسڵمانانیش ڕوو لە زیادبوونە.

## بیریارانی ڕۆژئاوا لە بیروباوەڕی خۆیاندا چییان بەدیکرد

بانگخوازانی ڕۆژئاواگەری دوو قاپیان لەدەستدان. قاپێ بە یەکجار نکوڵی لە ئیسلام دەکات و فڕێی دەدات و هەوڵ دەدات بیچوێنێ بە مەسیحیەتی ڕۆژئاواوە و چەمکی عەلمانیەتی (لائیکی) نا ئایینی بەسەر بنەڕەتی دا بسەپێنێ، قاپێکیش شانوشکۆی ژیاری ڕۆژئاوا بەرز و گەورە ڕادەگرێ و کەشێکی شوێنکەوتەیی لە دەورەدا دروست دەکات تا پڕی بکات لە بەرنامەی فێرکاری و خوێندن و ڕۆژنامەوانی و ڕاگەیاندن، هەموو ئەمانەش لە هەوڵێکی فێڵزانی مەترسیدار دا بۆ لەناوبردن و شاردنەوەی نمونەی ئیسلامی و گومان خستنە کرۆکی. چەندین هێزیش لە پشت ئەمەوەن کە لە کەشی تایبەتی دا کار دەکەن بەڵام لە یەك پیلانی دژ بە ئیسلام دا کۆدەبنەوە چ مەسیحی ڕۆژئاوایی یان مارکسی یان صەهیۆنی بن و وەك پێغەمبەر (ﷺ) وێنای کردووە (**تنداعی علیكم الأمم كتداعي الأكلة إلى قصعتها**) بەڵام بارەکە بە تەواوی بە ویستی ئەوان نەچوو و ئەو نەخشەی ڕۆژئاواگەریەی کێشا بوویان ڕێی خۆی تەواو نەکرد بۆ پاکتاوی بنەڕەتەکانی بەرگریکاری بیری ئیسلامی چونکە خێرا دەنگی حەق لەسەر زمانی بانگخوازان بۆ گەڕانەوە بۆ سەرچاوەکان دەرکەوت تا ئەوەی هەموو شتێ گۆڕاو نەوەیەکی نوێ سەریهەڵدا کە بڕوای بە ئصولیەت هەبوو، قەڵەمەکانی ئیسلام لە هەموو بوارەکانی هەوڵی ڕاستکردنەوەی چەمکەکان و تێکشکاندنی گومانەکان دا کەوتنە نوسین، دواتر لە سەرەتای سەدەی پانزەی کۆچی دا نەخشەی نوێ دەستپێکرد کە ئەویش بە ئیسلامی کردنی زانست و ڕێبازو چەمکەکان بوو. وڵاتانی ئیسلامیش نیزامی ئیسلامیان دەکردە ماددەیەك بە دەستوریان دا و نەخشەیەك بۆ ڕاستکردنەوەی یاساو فێرکردن و ئابووریدا.

لێرەوە پیلان گێڕان هەستیان کرد نەخشەکەیان بە تەواوەتی دارماوەو تێکدەشکێ، ئیدی دەستیان کرد بە ڕێکخستنەوەی پەڕەکانیان لە چەند پیلانێکی نوێی سەختترو

ڕەقتر دا بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەو ڕابوونە ئیسلامیە حەقیقیەی کە لە جیهانی ئیسلامی دا هەبوو هەر لە ئەندەلوسیاوە تا ریاتولفەتح، ئەوەی تووشی شۆکی کردن ئەوە بوو لەماوەی سەدەو نیوێك دا چییان کرد بۆ هەوڵی ڕۆژئاوایی کردنی بیرو کۆمەڵگەی ئەم ئوممەتە و چی پێناوی شالآوی جیاجیای دژ بە ئوممەتیان لە بەرەکانەوە گرتەبەر هەموویان کەوتن و بەرەو ڕووی خودی ڕۆژئاوا چوونەوە. تا خودی پیاوانی ڕۆژئاوا کەوتنە ئاشکرا کردنی هەڵەی ژیاریان بەو جۆرەی گارودی و پێش ئەویش چەندینی تر ئەنجامیان دا. هەر دەبوو لە بوارێکی تردا کەسانێ دەربکەون تا بەریەککەوتنی ئەو دەقە پیرۆزانە نیشان بدەن کە تەورات و ئینجیل لەخۆیان دەگرتن بەجۆرێ دەیان کەس لە پیاوانی لاهوت گەیشتن بەوە، لەوانە (مۆریس دایلز، بینهام، هۆلدن، جۆن هیك، دۆن کیویس) بوونە نوسەرانی کتێبی (ئەفسانەی خواوەندی جەستە بۆ دانراو) ئەمەش بازنەو ناوەندەکانی لاهوتی لە ڕۆژئاوادا لەرزاند، سەرەڕای نوسینەکەی دکتۆر مۆریس بۆکای.

نوسینەکانی ئەو زانا ڕۆژئاواییانە هەنگاوی دواتر بوون بۆ ئاشکراکردنی ڕاستیەکان لەلایەن زانایانی ئیسلامەوە سەبارەت بە بەریەککەوتنی دەقە پیرۆزەکان هەر لەو کاتەوەی ئەو بەخۆداچوونەوە لە دەروونی ئیسلامی دا دەستیپێکرد:

جاحیز: (فی الرد علی النصاری).

ئیبن حەزم: (الفصل فی الملل و النحل).

غەزالی: (الرد الجميل الهية عيسى بصريح الأنجيل).

ئیبن تەیمیە: (الجواب الصحيح لمن بدل دين المسيح).

موحەممەد عەبدە: **الأسلام والنصرانية في العلم والمدنية.**

سەرەڕای نوسینەکانی ئیبنولحەزم و ئیبنولقەیم کە بەدوای دا نوسینەکانی سەردەمی نوێ رەحمەتوڵڵای هیندی و ئەبوزەهرەو ئەحمەد شلبی هاتن. لێکۆڵەرە

ڕۆژئاواییەکان هەموو ئەمانەیان خوێندنەوە و پێش ئەوەی هەڵوێستی خۆیان بەو جۆرە بخەنەڕوو کە دواتـر بـە دوورو درێـژی باسـی دەکـەین بەچاکی لێـی تێگەیـشتن. بـەڵام لێرەدا سەبارەت بەو هەستە مەترسیدارەی کە لە کاتی ڕاگەیاندنی ڕابوونی ئیسلامی دا بازنەو مەڵبەندەکانی کلێسای تووشی شۆك کرد شکستی دەیان بیردۆزەی پـووچ دێت کـە بـیری مەسـیحی لـەپاڵ بیردۆزەکـانی بـیری مـاددی و مارکـسی و صـەهیۆنی دا خستبوونیە ڕوو. ڕابوون سەرچاوەی بزاڤێکی نوێی مەترسیدار بوو کە بـەرزراگیری ئـەو شوێنانەی مەبەست بوو کە لەرزیبوون، سەرەتاکەشی لەو مـوژدە بەخـشیەوە بـوو کـە بازنەکەی فراوان بوو و سەری کلێساش ڕووەو دەیان پێگەی تر جوڵاو هەوڵی دەدا چی لەدەست داوە بیگێڕێتەوە.

مەترسـیدارترین هەڵوێـستی حوکمەتـەکان لـە ئـەورووپا دا سـەبارەت بـە جالیـە ئیسلامیەکانی فەڕەنسا و ئەڵمانیا و شوێنانی تر بوو. چـونکە ئـەو دەسـتە ئیسلامیانە وێنەی واقعی ئیسلامیان پێشکەش دەکرد بـەو خەڵکـەی ڕۆژئـاوا کـە ڕووەو ئاسـۆیەکی نـوێ دەچـوون تـا لـەو تەنگـژە ماددیـە ڕزگاریـان بکـات کـە مەعنـەویاتی دەروونـی تێکدەشکاند و دەیخستنە نێو نامۆیی و تەنگژەوە.

هەڵمەتی ساختەکانی دژ بە موسڵمانان لە ڕۆژئاوادا بەدوای یـەك دا هـاتن بەتایبـەت لە فەڕەنسا کاتێ زیاد لە پـەنجا هـەزار کـەس لـە هـەموو ناوەنـدە کۆمەڵایەتیەکانـەوە موسڵمان بوون، ئەمەش هەستی دوژمنانی ئیسلامی گـەرم کـرد تـا قـەرەوڵ بگـرن بـۆ هەموو گەورەو بچوکێ و تۆزی چرووپری لە دەوردا بنێنەوە تا لە هەموو شتێك دا گومان بۆ خەڵك دروسـت بکـەن لەسـەر ئـەو ئایینـەی کـە ڕۆژانـە خـەڵکی دەسـتە بـە دەسـتە موسڵمان دەبن، کلێسای کاسۆلیکی تـەنها ڕاڕایـی و دوو دڵـی خـۆی لـەو ژمارەیـە دەر نەدەبڕی هێندەی دوو دڵ بوو لە قووڵی ئیمانیان و ئەو هۆکارانەی بوونـە هـۆی ئـەوەی زۆرینەیان واز لە کاسۆلیکیەت بهێـنن و بـەرەو ئیـسلام بچن، ئیـدی ئیـسلام ئـایینێکی

پەلکێشی نەوەستاو بوو، ئەو گۆڕانە گەیشتە ئاستێ هەریەك لە گۆڤاری کاسۆلیکی (لاکتوالتیە) و ڕۆژنامەی لۆمۆند و فرانس لی ئاران چەند بابەتێ تایبەت بکەن بۆ لێکۆڵینەوە لەو مەسەلەیە، ئەو موسڵمانە تازانە تەواو لەو مەسیحیانە جیاواز بوون کە پێشتر دەبوون بە موسڵمان چونکە لە بنەڕەت دا کۆچکردنەکە لەسەر ئەو سەربازیانە بوو کە لە ماوەی بوونی فەرەنسی لە باکوری ئەفریقا یان ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دا لەگەڵ ئیسلام دا ژیاون. دیارترینی ئەوانەش هیتۆ خەلیفە جەنەراڵ کلیبەر کە سەرکردەی سوپای فەرەنسی بوو لەدوای هەڵمەتەکەی ناپلیۆن لە میسر مایەوە. بەڵام کۆمەڵی نوێ لەو بیریارە ڕۆشنگەرانە پێکدەکات کە دەقە ڕۆحیەکان و فەلسەفەی ئیسلامییان خوێندبوویەوە وەك رینیە جیبۆن کە لە ساڵی ١٩٥١ز. مردووە، ئەو سەبارەت بە بەها ڕۆحیەکانی ناو ئیسلام بابەتی نووسی، ئەو کەسانەی لە فەرەنسا موسڵمان دەبوون (بەپێی ڕاپۆرتی ساڵی ١٩٨٥) سەر بە بزاڤێکی بەرفراوانترن، هەیانە بریارە وەك گارودی و میشیل سودکبونیز (زانای لێکۆڵینەوە سۆفیەکان) یان هونەرمەندە وەك (مۆریس بیجار) یان کارمەندن و ئارامییان لە ئیسلام دا بەدیکردووەو بینیویانە ئیسلام یەکانگیری و ساکاری و زوهد و قەناعەت ڕووەو خوا چوونی بێ نێوەندی تیایە.

لە بەرامبەر ئەم بڵاوبوونەوەدا ڕۆژنامە فەرەنسیەکان هێرشێکی توندیان دەبردە سەر ئیسلام و موسڵمانان لەو ڕۆژنامانەش (باری ماتش) کە لەو بوارەدا تایبەتمەند بوو. لۆمۆند کەتایبەتمەند بوو بۆ هێرش بردنە سەر گارودی و لەکەدارکردنی. ئەم هەڵمەتانە ڕەگداکوتانی صەهیۆنییان لە فەرەنسا و دەست گرتنیان بەسەر ڕاگەیاندنی ڕۆژئاوایی و فەرەنسی بە تایبەتی لە پشتەوە بوو. صەهیۆنیەت کۆمەڵگەی لە فەرەنسا ئامادەکرد تا ڕق و بەرگریکاری هەبێ بەرامبەر هەر شتێکی عەرەبی یان ئیسلامی و هەرکەسێ کە موسڵمانە. ڕووداوی گەنجە جەزائیریەکە کە سەریان‌و لە دەرچەی

شەمەندەفەرەوە دوور لەچاو فرێیان دا هەر ئەوە بوو، ڕاگەیاندنی جولەکە لە فەرەنسا بەسەر هەموو شتێك دا زاڵ بوو و ڕێبەری هەڵمەتی خەڵك بوو دژ بە بنیادنانی مزگەوت لەو شەقامەی تیایدا نیشتەجێن، بۆ ئەمەش ڕاستڕەو و چەپڕەو و شیوعی و ملهوڕەکانیان بەکارهێنان بەو بەڵگەی مزگەوت دەبێتە قەڵای دواکەوتوویی، لە دیدی ئەوان دا ئیسلام ئایینی عەرەب و ئایینی جیهانی سێی دواکەوتووەو بەدوای مرۆڤایەتیدا دەکشێ.

نیوزویکی ئەمریکی دەدوێنێو ئەویش دەڵێت ڕابوونی ئیسلامی شکستێکی توندی بیری نوێیە کە هەڕەشە لە جیهان دەکات. موسڵمانان لە دیدی خۆیانەوە وا هەست دەکەن نیزامی جیهانی ئەمڕۆ بێهیوایە. موسڵمانان هەست بە ناڕەحەتی و نا بەختەوەری دەکەن بەرامبەری. ڕۆژنامەکە شۆك دایدەگرێ لە هەڕەشەیەك کە لەسەر دەستی موسڵمانانی پەیوەست بە ئیسلام هەڕەشە لە جیهان دەکات و ئەمریکاش دەگرێتەوە. هەروەها چۆن ئەو کشانە نوێیە خەریکە هەموو جیهان داپۆشێ.

ڕۆژنامەکە دەڵێت ئەوەی وا دەکات ئیسلام سروشتی خراپەی هەبێ خێرایی پێوەری سەرکەوتنی یەکەمە کە کۆمەڵێکی ساکاری شوێنکەوتەی پێغەمبەر ئەنجامیانداو ئیمپراتۆریەتەکانیان شکاندن و لە ڕۆژئاواوە گەیشتنە فەرەنسا و لە ڕۆژهەڵاتەوە چین (ئەمەش بانگەشەیەکی پووچە کە موسڵمانان چەندین جار تەفرو تونایان کردووە).

ئەوەی دکتۆر ئیدوار سەعید لە کتێبەکەی دا (تغگیە الْعلام الْمریکی للْسلام) ئاماژەی پێدەکات پەیوەستە بەوەوە، دکتۆر ئیدوار دەڵێت پێناوەکانی ڕاگەیاندن و ڕاسازی گشتی ویلایەتە یەکگرتووەکان بە شێوەیەکی شێوێنەر ئیسلام و ڕۆشنبیری ئیسلامی دەخاتە ڕوو بۆ جەماوەری ئەمریکا. دەڵێت پەیوەندیەکی جەستەیی لە نێوان شێواندن و دوژمنایەتی مێژوویی دا هەیە، ئەو دوژمنایەتیەی ڕۆژئاوای نەسرانی

بەرامبەر ئیسلام و موسڵمانان هەیەتی هەر لە ڕۆژانی جەنگە خاچیەكانەوەو تا ئەمڕۆ بە چەند شێوەیەكی جیاو جۆر بەجۆر بەردەوامە.

پیلانی ئەو نەخشەیە ئەوەیە هەموو دیاردە و دیمەنە سلبیەكانی ناو كۆمەڵگەی ئیسلامی دەبەسترێنەوە بە ئایینی ئیسلامەوە تا وا لە جەماوەر تێبگەیەنن ئیسلام هۆكاری ئەو دواكەوتنەیە كە زۆربەی وڵاتانی ئیسلامی بە دەستیەوە دەناڵێنن. هەروەها لێكۆڵینەوەكانی پەیوەست بە ئیسلام لە ویلایەتە یەكگرتووەكان دا هێشتا بەدەست شێواندن و ڕووكەشی و نا مەوزوعیەتەوە دەناڵێنن بەجۆرێ دەمارگیری و مەنتیقی سودبەخشی سیاسی (براگماتیزم) لەو لێكۆڵینەوانەدا ئاراستە دەگرن و بڕیار دەدەن.

بارەكە لەو پیلانە مەترسیدارانە وەستا كە دەیویست بەرامبەر فراوانخوازی ئیسلامی بوەستێ و دژ بە نیازی ڕابوونی ئیسلامی كار بكات، بەڵكو جەخت كردنەوەش بوو لەسەر موژدەبەریەك كە لە ڕاستی دا هەوڵی بە مەسیحی كردنی موسڵمانان بوو، لەو بوارەش دا چەندین نەخشەو پیلان ڕاگەیەنران كە جەختیان دەكردەوە سەر چەند ناوچەیەكی ئەفریقا و باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا، دامەزرێنەرانی ڤاتیكان و ئەنجومەنی كلێساكانی جیهان پێی هەڵدەسان. ڕێنماییەكانی ڤاتیكان (سكرتێری ئایینە نا مەسیحیەكان) بەیاننامەیەكی ئامادە كرد كەڕێنمایی و ئاراستەكاری كلێسای لەخۆ دەگرت بۆ موژدەبەران، تیایدا هاتبوو: ئەركی ئێوە نیە موسڵمانان بكەن بە مەسیی، چونكە بەوە ڕێزداریان دەكەن، بەڵكو ئەركی ئێوە ئەوەیە موسڵمانان لە ئیسلام دەربكەن تا ببنە مەخلوقاتێك كە هیچ پەوەندیەكیان بە خواو بە ئەخلاقێكەوە نەبێ كە گەلان پشتی پێ دەبەستن. لە دەیەكانی كۆتاییش دا چەند كۆنگرەیەك بەستران بۆ دانانی نەخشەی مەسیحیگەری جیهانی. لە كۆنگرەی ئەمریكای باكوردا بۆ بەمەسیحی كردنی موسڵمانان (ویلایەتی كۆلورادۆ) كۆنگرەكە چل

لێکۆڵینەوەی پێشکەش کرد کە چەند لایەنێکی نەزەری و لێکۆڵینەوەی مەیدانییان لەخۆ دەگرت سەبارەت بە هەموو بەشەکانی جیهانی ئیسلامی بێ جیاوازی کەمینە موسڵمانەکانی ئەوروپاو ئەمریکا. سەدو پەنجا ئەندام ئامادەی کۆنگرەکە بوون کە چالاکترین کەسانی موژدەبەری زانکۆو کڵێسا و دامەزراوە پرۆتستانتیە ئەمریکیەکانی تر بوون، لەو کۆنگرە و چەند کۆنگرەیەکی تریش دا ملیارەها دۆلار دانران بۆ بەمەسیحی کردنی موسڵمانان بەتایبەت لە ئەندەلوسیاو وڵاتانی ئەفریقا، هەروەك چەند ڕادیۆیەکی جیاجیا بە زمانی عەرەبی دانران کە ئاڕاستە بوون بۆ وڵاتانی مەغریبو باکوری ئەفریقا، هەزاران نامەی پۆستەیی بە زمانی عەرەبی و فەڕەنسی دەنێردران بۆ چەند کەسایەتیەکی ناسراو کە بانگیان دەکردن بۆ مەسیحیەت. سەرەڕای کۆمەڵێ گۆڤار کە مەڵبەندە موژدەبەریەکان دەریان دەکردن و دەیانناردن بۆ وڵاتانی ئیسلامی و وانەو ئایەتەکانی ئینجیل و چیرۆك و قسە لەسەر کتێبی پیرۆز و دابەشکردنی نوسخەی ڕازاوەی کتێبی گیرفانی و بچوکتری ئینجیلیان لەخۆ دەگرت جگە لە لەوحەی هونەری کە بیروباوەڕی سیانە خودایی و ڕۆژانە پەرەی داکوتراو و بەرچاو و ڕۆژژمێر کە لە سەرویانەوە ئایەتەکانی ئینجیل نوسرابوون.

هەموو ئەمانە لە شاڵاوێکی نوێدابوون بۆ سەر جیهانی ئیسلامی، لە ساڵانی کۆتاییش دا چەند ڕاستیەکی نوێ دەرکەوتن، لەوانە هەزار ملیۆن دۆلار بۆ جموجوڵی پاپا، ملیارێك دۆلار بەخششی دەستە موژدەبەریەکان بێ بۆ گۆڕینی هەژارانی موسڵمان لە ئاینی خۆیان. چوار هەزارو پێنج سەد کەس لە یەك ڕۆژدا لە ئەندەلوسیا لەلایەن موژدەبەرانەوە کوژراون چونکە ئامادە نەبوون ببنە مەسیحی. گیرویزی موژدەبەری کاسۆلیکی دەڵێت ئیسلام لە کەناراوی باکوری ئەفریقاوە لە بەردەرگاماندا وەستاوەو بەرامبەر ئەوروپا بووەتەوەو لە هەردوو بەرەی ناوەڕاستەوە لای پایەکانی هیرقل و لە قوستەنتینیە ئەو حەقیقەتی دەکاتەبەر. ئەو کوتلە ڕەقەی لە ئەفریقای

باکورەوە بۆ ڕۆژئاواو ناوەڕاستی ئاسیا درێژبووەتەوە وەك خابورێکی چەسپاوی نەسواو وایە کە ڕۆژئاوای مەسیحی لە بتپەرستی یان ڕۆژهەلاتی دواکەوتوو جیا دەکاتەوە.

ڤاتیکان پرۆژەیەکی داناوە بۆ یەکخستنی کلێسای مەسیحی و تێکئالاندنی دەستەو گروپەکانی چەند هەنگاوێکی دەرکەوتن بە ڕاگەیاندنی بێتاوانی جوولەکە لە خوێنی مەسیح و لابردنی حیرمان (بێبەش کردن)ی ئالوگۆڕکراوی نێوان کلێسای کاسۆلیکی و ئەرسەدۆکسی و کارکردن بۆ بلاوکردنەوەی مەسیحیەت لە هەموو جیهان دا و کلێساکان کاریکەن بۆ بە مەسیحی کردنی زیاترین ژمارەی گونجاوی دانیشتوانی گەلە جیاوازەکان و کردنی ئەندەلوسیا بە ولاتێکی نەسرانی لە ماوەی کەمتر لە سی (٣٠) سال دا.

هەروەها کلێسای کاسۆلیکی هەلوێستی خۆی بەرامبەر ماسۆنیەت گۆڕی، ماسۆنیەت بزاڤێکی جوولەکەیی بوو بە مەبەستی لەناوبردنی ئایینەکانی مەسیحیەت و ئیسلام تا ڕێخۆشکەری بکات بۆ بلاوبوونەوەی دەولەتی جوولەکە لەسەر زەوی دا. فەیلەسوفە ملهوڕە نەیارەکانی کلێسا بە درێژایی مێژووی ئەورووپا هەموویان ماسۆنی بوون (ڤۆلتێروروسۆ)، هەموو ئەمانەش بۆ هەولی تەنگ پێهەلچینینی ڕابوونی ئیسلامی و وەستاندنی کشانی ڕوو لە زیادی ئیسلامی بوون، ئەوان هەولیان دەدا بەرامبەر چەمکە دروستەکانی ئیسلام بوەستن ئەو چەمکانەی وایاندەکرد ڕۆشنبیرانی ڕۆژئاوا موسلمان بن. هەروەها هەولی دەدا لای خودی موسلمانانیش ئیسلام بشێوێنن. لەوانەس دابەشکردنی دە ملیۆن نوسخەی ئینجیل لە خاکی موسلمانان دا. مەترسی ئەم کارو هەلمەتانەش لە دامەزراوە ئیسلامیەکان و ئەزهەرو یەکگرتووی ئیسلامی جیهانی نادیار نەبوون بەتایبەت قۆستنەوەی هەندێ ناوچەی ئیسلامی بەهۆی تووش بوون بە هەژاری و نەبوونی تا لە ئیسلام دووریان بخەنەوە، ئەو هەلمەت و

چالاكیانە لەناوبردنی موسڵمانانیش بوو لە فلیپین و چەند ناوچەیەكی تری كەمینەی ئیسلامی، سەرەڕای بەستنی كۆنگرەكانی كڵێسا لە خاكی موسڵمانان دا، ئەمە جگە لە هەڵمەت بردنە سەر بڕیارەكانی ئیسلام بەتایبەت فرەژنی.

هەروەها ئەو پیلانەی كە ناویان نابوو گفتوگۆی مەسیحی ئیسلامی كە لە بنەڕەت دا مەبەست بەدەستهێنانی وتەی زانایانی موسڵمانان بوو تا بتوانن بەوە ئەو كەسانە لەخشتە بەرن كە دەیانەوێ موسڵمان بن تا بڵێن تەنها چەند جیاوازیەكی سادە لە نێوان ئیسلام و مەسیحیەت دا هەن. هەموو ئەم هەوڵانە بۆ بڕینی گەشەی ئیسلام و لێدانی بزاڤی كشاوی ئیسلام ڕووەو ڕۆژئاوا بوون پاش ئەوەی ئایدۆلۆجیاكانی ڕۆژئاوا داكەوتن و سەر شێوێنی بیردۆزیە مرۆییەكان و ئەو ئەگەرانە دەركەوتن كە وەك زانست وەسف دەكران بەڵام گۆڕانی سەردەم و بارودۆخ تێكیان شكاندن، بەڵام مەترسی هەرە گەورەی ڕوونی ئەمڕۆ بریتی یە لە: تەنگهەڵچنینی صەهیۆنیەتی جیهانی بە مەسیحیەتی ڕۆژئاوا، ئەمەش لەڕێی چەندین كاریگەریەوە، لەوانە (بەڵێن)ی كە بۆ جولەكە بانگەشە دەكرێ، ئەوەش بەڵێنی خوایە بۆ ئیبراهیم و نەوە صالحەكانی كە پەیامی موحەممەد (ﷺ) هاتە دی، لەو بارەشەوە قورئان دەفەرموێت ﴿أَمْ يَحْسُدُونَ النَّاسَ عَلَى مَا آتَاهُمُ اللّهُ مِن فَضْلِهِ فَقَدْ آتَيْنَا آلَ إِبْرَاهِيمَ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَآتَيْنَاهُم مُّلْكاً عَظِيماً﴾.

ئەو تەنگهەڵچینینەی جولەكە لە مەسیحیەت لە ڕۆژئاوا دا لە دوو بەڵگەنامەدا دەردەكەوێت، یەكەمیان لە ساڵی ١٩٦٠ز. كە تیایدا دووری و بێتاوانی جولەكە لە خوێنی مەسیح ڕاگەیەنرا. دووەمیش لە ساڵی ١٩٨٥ز. كە تیایدا جولەكە دانی نا بە مەسیحیەت دا و ئاماژەش كرا بە مافی ئیسرائیل لە فەلەستین دا سەرەڕای ڕێدان بە یەكخستنی ماسۆنیەت و مەسیحیەت. ئیدی جولەكە هەڵدەسان بە كردنەوەی كڵێسا بۆ ئەنجامدانی ئاهەنگی سەما تا گەنجان ڕاكێشن بۆلای خۆیان. هەروەها ئاڕاستەی كڵێسای كاسۆلیكی بۆ داننان بە ئیسرائیل دا دوای ئەو بەیاننامەی كە لە شەش خاڵ دا

سەبارەت بە مەسەلەی قودس دەریکردو لەگەڵ بڕیاری جوولەکەو نەخشەکانی جوولەکەدا دژ نەبوون، چونکە جولەکە پیلانی داناوە قودس بکاتە پایتەختی هەمیشەیی ئیسرائیل، بەڵکو پرۆژەکەی پاپا جەخت دەکاتەوە سەر یەکبوونی قودس هەروەك لە بڕیارەکانی جوولەکەش دا وا هاتووە.

لەم ڕوانگەوە مەسیحیەت ڕووەو ئەوە دەچێ دان بنێ بە قەڵەمڕەوی جوولەکەدا کە ئێستا لە ڕۆژئاوا زاڵە بەسەر تواناو سامان و بانگ و هەموو بازنەی ئابووری کڵێسادا، هەروەك لە ئەنجوومەنی جیهانی کڵێساکان (ڤاتیکان) بڕیارێکی دەرکرد بەرامبەر بڕیاری نەتەوە یەکگرتووەکان کە صەهیۆنیەت و دەمارگیری بە یەکسان دانا. بەڵکو ئەوەی پێی دەوترێ مەسیحیەتی جوولەکایەتی لەسەر حسابی چەمکی کڵێسای پرۆتستانتی کە بڕوای هەیە بەوەی پێی دەوترێ خاکی بەڵێن دراو و گەلی هەڵبژاردە و لەسەر چەند ڕاسەپێنیەکی صەهیۆنی وەستاوە کە بێ فشاری ئیسرائیلی یان صەهیۆنی مەسیحی قەناعەت پێدێنێ و بەرنامەی کڵێسای ئینجیلیش لەسەر ئەو بنەمایە دەبێ کە هەموو مەسیحیەکی دڵسۆز دەبێ بڕوای هەبێ بە هاتنی دووەمی مەسیح، گرنگترین ئاماژەش بۆ ئەو هاتنە کاتێکە کە دەوڵەتی ئیسرائیل دادەمەزرێ. دواجار پاڵپشتی بوونی ئیسرائیل پاڵپشتی و تەشریعە بۆ هاتنی مەسیح.

* گفتوگۆ پیلانێکی لەناوچوو: لە هەوڵێکی بەرەنگاربوونەوەی ڕابوونی ئیسلامی و بەرەنگاربوونەوەی وێنەی دروستی ئیسلامی کە دەگەیشتە ڕۆژئاواو کاری دەکردە سەر عەقڵ و دڵی ڕۆشنبیران دوای ئەوەی قەڵەمڕەوی بیانی لە ماوەی زیاد لە سەدەو نیوێك دا توانیبووی داپۆشێ و خەڵکەکەی سەرشێواو و دواتر ڕۆژئاواییە تینوەکان بە ئیسلامیش سەرشێواو بکات، لەو کاتەدا بانگەوازی گفتوگۆی مەسیحی ئیسلامی دەرکەوت کە ئامانجی ئەوە بوو داننانی پەراوێزی بەو هەڵەدا پێشکەش بکات کە ڕۆژئاواییەکان و کڵێسا لە سەدەکانی ڕابردوودا بەرامبەر بە دەستهێنانی بڕیاری زانایانی موسڵمان تووش بوون تا بڕیار بدەن ناکۆکی نێوان ئیسلام و مەسیحیەت جیاوازییەکی ئەکادیمیە لە چەند مەسەلەیەکی کەنارگیردا، لەپاڵ ئەمەش دا ئەوەی پێی دەوترا یەکبوونی ئایینەکان دەرکەوت. ئەم بانگەوازە پووچە کە ناودەبرا بە

کۆکەرەوەی ئیسلام و ڕۆژئاوا بانگەشەی دەکرد بۆ پاکتاوی کتێبەکانی مێژوو لەو جەنگانەی لە نێوان ئیسلام و ڕۆژئاوادا ڕوویان داوە وەك جەنگە خاچپەرستیەکان و جەنگ داگیرکاریەکانی ئەم دواییە، ئەمەش بە ئامانجی دروست کردنی نەوەیەکی تێگەیشتوو وەك هەوڵێ بۆ جوانکردنی وێنەی ڕۆژئاوا لەو کتێبە مێژووییانەدا کە لە جیهانی ئیسلامی دا دەخوێنران. لێرەوە پێکگەیشتن لەگەڵ ئیسرائیل دێ بەو جۆرەی ئەمرۆ چەند ڕێکخراوێکی ناسراو هەوڵی بۆ دەدەن. ئەو هەوڵانە دەیانەوێ ڕۆژئاوا بگێڕنەوە لە دیدی بەرامبەر تێگەیشتنی ئیسلام و لێتێگەیشتنی، دوای ئەوەی هاواری ئەوە بەرزبوویەوە ئیسلام تاکە هیوای ڕزگاری مرۆڤایەتی یە. زانایانی ئیسلام لە چەندین کۆنگرەی بانگخوازانی گفتوگۆدا مەترسی ڕۆچوونی موژدەبەری خاچپەرستی ڕۆژئاوایان ئاشکرا کرد. لە هەمان کات دا لێکنزیکبوونەوە بەردەوام بوو. ئەمەش ناتەباییەکی زۆری لەخۆ دەگرت. ڕۆژئاوا دەبوو ئەگەر ڕاستگۆ و دڵسۆزە لە گفتوگۆدا ئەو چالاکیانەی بە مەسیحی کردن بوەستێنێ کە لە چەند ناوچەیەکی جیهانی ئیسلامی دا بڵاون.

سەبارەت بە کۆبوونەوەی ئیسلامی و ڕۆژئاوا ئەوەش کارێکی مەترسیدار بوو کە هەر بیریارێکی ساغ ئاگای لێبووایە دەیزانی، دکتۆر ئەحمەد فەتحی سرور ڕاگری کۆلیژ لە زانکۆی قاهیرە ڕایگەیاند تێبینی ئەوەی کردووە چەند ئامانجێکی نهێنی هەن، لەوانە:

١- بنەبڕکردنی هەندێ داهاتی عەرەبی لەژێر پەردەی بانگەواز بۆ ئیسلام بۆ پاڵپشتی پرۆژەی ڕۆژئاوایی کە تیایدا بەناوی ئیسلامەوە خەرجی بکرێ بۆ وڵاتان.

٢- دروست کردنی پەیوەندی پتەو لەنێوان نەریتە ئیسلامیەکان و کەسایەتیە عەرەبیەکان دا بۆ دامەزراندنی گفتوگۆ لە بەرژەوەندی ڕۆژئاوا نەك لەبەرژەوەندی ئیسلام.

٣- هەوڵی ڕازی کردنی موسڵمانان بە هەندێ بەش بۆ گۆڕینی چەمکە ئیسلامیەکان لەژێر پەردەی تێگەیشتنی باشتری نێوان ئیسلام و ڕۆژئاوا.

٤- هەوڵی دامەزراندنی گفتوگۆی جوولەکە-ئیسلام لە بازنەی ئەو ڕێکخستنەدا، دکتۆر فەتحی سرور دەڵێت: ئەوان پێمان پێدەکەنن وەك ئەوەی خەڵکێکی گەمژە بین، ئێمەش دەبێ چاك تێبگەین لە چواردەورمان چی ڕوودەدات.

## *درزێ لە دیواری مەسیحیەتدا:

ئەوەی پەلکێشی ڕۆژئاوایی مەسیحی لە جیهانی ئیسلامی دا لاواز کرد ئەو پەرتبوونە بوو کە لە ساڵانی کۆتایی دا تووشی خودی بیری مەسیحی بوو، ئەوە بوو دفتا لاهوتی مەسیحی کە بەشداربوون لە نوسینی پێشەکی نوێ دا بۆ ئینجیل ڕێککەوتن لەسەر چەندین پڕوپووچی دەقی ناو کتێبی پیرۆز هەروەك کۆربەندی مەسکونی کە لە ساڵی ١٩٦٥ز. دا بەسترا دانی پێدانا، سەبارەت بە تەوراتیش ڕاشکاوانە وتیان عەهدی قەدیم چەندین شێوانی تێدایە و بێدەنگ بوون لەو ڕەخنانەی ڕووەو ئینجیل کرابوونەوە و زۆر و مەترسیداریش بوون. بەو جۆرە دیاردەی لەرزەی بیروباوەڕە نەسرانیەت بەتاییەت جوولەکەییەکانیش بەگشتی دووپات بوونەوە لە ئەنجامی ئەو لێکۆڵینەوانەی کە کەمێ لە لێکۆڵەرو بیریارەکانیان لەسەر دەقەکانی کتێبی پیرۆزی بەردەستیان (تەورات و ئینجیل) پێی هەستان و چەندین ساختەو پڕوپووچییان ئاشکراکردن کە لکێنرابوون بە دەقەکانی کتێبی پیرۆزەوە، دیارترینیان: هەوڵێکی گەورەی مرۆیی زیادکراوە بۆ دەقەکانی تەورات و پاشکۆکانی، مارتن لۆسەر پێشتر ڕایگەیاند (بڕوا بوون بە کتێبی پیرۆز و عەقڵ شتێکی مەحاڵە) ژمارەیەك لە لێکۆڵەرانی لاهوت گەیشتنە ئەوەی ناکرێ بڕوا بەوە بکەین چوار ئینجیلەکە کە وێنەی حەقیقی ژیانی مەسیحن، لەگەڵ بێئاگایی تەواوی پەیوەست بە داو و ڕاستی دانەرانی، ئەوەشیان گێڕایەوە بۆ گێڕانەوەی نا دڵنیایی سەرزارەکی.

ناکۆکی و نەگونجانی سەختی نێوان گێڕانەوەکانی دانەرەکانیان یارمەتیدەری ئەو بیروباوەڕەبوون بەتاییەت گێڕانەوەی ڕەچەڵەکی مەسیح لەنێوان هەریەك لە لۆقاو

مەرقس دا و گێڕانەوەی گرتنی و مەسەلەی گۆڕانی خوێنی مەسیح بە مەی و گۆشتەكەی بە خواردنی سەرسفرەی خوایی، ئەمانە دیارترین نهێنیەكانی كڵێسا بوون، گێڕانەوەی كۆبوونەوەی كۆتایی نێوان خوێندكارەكانی لەپێش هەوڵی گرتنی و گێڕانەوەی هەستانەوەی لەناو گۆڕدا دوای لەخاچدانی (بە بڕوای ئەوان)، بەڵام ئێمەی موسڵمان دەڵێین نەكوژراوەو لە خاچ نەدراوە بەڵكو هاوشێوەیان لەگەڵ ئەودا لێ تێكچووە.

چەند لێكۆڵینەوەیەكی تریش باس لە دەستەوسانی كڵێسا دەكەن لە دوو دەیەی كۆتایی و شكستی لە دەستخستنی شوێنكەوتەی نوێ، بەڵكو تەنانەت ناتوانێ شوێنكەوتە كۆنەكان بپارێزێ، ئەمە بە ڕوونی ڕەنگی داوەتەوە لە چالاكی فرۆشتنی كڵێساكان دا كە لە ئەوروپا و ئەمریكادا بەدیدەكرێت.

لەسەر ژمێری ساڵی ١٩٨٠ز. كڵێسای كاسۆلیكی دا كشانەوەی مەترسیداری ژمارەی خوازیارانی ئەورووپی بۆ خۆ تەرخان كردن وەك خوێندكاری مەسیح بەدیدەكرێت كە ئاماژە بەوە دەدات لەوانەیە لە ساڵی دوو هەزاردا چەندین كڵێسا هەبن كاهینیان نەبێ، بۆیە خەفەتی گەورەی پاپا ئەوەیە گەنجان ڕاكێشێ بۆ ڕەوتی كەهەنووتی. پەردەی سەر چەند نامەیەكی نهێنی پاپا بۆ مەڵبەندە كاسۆلیكیەكانی جیهان لابرا كە بانگیان دەكات بۆ چڕكردنەوەی هەوڵی بەرەنگاربوونەوەی ئەو بارە تەكنەلۆجیەی كە هەوڵ دەدات ژیانی ئایینی داڕمێنێ و ڕێ نەدات گەنجان بچنە بواری كەهەنووتیەوە.

دكتۆر مۆریس بۆكای ئەو مەسەلەی گومان كردنە لە كتێبە پیرۆزەكان دێنێ و دەڵێت: هەستی ئایینی لە ڕۆژئاوا لەژێر كاریگەری زاڵی ناو جوولەكەو مەسیحیەت دا ئەمڕۆ كشانێكی گەورە بەخۆوە دەبینێ و وەرگێڕانی ماددی بۆ ئەو داكەوتنە بۆ پێوان

دەشێ بە مەنتیقی وردبینی، ئەوکات دەبینێت لە داکەوتنی ئاڕاستەیان ویستە ئاینییەکانی گەنجان دا خۆی دەنوێنێ.

لە فەرەنسا لە ساڵی ١٩٦٥ز. دا نزیکەی سی و شەش هەزار قەشە، لە ١٩٦٧ز. دا گەیشتنە چوارسەد و هەشتاو نۆ قەشە، لەو ساڵەوە ژمارەکە لە دابەزین دایە تا ساڵی ١٩٧٦ز. دا سەدو سیو نۆ قەشەو لە ساڵی ١٩٧٧دا نەوەدو نۆ قەشە هەبوون. ژمارەی خوێندکارانە ناو نوسی خوێندنگە ئیکلیرکیەکان لەم ساڵانەی دواتردا دەگاتە سەد کەس.

دەبێ هۆی ئەو بێزارییە لە ژیانی ئاینی لە وڵاتانی مەسیحی دا چی بێ؟ بەڵێ ئەوە لەدەستدانی متمانەی ناو کتێبە تەوراتیەکانە. لە کۆربەندی ڤاتیکان چەند لێکۆڵینەوەیەك لەسەرەتای ساڵی ١٩٧٠ز.ەوە دەرکەوتن کە بەرهەمی چەند لاهوتی مەسیحی بوون. ئەوانە بە وردی لە دەقەکان کۆڵیونەتەوە و هەوڵیان داوە هەموو ئەو لایەنانە بزانن کە مەعریفەی سەردەم لە بواری زانستی زمان و شوێنەوارو مێژوودا پێی دابوون. خەڵکی بڕوایان گەیشتبووە ئەوەی چوار ئینجیلە بڵاوەکە تەنها وەرگێڕانی بڕوای سەبارەت بە عیسان کە چەند کۆمەڵێکی جیا هەیانبووەو لەسەر یەك ڕ ڕێکنەکەوتوون. شرۆڤەکانی وەرگێڕانی مەسکونی کۆتاییش بۆ تەورات (سەردەمی نوێ-١٩٧٢) کارێکی هاوبەشە کە لە بەرهەم هێنانی دا زیاد لە سەد تایبەتمەندی کاسۆلیکی و پرۆتستانتی بەشداربوون، کۆربەندی ڤاتیکانیش لە دووەم کۆربەندی دا بێ باکانەو بێ چاوپۆشی ڕاشکاوانە ئەوەی دەڵێ لە ڕاگەیاندنی ژمارە چواری دا کە ئەو کتێبانە شتی کەموکورت یان تەنانەت پڕوپووچیان لەخۆگرتووە.

کارە نوێکان ئەوە دەخەنەڕوو و دروستە ئینجیل وەك پێودانگانە پێوەربکەیت، دەی چۆن بڕوا دەکەن ئەو ئینجیلانە ئەو ڕاستیەمان پێ نەگەیەنن کە خوا وەسیەتی کردووە کاتێ چەند بەشێك لەو ئینجیلەدان کە بە هیچ جۆرێ عەقڵ قبوولێیان ناکات.

نموونەی ئەوەش ئەو زنجیرەی ڕەچەڵەکی عیسا کە خەیاڵکاری لۆقا و مەتا بوون، ئەو دوانە لیستی جیای باو باپیرانێکمان لەوپەڕی نزمیەوە پێ دەدەن تا مرۆڤ بەشێوەی ساکاری پێش دەکەوێ و دەبێتە نموونەی ئەو قسە قبوڵ نەکراوەی سەردەمی ئێستامان دەی چۆن خوا شتێ دادەدات بە خەڵك کە لە واقیع دا پەیڕەو نەکرێ و نەگونجێ.

**دووەم: چەند ناتەباییەکی نێوان چیرۆکەکانی (الخوفة المعجزة)**

لۆقا دەڵێت: ئەمە لە سەردەمی عیسادا ڕووی داوە و یوحەننا دەڵێت کاتێ ڕوودەدات کە عیسا سەرلەنوێ زیندوو دەبێتەوە.

**سێیەم:** یوحەننا بیری دەچێت سراتوبانی پیرۆزی دامەزرێنەری وەسف بکات کەچی مەرقەس و لۆقا و مەتا ئەوەیان کردووە. ئەمە لە کاتی کۆتا ژەمی نان خواردن دا کە عیسا لەگەڵ حەواریەکان دا خواردی و چۆن تێبینی دەکرێ سێ ئینجیلەکە (مەرقەس و لۆقا و مەتا) وەسیەتی تەواو دوورو درێژی عیسایان باس نەکردووە کە بابەتێکی یەکلای دوورو درێژی ئینجیلی یوحەننایە. ئەم ناتەباییانە لەلایەن شارەزا مەسیحیەکانەوە سەیرکراون و ڕوونیان کردوەتەوە ئەوانە بەرهەمی یەکدوا یەکی چەند دەقێکی ئینجیلین، هەر لە گێڕانەوەی بەرگوێی لە عیسا کە لای دەستە یەکەمە مەسیحیەکانەوە بڵاوبوون ئەمانە بەو ڕاستیانەوە لکێنراون و هەموویان ئەم ئینجیلانەی ئێستایان لێکەوتوونەتەوە، بەو جۆرە بەڵگەی یەکلاو بێگومان هەیە لەسەر گەمە کردنی پیاوانی مەسیحی بە زانیارییە یەکەمینەکان بە ئامانجی بەرهەمهێنانی چەند دەقێکی نوسراوی گونجاویان بۆ خەبات وەك ئەوەی ئەبی وەسفی دەکات لە پەیمانگەی پاریسی کاسۆلیکی چونکە ئەوە بەرهەمی ململانێی نێوان چەند کۆمەڵێکی ڕکەبەربووە کە هەرکامیان هەوڵی داوە دیدە تایبەتیەکانی خۆی جێبەجێ بکات.

له لایەکی ترەوە دکتۆر مۆریس بۆکای بڕیاری لاهوتیە بەریتانیەکان (کە حەوت کەس بوون) دەخاتەڕوو کە نێویان دا سەرۆکی کڵێسای ئینگلتەرا هەبوو، ئەوانە ئەنجامی کاری خۆیان لە ساڵی ١٩٧٧ز دا لەژێر ئەم ناونیشانەدا بڵاوکردەوە (وهم الأله المجسم) کە ناباریەکی دروستی بیرۆکەی سیانە خودایی نیشان دەدات.

ڕاپۆرتەکەیان ئاماژە دەدات بە:

یەکەم: ناتەبایی چیرۆکەکانی سەردەمی کۆن (العهد القديم): وەك چیرۆکی دروست کردن (خەلق)و لافاو کە هەردووکیان لەگەڵ زانیاریە نوێکانی پەیوەست لە پێکهاتنی جیهان یان ئەنجامەکانی مێژوودا ناگونجێن، چۆن دەکرێ ئەو دەقانە وەربگێڕێن لە کاتێك دا خەڵکی بەپێی سەردەمەکان بەڕوونی یاری بەو دەقانە دەکەن. زانیاریە سەردەمی و جۆراوجۆر و جێبەجێکراوەکانی لێکۆڵینەوە لە دەقەکان بیری مەوزوعی لەخۆ دەگرن سەبارەت بە پێنەدانی ئەو ڕیشەییەی دراوە بە تەورات بەبێ بەڵگەیەکی سەدەکانی ڕابردوو، ئەمەش بووەتە هۆی گۆڕانی ئەو چەمکانەی تا ئەو کاتەش چەمکی بێ مشتومڕ و تەقلیدی بوون، چونکە عەقڵە شێواوەکان بەپێی ئەو دۆزینەوانەی بوونەتە هۆی گومان کردن لە بنەڕەتی و ڕیشەیی هەموو کتێبە جوولەکەیی و مەسیحیەکان لەڕێی چەند زانیارییەکی سەردەمیەوە بوون کە دەبنە هۆی بەرپەرچدانەوەی بڕوابوون بە خوا. پێش ئەوەی ماوەیەکی دوورو درێژ ڕووەو ئەوە بچم لێکۆڵینەوە لە ئیسلام بکەم هەمیشە بڕوام وابوو مەعریفەی زانستی هەرچۆنێ بێ بەتەواوی کەفیلە بۆ ئەوەی ڕووەو بیرکردنەوە لە بوونی خوا پێشەنگ بێت.

ئەو ڕۆژەی دەستمکرد بە لێکۆڵینەوە لە قورئانی پیرۆز بینیم گونجانی نێوان ئایین و زانست لە بیرکردنەوەدا لە بنەڕەت دا لەسەر چەند بەخششێکی ماددی بوونی هەیە. بینیم لە کاتی خوێندنەوەی قورئان دا ئەو گونجانەی نێوان ئایین و زانست وێنەیەکی

نوێی هەیە، ئەو گونجانەی بۆ لێکۆڵینەوە لە دەقە تەوراتیەکان دەشێ لەڕووی مەنتیقەوە تا دوورم بگرێ لێی.

(پەیڕەوی دەستکەوتەکانی زانست بەسەر کتێبی پیرۆزدا)

لێکۆڵینەوەی مەوزوعی دەقێکی قورئانی لەژێر تیشکی زانیاریەکانی سەردەم دا وایلێکردم ئەوە بخەمە ڕوو کە لێکۆڵینەوەی مەوزوعی دەقێکی قورئانی لەژێر تیشکی زانیاریە سەردەمیەکان دا ئەوە دەخوازێ ئەو بیخەینە ڕووکە لەگەڵ ڕووکاری چەندین سروشت دا دەگونجێ کە ناکرێ بیدەینەوە پاڵ مرۆڤێك چونکە ئێمە مێژووی زانستەکان دەزانین، دیارە لێکۆڵینەوەکەش بەو جۆرە پێشەنگیە بۆ ئاشکراکردنی کەلامی قورئانی پێش سەردەمی خۆی کە زیاد لە سەد ساڵ لەپێشترە. ئەوەی سەبارەت بە مێژووی زانستەکان دەیزانین ئەوەیە ناگونجێ زانست هی مرۆڤێ بێ لەپێش چوارده سەدە، بۆیە قورئانیش چەند جەختکردنەوەیەك دەخانە بەردەم بیرکردنەوەمان کە تەحەدایەك دەنوێنێ بۆ ڕاڤەی مرۆیی ئەوەش دەردەکەوێ قورئان هەموو ناتەبابییەکی نێوان ئاین و زانستی لەناوبردووە. کاتێکیش سەیری فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) دەکەین (زانست بخوازە لە بێشکەوە تا ناو گۆڕ) و (زانست بخوازە با لە چینیش بێ) بەمە بێباکانە ئەو پێشکەوتنە زانستیە سەرسوڕهێنەرە ڕاڤە دەکەین کە جیهانی ئیسلامی لەنێوان سەدەی هەشتەم و سەدەی دوانزەدا بەخۆیەوە دیوە، بەڵام لە وڵاتانی مەسیحی دا تەنها تەقلیدی ڕەها دەبینین لەگەڵ خوێندنگەی زاڵی لاهوتی و دواکەوتنی مەعریفەدا لە سەردەمی گەشاوەی قورتوبە دا خەڵکی لە وڵاتانی جیاجیای ئەورووپادا زانکۆی ناوداری خۆیان وا دەچواند بۆ توانەوە لە زانستە ئیسلامیو ئیغریقی و هیندی و فارییەکان.

**دووەم:** دەقی قورئانی ئێستای بەردەستمان خودی ئەوەیە کە لە سەردەمی ئیسلام دا هەبوو، ئەم دڵنیاییە مەرجی بنەڕەتی ڕاستی بەراوردی نێوان دەقی قورئانو مەعریفە سەردەمیەکانە.

**سێیەم:** لێرەدا لایەنێکی گرنگ هەیە دەکرێ لە بەراوردی نێوان دەقەکانی قورئـان و تەوراتی پەیوەست بە خەلق لەسەر بنەمای دیدی گشتی نوێ سـەبارەت بـە خـەلق و دیدێ قورئان بـەکاربێت، ئـەو هەڵانـەی لـە تـەورات دا بـەدییان دەکـەین لـە قورئـان دا نایانبینین، ئەمەش تێبینیە کە بە یەکجارەکی ئەو ئەگەر و ڕاسەپێنیە لـەناودەبات کـە لە ڕۆژئاوا دەرکەوتووە و بەڵگەی پێ نیە و کرۆکی ئەو ئەگەرەشـی ئەوەیـە ئـەوەی لـە قورئان دا هەیە لەوانەیە مرۆڤ لە تەوراتەوە وەریگرتبێ و لەوێ دایینابێ.

**چوارەم:** هەموو ئـەو زانیاریانـەی قورئـان سـەبارەت بـە زەوی پێشکەشی کـردوون بەتایبەت بازنـەی ئـاو لـە سروشـت و چـەمکی گرنگـی زانسـتە سروشـتیەکان و لـەدایك بوونی مرۆڤ. هەموو ئەو ئایەتانە ئـەو ڕاسـتیە لای هـەموو کەسـێکی مـەوزوعی نیازپـاك ئەچەسپێنن کە هەرگیز ناگونجێ مرۆڤ لە سەردەمی دابەزینی قورئـان دا هـەر لـەخۆوە ئەو قورئانەی دەربڕیبێ و دایینابێ.

**پێنجـەم:** بـەراوردی نێـوان چـەند دەقێکـی قورئـانی و تـەوراتی (خـەلق، لافـاو، دەرچوونی موسا لە میسر) ڕاستی و سەلامەتی قورئـان دەردەکـەوێت. سەبارەت بـە لافاوەکە ئەوا تەورات ماوەکەی بە کاتێ دانـاوە کـە تیایـدا هـیچ ڕووداو و کارەسـاتێکی کـەونی لەبـەر چـەند هۆیـەکی تـەواو ڕوون ڕوویـنـەداوە، کـە لـەم سـەردەمەی ئێمـەدا بەڕوونی ئەوە زانراوە، لەکاتێك دا ئەو چـیرۆکی لافـاوەی لـە قورئـان دا هـاتووە و وەك سزای خوای دادەنێ بەسەر گـەلی نـوح دا بـەهۆی بێبـاوەڕ بوونیانـەوە مـاوەو کـاتێکی دیاری نەکردووە، لەو دیدەوە هیچ ڕەخنەیەکی لێ ناگیرێت. دەی ئایا خەڵك لەو مـاوەدا کە چیرۆکی تەورات تیا دانراوەو لەو ماوەش دا قورئان دابەزیوە توانیویەتی مەعریفـەی مرۆیی بگەیەنێتـە ئاسـتی زانیـاری هاوچـەرخ لـەو بـوارەدا. بـە دڵنیاییـەوە مرۆڤایـەتی ئەوەی پێ نەکراوە. دەی ئیتر چۆن کەسێك ئەگەر ڕاستە گوایە ئەو قورئانی داناوە– دەکرێ هەموو ئـەوەی عـەقڵی سـەردەمی نوێیش قبـوڵی ناکـات لـەو ئاسـتی سـوود و

زانیاریە گرنگانەدا بێ و ڕووداو و هەواڵێ بێنێ کە هیچ ڕەخنەیەکی لە دیدی زانستیەوە بەرەو ڕوونەکرێتەوە.

هەروەها ئەمە بەڵگەیە بۆ ڕاستی چەندین بابەتی تری ناو قورئان کە هەر دەبێ دان بنێین بەوەدا ڕاڤەیەکی جیا لە ڕاڤەی مرۆییەو تەنها سروشی خواییەو هاتووە بۆ ڕاستکردنەوەی هەڵەی خەڵك لە دارشتنەوەی کتێبە ئاسمانیەکان دا.

شەشەم: نەگونجانێکی ڕوون و زەقی نێوان تەوراتی سەردەمی کۆن و سەردەمی نوێ لەنێوان دەقەکان و زانیاریە نوێکانی دا بەو جۆرەی ئەوەی لەو کاتەوەی بە چەمك بۆمان هاتووە و ڕەوتی بێگومانی گرتووەتە بەر تا ئەو کاتە دەق و دارشتنی تەورات و گەیشتنی پێمان دەخاتەڕوو. لێرەدا دەردەکەوێ مرۆڤ تەواو گەمەی پێکردووە و زۆربەی دەقەکان نوسینی لەباری کاتێن وەك چیرۆکی پێکهاتەی کەهەنووتی. لەو بارودۆخەدا چەند بارێ هەن کە لەگەڵ زانیاری هاوچەرخ دا بە تەواوی ڕاڤەیان ناتەبایە.

بەڵام قورئان شتێ لەخۆ دەگرێ کە زانست ناتوانێ بەرپەرچی بداتەوە، چونکە وتەو فەرمایشتی ڕوداوی چەسپاو و دڵنیان و شیاوی گۆڕان نین، هەروەك ژمارەیەك زانیاری ناو قورئان تەنها لەم سەردەمەدا لێیان تێدەگەین، بۆیە لێرەدا بەراوردی نێوان کتێبی پیرۆز و زانست دیدێکی ترمان پێ دەنوێنێ و هیچ دەرفەتێ نیە بۆ جیاکردنەوەیان لە یەکتر.

گشتگیری قورئان لە هەموو ئەو دەقانەدا ڕووداوی گرنگ و جێ باسی وان کە لەم سەدەی بیستەمەدا بەهۆی زانیاریە نوێکانەوە دیدێکی نادیار دەخەنە ڕوو کە تا ئێستاش نەزانرا بوون، ئەمە وا دەکات ڕامێنین لەم ئایەتە پیرۆزە.

﴿كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمْ آيَاتِهِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ﴾

## *قورئان لە دیدی مۆریس بۆکایەوە:

دکتۆر مۆریس بۆکای لە وەڵامی قەشە (ریناس)ی فەڕەنسی دا کاتێ بانگەشەی ئەوەی کردووە قورئان ڕەوانبێژی تیا نیە و فەساحەتی کەمە بەم جۆرە وەڵام دەداتەوە: بەڕاستی بەو قسەی میسۆریناس شڵەژاو و نائارام بووم کە دەڵێت قورئان ڕەوانبێژی و بەلاغەتی نیە. چونکە ئەگەر بۆ کەسێکی نا موسڵمان دروست بێ گومانی هەبێ لە ڕاستی و دروستی قورئان ئەوا هەرگیز بۆی دروست نیە گومانی هەبێ لە ڕاستی دەربڕین و بوونی لوتکەی قورئان لە ڕەوانبێژی و بەلاغەت دا. هەرکەس وا نەبێ هەڵەیە، بەڵکو تۆمەتبارە لە نیاز پاکی دا، ئەگەر حەز دەکەیت دەڵێم گومان لە عەقڵیشی هەیە، ئەگەر قورئان سیفەتێکی بێ قبووڵی کەموکورتی هەبێ ئەوە لە ڕەوانبێژی و بەلاغەتی موعجیزانەی قورئانن کە تایبەتمەندیەکی قورئانەو سەدان ملیۆن مرۆڤ شانازی پێوە دەکەن، چونکە لە ڕووی بەهێزی بەلاغەت و تەواوی واتایەوە بەسەر هەموو کتێبە ئاسمانیەکانەوەیە. بەڵکو دەکرێ بڵێین قورئان گەورەترین کتێبی عینایەی ئەزەلیە بۆ مرۆڤایەتی قورئان بیرێ ئەشید لەخۆ دەگرێ لەبرێ ئەشیدی فەلسەفەی یۆنان تا مرۆڤەکان بەختەوەر بکات. لەنێو ئەو پەڕاوەدا ستایشی داهێنەری ئاسمانەکان و زەوی و بەرز و باڵا ڕاگرتنی ئەو خوایە هەیە کە هەموو شتێکی دروست کردووەو ڕێنمونی دروستی داوە بە هەموو شتێ. قورئان وەك کۆڕبەندێکی زانستی زانایان و ئینسکلۆپیدیای زمانەوانی و ڕێزمانی وایە بۆ هەر کەسێ بیەوێ زمانی ڕاست ڕابێنێ. کتێب و عەوزە بۆ شەیدایانی شیعرو پوختەی هەست و سۆزەکان و ئینسکلۆپیدیایەکی گشتی شەریعەت و یاساکانەوە، چی کتێبی ئاسمانی لەپێش ئەودا هاتووە ناگاتە ئاستی بچووکترین سورەتی قورئان لەڕووی واتای جوان و یەکانگیری دەربڕینەوە، موسڵمانان بەو قورئانەیانەوە بێباکن لە هەموو کتێبێ و بەبوونی ڕەوانبێژی و بەلاغەتی قورئان بێباکن لە هەموو ڕەوانبێژی و بەلاغەتێکی تر.

یەکەمین تایبەتمەندی و پایەی بنەڕەتی قورئان بریتی یە لە ڕاستی و دروستی واتاکانی و کتێبێکی بێگومانە و هەستی دروست و ڕاستگۆیانە و نیازی بەرزو پیرۆز لەخۆ دەگرێ کە لە فەزڵی قورئان دا دەردەکەوێ، گەورەترین فەزڵێ کە سەرەتا و کۆتای فەزڵەکانە لە کتێبێك دایە کە هەموو فەزڵەکان لەخۆ دەگرێ. بۆکای کۆمەڵێك ڕاستی دەخاتە ڕوو:

یەکەم: کتێبە مەسیحی و جوولەکە دانراو و ناسراوەکانی ڕۆژهەڵات کە بە تەورات و ئینجیل ناسراون لەڕووی ڕاستیانەوە لەگەڵ قورئان ناتەبانین، قورئان لە دڵی قورئان خوێنانیدا لەبەرکراوە وەك دابەزی بۆ سەر موحەممەد (ﷺ) و لە سەردەمی پێغەمبەردا بەش بەش بە جیاجیا نوسرایەوەو دواتر لە سەردەمی خەلیفەکانی دا کۆکرایەوە، ئیتر کەس ناتوانێ گومانی هەبێ لە هیچ دەقێکی قورئان و بەڕاستی کتێبی دابەزیوی ئاسمانیە. تەورات و ئینجیلیش لەڕووی ڕاستی تەواوەوە لەئاست قورئان دا نین، لەوانەیە بگونجێ بیانچوێنین بە فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) کە لە مەسەلە ئایینیەکان دا لێوەی گێردراونەتەوە، لەوانەش برێ فەرمووده صەحیح و برێ مەوزوعن‌و برێکیان گێرەرەوەکان شتێ دەستکاریان کردون، بەڵام گەورەکانی کڵێسا وایانکردووە خەڵکی بڕوا بە هەموو دەقی ناو تەورات و ئینجیل بکەن و لەڕووی دروستیەوە جیاوازی نەکەن لە نێوانیان دا.

دووەم: لە تەورات دا چەندین بەش هەن پڕن لە باس و هەواڵی چەند ڕووداوێکی کەونی کە زانست پووچی ئەوانەی نیشان داوە. هەواڵە زانستیەکانی ناو تەورات و ئینجیل کەمن. بەڵام لە قورئان دا زۆر زۆرن و قورئان چی هەواڵی هێناوە زانست ڕاستییان دەسەلمێنێ. جوولەکە دەڵێن ئادەم یەکەم کەس بووە لە گەردوون دا دەرکەوتووە. خراوەتە خوارو لەماوەی (٥٧٣٨) پێشترەوە گەیشتووەتە سەر زەوی لە کاتێك دا بەڵگە زانستیە چەسپاوەکان پێچەوانەی ئەوە دەڵێن و مرۆڤ زۆر پێش بەوە لەسەر زەوی دا بووە.

سێیەم: بەبۆنەی تێپەڕبوونی سەد ساڵ بەسەر مردنی داروِن فانای ئەیاری داروینی ئەوەی داروین وتی هەڵەی ناو هەڵە بوو، ئەو لەسەر هیچ دۆزینەوەیەك لە بیردۆزەكانی خۆی دانەمەزراندووە كە جەخت بكاتەوە لە پەیوەندی نێوان مرۆڤ و ئەو ڕەچەڵەكانەی دایهێناون. ئەوانە چەند ئەگەرێكی هەڵەن كە كەسێ داینـاون بـڕوای بـە ماددیگەرایی هەیە، بەڵكو داروین دەزانێت هەڵەیە و زۆربەی زانایانی ماددیگەراش چەندین ئەگەریان داناون كە بەگشتی هەڵەن، ئەوان ئـەوە دەزانـن بـەلام بۆیـە وایانكرد چونكە ماددین، ڕەخنـەی هەنـدێ لـەو زانایانـەم لـەو بوارەدا هەیـە و هەشـیانە خـەلاتی نۆبلی هەیـە. سـەردانی بـاكور و ڕۆژئـاوای ئـەفریقام كـرد و دەیـان بابـەتم لەسـەر بنـەڕەتی مـرۆڤ و قورئان‌و ئینجیل و زانست پێشكەشی كرد، بـۆ نمونـە تـەنها لـە دەكـار دوای كۆڕەكـان دەیان خوێندكار دەهاتن و قسەیان لەگەڵ دەكردم، چونكە شـتانێكی زۆریـان دەزانـی كە وای لێكردبوون بڕوایان هەبێ بە هەرچییەك كە قورئان دا سەبارەت بە بنەڕەتی مرۆڤ هاتووەو ئەوەش بە شێوەیەكی گشتی لە زانستەكان دا هەیە. هەندێكیان لەبەردەم من دا دانی بەوەدا دەنا كە لە باوەرەكەی دا دوو دڵ و ناجێگیرەو ئێستاش بـاوەڕی هێنـاو چەسـپاو بـوون و دڵئارامانـە نوێـژ دەكـات، هـەموو ئەمـەش بـەهۆی ئـەو زانیاریـە ناڕاستانەوە بوو بوو كـە هەنـدێ زانـا پێشكەشیان كردبوون، هێنـدە بەسـە هەركـەس بیانخوێنێتەوە وا دەزانێت ئەوانە ڕاستی بێگومانن. لە كتێبەكەم دا (ڕەچـەڵەكی مـرۆڤ) هەوڵمداوە كە چەند دەربڕینێكی سادەدا دەربڕینی زانست بخەمە ڕوو، هـەروەها باسـی ئایدۆلۆجیاكانم كردووە، ئەوانەی زانایان لەپشتیانەوەن و ئەرزیەتی بنەڕەتیە لەدەسـت دەدەن كـە لەسـەری وەسـتاوە. كاتـێ داروین لـە سـاڵی ١٨٥٩ز. دا كتێبەكـەی خـۆی (بنـەڕەتی جۆرەكـان) بڵاوكـردەوە و ئامـاژەی بـەوە كـرد ئاژەڵـەكان دەتـوانن لـەنێو جۆرەكان دا سەر هەڵبدەن بەڵگەی زانستی بۆ ئەوە نەهێناوە كە مرۆڤ دەدرێتەوە پـاڵ مەیمون، بەلام كەسانێكی تر وتەكەیان گۆڕیوە و چەندێكیان بۆ زیادكردووە بێ ئەوەی

ڕەخنەیان لێ بگیرێ و بانگەشەیان وایە مرۆڤ لە بنەڕەت دا مەیمون بووە. مشتومڕێکی دیار لەنێوان قەشەکان و هەوادارانی داروین لە ئینگلتەرا هەبوو کە هەر کامێکیان سوکایەتی بەوەی تر دەکرد، بە ڕوانینە ئەو بڕیارە دەبێ جیاوازی بکەین لە نێوان ڕاستی وتەی زانست و ئەوەی هەندێ زانا لەڕێی ئایدۆلۆجیاوە بڵاوی دەکەنەوە.

## * لە نێوان کتێبی پیرۆز و قورئانی پیرۆزدا:

دکتۆر بۆکای بەراوردی چەند ناوەڕۆکێکی نێوان کتێبی پیرۆز و قورئانی پیرۆزی کردووە و دەڵێت: کتێبی پیرۆز نا موسڵمانان لەڕێی چەند کەسێکەوە لە چەند ماوەیەکی جیاوازدا نوسراوە، نمونەی یەکەمی دابەزینی سروشی ئاسمانی کە لە کتێبە ئاینیە ئاسمانیەکان دا شوێنەوارێکی بەدی دەکەیت کتێبی سەردەمی کۆن (یەهوا)یە کە لە نێوان سەدەی نۆ و دەی پێش زاینی دا نوسراوە. وەك ئەمڕۆ دەزانین ئەو کتێبە تەواو کورتەو نازانین ئەوە لە سەردەمێکی ڕابردوودا کتێبێکی تەواوتر و زیاتر لەوە بووە یا نا. دواتر لە ماوەی سەدەی شەشەمی پێش زاین دا کتێبی سەردەمی کۆن و تایبەت بە صەلاحیاتی قەشە (ساکردونال) دەرکەوت کە بە سەرەتای هەموو ئینجیلەکانی ئەمڕۆ دادەنرێ، تیایدا چیرۆکی دروست بوونی کەون و دەرکەوتنی مرۆڤ لەسەر زەوی و ئەو ڕووداوانە هاتووە کە باسکراون لەگەڵ مەسیحیەت دا ئینجیلەکان هاتوون، بەڵام لە مەسەلەی دروست بوونی مرۆڤ دا ئەوا کتێبی سەردەمی نوێ ئاماژەیەکی زۆر کەمی پێ دەدات و تەنها هێنانەوەی وتەی سەردەمی کۆنە (وەك لە ئینجیلی سبینت لوك دا هەیە) دوای ئەوەی سروشی قورئان دەرکەوت زانیاری و وردەکاری زۆر گرنگی لەسەر مرۆڤ پێشکەش کرد کە لە دوو کتێبی پێشوو دا ئەوە بەدی ناکەین. زیاتر لەویش قورئان هەڵە لەخۆ ناگرێ لە کاتێك دا لە ئینجیل دا هەڵە هەیە، هەڵەکانی کتێبە پیرۆزەکان دەگەڕێنەوە بۆ ئەوەی ئەو کەسانەی بە ئیلهامی خۆیان نوسیویانە ڕەنگدانەوەی چەمك و واتای زاڵی سەردەمی خۆیانیان نوسیوە.

ئەوان بەپێی چەمك و واتای سەردەمی خۆیان و ئەفسانەكانی ئەو كاتە باسی بوون و دروست بوونیان كردووەو بە ڕێنمایی خواییان داناون، هەریەك لە ڕاڤەكەرانی كاسۆلیك و پرۆتستانتی لەسەر ئەوە كۆكن، كڵێساكەش ئەوەی چەسپاند، بەڵام كاتێ كۆنگرەی دووەمی ڤاتیكان لە ڕاگەیاندنی خۆی سەبارەت بە سروشی خوایی هەردوو كتێبی (سەردەمی كۆن و نوێ) دەقی خۆی دەربڕی وتی: هەندێ لە ئینجیلەكان كەموكورتیان تێدایە، بەڵام قورئانی پیرۆز وا موسڵمانان پێمان دەڵێن پەیامی خوایەو لەسەر دەستی موحەممەدی پێغەمبەری– لەڕێی جبریلی فریشتەوە نیشانی داوە. دوای ئەوەی لێكۆڵینەوەم لەسەر كرد هیچ هەڵەیەكی زانستیم لە قورئان دا بەدی نەكردو زانیاریەكانی ناوی زۆر لەسەرو ئاستی مرۆڤی پێش چواردە سەدەوەن، ئەمەش جەخت لەوە دەكاتەوە كە سروشی خواییە. لەو كاتەدا مرۆڤ ئەگەر هەڵكەوتەی سەردەمەكەی و زاناترین كەسیش بوو بێ نەیتوانیوە وێنەیەك لە ڕاستی زانستی ناو قورئان بێنێ بەجۆرێ لەگەڵ سەلماندنە نوێكانی زانستی ئەمڕۆدا بگونجێ. ئەوەی ئینجیل دەیڵێ بەوەی جۆرەكان چەسپاو و نەگۆڕن ناگونجێ. بەڵام قورئان باسی لە گۆڕانی مرۆڤ دەكات بەپێی سەردەمەكان.

## * ئەفسانەی جەستەی خودایی:

بارەكە تەنها لەو نوسینەی پیاوانی لاهوت و نوسینی دكتۆر بۆكای لەسەر ئینجیلەكان و بیردۆزەی داروین دا نەوەستاوە، بەڵكو خۆی لەو لێكۆڵینەوە بەرچاوەشدا دەبینێتەوە كە لە ساڵەكانی دوایی دا لەژێر ناونیشانی ئەفسانەی جەستەی خوایی دەركەوت و ژمارەیەك تایبەتمەندی زانستی لاهوت لە دیارترین زانكۆكانی بەریتانیا نوسییان و لە ساڵی ١٩٧٧ز.ەوە بۆ یەكەم جار دەركەوت و بۆ جاری شەشەم لە ساڵی ١٩٨١ز. دا چاپ كرایەوە، تیایدا چارەسەری بیروباوەڕی لاڕێی

سیانە خودایی و ئەو بانگەشانەی سەر بەو بیروباوەڕە دەکات گوایە عیسا خوایەکی جەستە مرۆیی بووە خوا بەدوورە لەوەی دەیڵێن- ئەو کتێبە شڵۆقیەکی گەورەی مشتومڕی بیروباوەڕی وای لێکەوتەوە کە بەریتانیا نمونەی وای نەدیوە. ئەنجوومەنی کڵێسای ئینگلیزی داوای کرد زۆربەی نوسەرانی کتێبەکە لە پۆستە ئایینیەکەیان لابرێن چونکە بەو بڕوایەیان لە مەسیحیەت دەرچوون.

دکتۆر ئەحمەد عەبدولحەمید غوراب لە وردەکاری خستنەڕووی کتێبەکەدا دەڵێت دیارترین هۆکاری پێشوازی لەو کتێبە بەکارهێنانی وشەی ئەفسانە (myth)بوو کە ئەوە دەنوێنێ ئەو بیروباوەڕە ئەفسانەیە و لەگەڵ حەق ناگونجێ و عەقڵ قبوڵی ناکات، بەڵکو بیرۆکەیەکە سەر لە خەڵك دەشێوێنێ، لێکۆڵەرەکان داوا دەکات لە بیروباوەڕی جەستەی خوایی دەرباز بن چونکە ئەوە ڕاست نیە، لەمەوە ئەوە دەرکەوت کە گومان لە بیروباوەڕی لاڕێی مەسیحیەت کە دانانی مەسیحە بە خوا گومان بوونێك بوو کە لە سالآنی دوایی دا لەنێو مەسیحیەکانی ڕۆژئاوادا تەنانەت لە نێو زۆر ئایینیەکانیشیان دا دەرکەوت، بۆیە هێشتا نازانن چۆن دەروازەیەکی ڕزگاری لەو گومانانە بدۆزنەوە کە شەرمەزاری کردون و لە دەروونیان دا سەبارەت بە مەسیحیەت کەڵەکە بوون.

ئەو زانایانەی بەشداربوون لە دانانی کتێبەکەدا لە کەسە دیار و باڵاکانی بواری لاهوت بوون:

- دکتۆر مۆریس ویلز: سەرۆکی گرنگترین لیژنەی کڵێسا (لیژنەی بیروباوەڕ).
- دکتۆر تسیفهام: مامۆستای لاهوت لە زانکۆی کامبریج.
- دکتۆر هولدن: ڕاگری کۆلیژی (یدرن) تایبەت بە لێکۆڵینەوە لاهوتیەکان.

- دکتۆر جۆن هیك: زانکۆی پەرمەنگەهام (سەرپەرشتیاری گشتی کتێبەکە).
- دکتۆر دۆن کیوبیت: مامۆستای لاهوت لە زانکۆی کامبریج.

کۆڕبەندەکە دوای دەرکردنی کتێبەکە ئەم بڕیارانەی دەرکرد:

یەکەم: نوسینەکەیان پەرت بوونی پلە بەندی هەموو لایەن و سەرچاوەو بیروباوەڕی مەسیحیەتی لێدەکەوتەوە بەتایبەت سەبارەت بە ڕاستی ئینجیلەکان و خوایەتی مەسیح.

دووەم: نکوڵی دەکا لەڕاستی (جەستەی خوایی) واتە نکوڵی لە بیروباوەڕێکی بنەڕەتی ئایینی مەسیحی کە ئیمانی مەسیحی لەسەر وەستاوەو زانستی لاهوتی لێدەبێتەوە.

سێیەم: ئەوان پێچەوانەی بیروباوەڕە سەرەکیەکانن وەك ئەوەی کۆڕبەندی (خلقیدونی) کەلە ساڵی ٤٥١ز. بەسترا بڕیاری لەسەر داو بڕیاری دا مەسیح دوو سروشت ویستی هەبێ: مرۆیی و خوایی.

چوارەم: ئەوان مەسیحیەتێکیان هێنا بۆ خەڵك جیا لەوەی هەموو مەسیحیەکان لەسەری دەڕۆن.

## * مەسیح مرۆڤێکی نێردراوی خوایە:

لێکۆڵینەوەکە ئاماژە بەوە دەکات مەسیحیەت لەماوەی مێژووی دوورو درێژی دا دوزاری گەشەسەندن و گۆڕانی بەردەوام بووە بەتایبەت لە بیروباوەڕی دا، بۆیە زانستی لاهوتی تیایدا چەندین گۆڕانی بەسەردا هات لە ئەنجامی ئەوەدا کڵێسا بە چەند ماوەیەکی جیاجیای مێژوویی دا تێپەڕیوو و چوو بەدەم چەند بارێکی تەواو جیای ڕۆشنبیریەوە. لەسەدەی نۆزدەدا وەك وەلام و بەدەمەوە چوونی پێشکەوتنی

مەعریفەی خەڵك بەگشتی و پێشکەوتنی زانستەکان بەتایبەت مەسیحیەتی ڕۆژئـاوا دوو بنەمای نوێی قبوڵ کرد:

**یەکەم:** مرۆڤ بەشێکە لە سروشت واتە مرۆڤ لـە بازنـەی گەشـە سـەندنی شێوەکانی ژیان لەسەر زەوی دا دەرکەوتووە (قبوڵ کردنـی ئـەو بنەمایـە واتـە مەسـیحیەتی نـوێ بیردۆزەی داروینی سەبارەت بە پەرەسەندن قبوڵ کردووە، هەرچەندە ئـەو بیردۆزەیـە لەگـەڵ بیروبـاوەڕی دروسـت کردنـی مـرۆڤ لەلایـەن خـواوە ناگونجـێ بەشـێوەیەکی جەوهەریش جیاوازە چونکە خوا لە ڕۆحی خۆی بە بەردا کردووە بەمـە لـە ئـاژەڵ و لـە ماددەش جیا دەبێتەوە.

**دووەم:** سەردەمی نوێ (کە بە چوار ئینجیلەکە دەست پێدەکات مرۆڤـی جیـاوازی بـاری جیـا لـە سـەردەمی مەسـیح دایاننـاوە. دواتـر نـاکرێ بەڵگـەی سروشـتی خـوایی بدرێتەوە پاڵ. کڵێسا پـاش بەرەنگاربوونەوەیـەکی سـەخت ئـەم دوو بنەمایـەی قبـوڵ کرد، هێشتا مەعریفـەی مرۆیـی و زانسـتەکان لـە گەشەسـەندن و پێشکەوتن دا ڕوو لـە زیاد بوون بەردەوامن. بۆیـە بـەردەوام مەسـیحیەت بـەر فـشاری سـەختی وا دەکـەوێت ناچاری دەکات ملکەچی بارە گۆڕاوەکان بێت.

دانەرانی ئەو کتێبە دان بەوەدا دەنێن گۆڕانێکی گـرنگ لـە بیروبـاوەڕی مەسـیحی دا ماوە لەم بەشەی کۆتایی سـەدەی بیسـتەم دا ڕووبـدات و پێویسـتی بـەو گۆڕانـەش لـە گەشەسەندنی مەعریفەی بنەڕەتی مەسیحیەتەوە سەرچاوە دەگرێ و ئەوە دەگرێتـەوە دان بنێن بە مرۆڤ بوونی مەسیح دا، وەك لە سـەردەمی نـوێ دا وەسـف کـراوە (چـووە لای خوا بەڵگە دەهێنێتـەوە) واتـە خـوا بـە مـەعجیزەو بەڵگـە بـۆ پاڵپـشتی پـشتگیری دەکات، ئەم وەسفە بەڵگەی ئەوەیە مەسیح مرۆڤێکە و خوا ناردوویـەتی و بـە بەڵگـەی موعجیزە پشتگیری کردووە تـا وەك پێغەمبـەری خـوا لـە بازنـەی ئامـانجی خـوایی لـە دروست کردنی مرۆڤ دا ڕۆڵی خۆی بگێڕێ. ئەمەش واتە دانانی مەسـیح لـەم دواییانـەدا

بە خوا کە لە پەیامی مەسیحیەت دا بە خوای شێوە چوواندوو بە مرۆڤ دا دەریدەبڕێ ڕاست نیەو پێویستە بزانرێ ئەوە ئەفسانەیە و تەنها ڕێگەیەکی ڕەمزیە بۆ دەربڕینی گرنگی مەسیح. سەبارەت بە مەسیحیەکان لێرەوە نوسەران داوا دەکەن لەو بیروباوەڕە ڕزگار بن و وەك ئەفسانەیەك سەیری بکەن، لەوەش دا یەك کەسیان پێچەوانەیانە (دۆن کیوبیت) ئەو تاکە کەسە داوا دەکات بەتەواوەتی لەو بیروباوەڕە دەرباز بن و فرێی بدەن، بێگومان مەترسی ئەو بیروباوەڕە دەبێتە هۆی بیرۆکەی ئیتیحادوحلول.

لێکۆڵەران پێیان وایە بڕوای خوایەتی مەسیح بۆ مەسیحیەت پێویست نیە و شتێکی گرنگ و جەوهەری نیە و لەسەر بیرۆکەیەکی هەڵە دامەزرێنراوە، ئەویش ئەوەیە گوایە عیسا کوڕی خوایە و باوکیش وێنەی کوڕی نیشان داوە. بۆیە لەچەند ڕوویەکەوە ئەو بیروباوەڕە هەڵەیە. گرنگترینیان ئەوەیە تەنانەت لەو ئینجیلانەش دا کە مرۆڤ دایناون بنەڕەتێکی ڕاشکاویان نیە چونکە لە قۆناغی دواتری دەرکەوتنی مەسیحیەت دا بووە، بۆیە نابینی لە سێ ئینجیلی یەکەم دا بەڕاشکاوی باسکرابێ (مەتا و مەرقص و لۆقا) تەنانەت لە ئینجیلی یوحەنناش دا کە بە نزیکترین ئینجیل دادەنرێ بۆ بیروباوەڕی جەستەی مرۆیی خوایەتی عیسا بەو جۆرە باس نەکراوە کە لە سەردەمانی دوای دەرکەوتنی مەسیحیەت دا دەناسرێ.

کڵێسا لە ماوەی مێژووی دوورو درێژی دا هەرچەندە هەوڵی دا وێنەیەکی مەعقول یان گونجاو یان لەبار بۆ مەسیح بخاتە ڕوو بەوەی مرۆڤێکی تەواو و خوایەکی تەواویش بێ کەچی سەرکەوتوو نەبوو، دەبینین لە زۆربەی هەوڵەکانی دا بۆ سەلماندنی خوایەتیەکی مرۆڤبوونی مەسیح دەکات قوربانی و دواجار وا مەسیح نیشان دەدات کە وەك مرۆڤ نەبێت. هەروەها کڵێسا و زانایانی لاهوت نەیانتوانی بە متمانەوە ئەوە پێشکەش بکەن کە زانستی مەسیحی مرۆڤ بەشداری زانستی خواییە لە زانینی هەموو

شتێك و توانا بوونی بەسەر شتەکان دا. چونکە ئاراستەی کڵێسا لە یەك کات دا مرۆڤ و خوایەتی مەسیح نیشان دەدات ئەمەش بەڵگەیەکی مەعقول و گونجاوی نیە و چەند ئامانجێکی بێ بەڵگەی لێ دەکەوێتەوە و دواجاریش گومان دەخاتە سەر بیروباوەڕی جەستەیی خوایەتی مەسح. عەقڵ خوایەتی و مرۆڤبوونی مەسیح پێکەوە قبوڵ ناکات بەڵکو تەنانەت ناتوانێ وێناشی بکات. بیروباوەڕی یەکخواپەرستی تاکە بەدیلی هەموو بیروباوەڕێکی شیرك و بتپەرستیە. ئەمەش واتە ئەوەی لە قورئان دا هاتووە ڕاست و بێگومانەو مرۆڤایەتیش بەرەبەرە ڕووەو ئەوە دەچێت دوای ئەو نۆزدە سەدەیەی بارگرژی نێوان تێگەیشتنی پەیوەندی نێوان مەسیحیەت و ئایینە ئاسمانییەکانی پێش خۆی و ئیسلام ئیتر باوەڕ بهێنێ، سەبارەت بە چەمکی پوختی یەکخواپەرستیش کاتێ دەبینین هێشتا چەمکی بەخوادانانی مەسیح زیاد لە هەزار ساڵە زاڵە وا ڕووەو داکەوتنێکی زۆر کەم دەچێ سەرسام دەبین چونکە بتپەرستی لە ڕۆژئاوادا هەزار ساڵە ڕیشەی داکوتاوەو زاڵە.

کاتێ ئەو کتێبە دەخوێنینەوە کە دەنگدانەوەی زۆری هەبوو (مەسیحیەت سەرهەڵدان و گەشەسەندنی) لە نوسینی دکتۆر جیبنتری سەرۆکی بەشی ئایینەکان لە زانکۆی پاریس کە دکتۆر عەبدولحەلیم مەحمود وەریگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی دەبینین ئەو لێکۆڵەرە دوای لێکۆڵینەوەیەکی نیو سەدەیی گەیشتووەتە چەند ئامانجێکی دڵنیا. ئەو ئامانجانە لەگەڵ بڕیارەکانی قورئان دا دەگونجێن، لێکۆڵەر ئەمانەی ڕوون کردووەتەوە:

١- مەسیحیەتی مەسیح (علیه السلام) زۆر سادە بووەو سەید مەسیح یەکخواپەرستی ڕاگەیاندووەو جەختی کردووەتەوە لەوەی ئەو بەندە و نێردراوی خوایەو بۆ ڕاستکردنەوەی سەر شێواوانی بەنی ئیسرائیل نێردراوە و پەیامەکەی تایبەت بووە بە بەنی ئیسرائیل و بانگەوازەکەی ڕەحمەت و سۆز و خۆشەویستی و

سۆز نواندن بووە بەرامبەر بە ماددیگەرایی زاڵی ئەو کات کە جولەکە پێی گەیشتبوون. مەسیح هەرگیز نەچووەتە ناو وردەکاریەکانی بیروباوەڕو سەبارەت بە شەریعەت قسەی نەکردووە.

٢- نەسرانیەتی ئێستا بە هەموو بۆنە و بیروباوەڕو دروشتەمەکانیەوە بەتەواوی نامۆو دوورە لە پەیامی سەید مەسیح و نەسرانیەت وا لە ڕاستی خۆی جیا دەبێتەوە لەو کاتەوەی قدیس پۆلس چووەتە ناوی بیروباوەڕی کوڕێتی مەسیح گەورەترین هەڵەی وەرگێڕانی وشەی بەندەی خوا بووە کە سەید مەسیح زۆر دەیوتەوە. چۆن پۆلس بەندەی خوای وەرگێڕاوە عبدالله: منداڵ یان خزمەتکار. پۆلس وتەی منداڵی خوای هەڵبژاردووە، ئەمەش گۆڕانێکی ڕیشەیی بوو بە بیرۆکەی ئایینی و دانانی خواو وێنا کردنی لە فەلسەفەدا بەگشتی و لە ئایینی نەسرانیەت دا بەتایبەتی.

نوسەر وەك زانایەکی مێژوو لە نەسرانیەت دواوە نەك وەك زانایەکی ئایینی و دوور بووە لە هەر کاریگەریەك و بەپێی واقعی مێژوویی لە بابەتەکە کۆڵیوەتەوە.

٣- بیرۆکەی پێغەمبەرایەتی: دەڵێت وێنەکاری خوا دەبێ ئەو وێنە بێ بەتەواوەتی کە ماڵی پێبدات ئەو وێنەش فەیلەسوفەکانی وەك ئەفلاتون و ئەرستۆ و چەندێکی تر وێنایان کرد. دەی کەماڵ و تەواو نابێ منداڵی هەبێ و بۆ بەدیهاتنی کەماڵەکەشی پێویست بە هیچ منداڵێکی ناکات چونکە تەنانەت ئەگەر لەدایك بوو نەبێ بەڵکو مەخلوق بێ ئەو کاتە کەموکورتی دەبێ لە خوایەتیەکەی دا. ئەم مەسەلەش بۆ خواوەندی باوك (کە بیروباوەڕی ناو مەسیحیەتە) ڕووی داوە. مەسەلەی کوڕیش کە مەسەلەی دووەمە ئەوەیە بە وێنەکەی وا دانراوە یان لەدایك بوویێ یان مەخلوق. دەی هەر دەبێ پێشتر عەدەمێ هەبوو بێ. دوای عەدەمیش چی هەیە ئیدی خوایەك نابێت.

قورئانی پیرۆز ئەوەی تۆمار کردووە خوا دەوڵەمەندی ڕەهایە، ئەوەش بەدوای منداڵدایە یان منداڵ دادەنێ ئەوە هەژارەو لە سۆزو کردارو جوڵەی دا چاو لە دەستە.

دەی ئیسلام وێنەی خوای نیشان داوە، چونکە مەسیحیەت دەیویست ڕاستیەکەی ببڕێتەوەو تا ئێستاش لەو هەوڵەی دا بەردەوامە.

خوا دەفەرموێت ﴿قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ تَعَالَوْاْ إِلَى كَلَمَةٍ سَوَاء بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلاَّ نَعْبُدَ إِلاَّ اللّهَ وَلاَ نُشْرِكَ بِهِ شَيْئاً وَلاَ يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضاً أَرْبَاباً مِّن دُونِ اللّهِ فَإِن تَوَلَّوْاْ فَقُولُواْ اشْهَدُواْ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ﴾ هەروەها ﴿وَقَالُوا اتَّخَذَ الرَّحْمَنُ وَلَداً لَقَدْ جِئْتُمْ شَيْئاً إِدّاً تَكَادُ السَّمَاوَاتُ يَتَفَطَّرْنَ مِنْهُ وَتَنشَقُّ الْأَرْضُ وَتَخِرُّ الْجِبَالُ هَدّاً أَن دَعَوْا لِلرَّحْمَنِ وَلَداً وَمَا يَنبَغِي لِلرَّحْمَنِ أَن يَتَّخِذَ وَلَداً إِن كُلُّ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ إِلَّا آتِي الرَّحْمَنِ عَبْداً﴾

٤- نوسەر نکوڵی دەکات لە سیانە خودایی و دەڵێت مەسیح شتی وای نەوتووە و وەك مەسیحیەکان دەڵێن سیان یەك نیە و چ عەقڵێ وا تێدەگات سێ یەك بێ و یەك سێ بێ.

٥- ڕێوڕەسمەکان: نوسەر نکوڵی لەوە دەکات مەسیح بڕوای وا بووبێ پەیامەکەی پەرەدەسێنێ ئەو پەرەسەندنەی کە دروشم و ڕێو ڕەسم و قەشە و ڕوهبانی بۆ پەیدا بوو. ئەگەر بیروباوەڕی کوڕایەتی و سیانە خودایی لە مەسیحیەتی ئەمڕۆ دوور بگری ئەوا بەتەواوەتی کۆتایی پێ دێ نامۆتر ئەوەیە ئایینێکی وا بەردەوام بمێنێتەوە و بڵاوبێتەوەو خەڵکێ هەبێ بانگەوازی بۆ بکات. بەڵام وابەستەیی و فێربوون و شوێنکەوتەیی ئەو ئایینە لەگەڵ شیربێداندایە، ئەوکات منداڵ لەگەڵ دایك دا دەبرێ بۆ کڵێسا و بەو بیروباوەڕەوە دەگەڕێنرێتەوە، شارل گینتز ئەوەی سەلماندووە بە ئاشکرا کردنی دەقەکانی ئینجیلەکان چەند دیاردەیەك دەردەکەون.

١- ناتەبایی خودی ڕووداو و وەرگێڕدراوەکان و نەبوونی ڕیزبەندی لە ڕووداوەکاندا.

٢- هەرکام شوێن ئارەزوو و نەخشەی تایبەتی خۆی کەوتووە لە ڕێکخستنی دانەرەکەی دا.

٣- لە ژیاننامەی ئینجیل دا تێبینی ئەوە دەکرێ ناتەواویەکی زۆر و کەموکورتی مەترسیدار هەیە.

٤- ئینجیلی مەرقەس باسی لەدایك بوونی مەسیح و منداڵەکەی جیا دێنێ و ئاماژە بەوە دەدات وشەی کوڕی خوا دەربڕینێکی تەواو هەڵەی زمانەوانی ئابڕوویەرانەیە، هیچ دەقێکی ئینجیل نیە ڕێ بدات بە ڕەها باسکردنی دەربڕینی کوڕی خوا بۆ عیسا. ئەمە تەنها ئەو مەسیحیانە بەکاریان هێنا کە کاریگەریوون بە ڕۆشنبیری یۆنانی. ئەوە ئەو زمانەیە کە قدیس پۆلس بەکاری هێنا وەك ئەوەی نوسەری ئینجیلی چوارەمیش بەکاری هێنا.

شارل گینتز دەڵێت: دەقەکان هەواڵی دڵنیایی پەیوەست بە بیرکردنەوەی تایبەتی عیسامان سەبارەت بە بنەماکانی پەیامەکەی و سیفەتەکانی کەسایەتی و ئەو ڕۆڵەی بینیویەتی لەو بارەوە هەواڵی دڵنیامان پێنادەن. دەبێ هەمیشە دان بنێین بە واقعێکی ڕاست و بوونی بەرچاودا کە لە بانگەوازەکەی دا سەرکەوتوو نەبوو[1] و شوێنکەوتەکانیشی لە فەلەستین بڕوایان نەهێنا بەو پەیامەی کە دایانەوە پاڵ خۆیان و لەسەر ئەو ڕێبازە نەچوون کە ویستی پێیان بگەیەنێت، دوانزەکەش لەسەر ئەوە ڕازی نەبوون عیسا بە کوڕی خوا دابنێن و تەنها دەربڕینی خزمەتکاری خوایان بەکارهێنا، بەڵام پۆلس نازناوی کوڕی خوای پێدا و زۆر بۆ عیسا بەکاری دەهێنا،

٦- کڵێسا: شارل گینتز دەڵێت مەسیح کڵێسەی دانەمەزراندووەو باسیشی نەکردووە، ئەمەش لای هەر لێکۆڵەرێکی دەقە ئینجیلیەکان بە تەواوەتی ڕاسپتی چەسپاوە، بەڵکو جەخت لەوەش دەکەینەوە دەرفەتی پێچەوانە بنەڕەتێکی مێژوویی

---

١- ئەمە قسەی شارلەو لەوەشدا هەڵەی کردووە، بەڵکو پێغەمبەر عیسا لە گەیاندنی پەیامەکەی دا تەواو سەرکەوتوو بوو. وەرگێڕ.

قبـولکراوی بـۆ نیـە و نەسـرانیەتی سـەدەکانی ناوەڕاسـتیش ئاینـێ بـووە بـۆ بەجیهانیکردنی و پێناوێ بووە بۆ جەنگ تـا ئـایینێکی دەمـارگیری لێ دروست بـێ کـە بیانی قبـوڵ نـەکات. هـەروەها حلـولی بـێ، نەسرانیەت بوویـە پێگـەی بەیەکگەیشتنی چەندین بیروباوەڕی نا مەنتیقی بۆنەی وردی بەش بـەش کـە چـەندین هێمـای نهێنـی و کارایان لەخۆ دەگرت. لەگەڵ ئەوەش دا ڕاسـتی دووەمـی بـێ مـشتومڕ ئەوەیـە کلێـسا نەیتوانی لە ماوەی سەدەی چوارەم دا سـەربکەوێ تـا کاتـێ ئـەو ئیمانـە یەکەمینـەی شکاند کە دەکرێ بە ئیمانی یانزە حەواریەکەی ناو ببەین، ئـەو مەسـیحیەتە یەکەمینـە لە ململانێی ڕۆحـی دا تێکشکا و کلێـساش لـە ڕاسـتی دا ئـەو شکستەی قبـوڵ کـرد و هێندە ڕازی بوو بگۆڕێ بۆ بابەتێ بۆ تێڕمانی ئایینی لای باوەڕداران.

٧- ڕۆژئاواییەکان پێشتر هەرگیز مەسیحی نەبوون:

نوسـەر دەڵێـت (دەکرێـت بڵـێین ڕۆژئاواییـەکان هـەرگیز لـە سـەدەکانی دواتـردا لـە چـەمکی مەسـیحیەت تێنەگەیـشتون و ئـەو ئایینـەی لەسـەر بنەمایـەکی داڕمـاو بـە ئیجتیهادی تایبەتی خۆیان دایاننا تەواو جیاواز بوو لە ڕۆحیەت و کرۆکـی مەسـیحیەتی ڕۆژهەڵاتی کە پێش هەموو شتێ لە ڕەسیدی هزری و ڕۆحیانەوە سەرچاوەی دەگـرت و لەگەڵ سۆزو دیدیان دا ڕێی دەکرد با لە چەند قاڵبێکی دەربڕینیش دا قاڵـب درابـێ کـە بەتەواوەتی نەگونجێ، بەکورتی ڕۆژئاواییەکان ڕۆژێ لـە ڕۆژان مەسـیحی نـەبوون، ئـەو قسەش ڕاستە کە دەڵێت مەسیحیەت بوو بە ڕۆمی نەك ڕۆم بێت بە مەسیحی).

لە چەندین کۆنگرەی بـەراوردی ئایینـەکان دا ڕاسـتی و ئاشـکرابوون کـە لاڕێبـوونی ڕوونـی بـیری ڕۆژئـاوایی لـەڕووی بیروبـاوەڕەوە نیـشان دەدەن، ئـەو کۆنگرانـە گرنگترینیان کۆنگرەی سالز بۆرگ نەمسا لە ئۆکتۆبەری ١٩٨٤ز. کە تیایدا سی و پێنج

مامۆستای زانکۆی هەموو ناوچەکانی جیهان ئامادەبوون بە ناونیشانی بنەڕەتە هاوبەشەکانی نێوان سێ ئایینەکە هەموو هەوڵی خۆیان دا.

دکتۆر ئەحمەد زاهیر جین دەڵێت ئاسان نیە یەك بیرۆکەی وا بدزیتەوە کە بۆ دەروازەبوونی مشتومڕی بنەڕەتە هاوبەشەکانی نێوان سێ ئایینەکە بگونجێ، چونکە جوولەکایەتی لەسەر شەریعەتێ دەڕوا کە یاسایەکی پێچەوانەی مەسیحیەتی هەیە.بۆ ئیسلامیش هەروا، مامۆستا کەریم دەڵێت قسەی جوولەکە کە ئەوان گەلی هەڵبژاردەی خوان لە تەورات دا نیە، لەوانەیە لێکۆڵەرێکی جوولەکە هۆکاری ڕەواج پێدانی بێ).

ئەوەش ڕوون بوویەوە مەسیحیەت یان جوولەکە ئامادەیی نیە دەستبەرداری هیچ بنەما و بنەڕەتێکی خۆی بێ بەتایبەت دوای ئەوەی لێکۆڵینەوەکانی زانایانی لاهوتی هەردوو ئایینەکە ئەوەیان خستە ڕوو، تەنها ئیسلام بە توانای ویژدان و داننان لە مەسیحیەت و جوولەکەش دا دەمێنێتەوە لەکاتێك دا جوولەکە دان نانێ بە مەسیحیەت دا و مەسیحیەتیش دان نانێ بە ئیسلام دا، هاوکات ئەوەش ڕوون بوویەوە بیرۆکەی یەکێتی ئایینەکان یان گفتوگۆی ئایینەکان ئامانجێکی پیسی فێڵزانی سیاسیانەی لەپشتە بە مەبەستی خزمەت بە صەهیۆنیەت و لەناوبردنی کشانی بەرفراوان و بەردەوامی ئیسلام لە بەشەکانی سەرزەوی دا و لەپێش هەمووشیانەوە لە خاکی ئەوروپا و ئەمریکادا.

## (بە یەکگەیشتنی زانستی مرۆیی لەگەڵ قورئاندا)

لە بەرهەمی پێگەیشتووی سەردەم ئەو دۆزینەوە زانستیانە بوون کە دانیان دەنا بە ئیعجازی قورئانی لەبواری پزیشکی و زانستەکان دا، ئەمەش دکتۆر مۆریس بۆکای ئەنجامی دا. موسڵمان بوونی عەبدولا ئەرستۆی سەرۆکی بەشی ئەندازیاری ئەلیکترۆنی لە زانکۆی لەندەن لە کۆنگرەی سوننە و سیرە لە قاهیرە لە ساڵی ١٩٨٥ز. دا دەنگۆیەکی گەورەی لە جیهانی ڕۆژئاوا دا نایەوە.

دەڵێت ئەو ڕاستیە زانستیانەی لە قورئان و سوننەت دا پێش هەزارو چوارسەد ساڵ هاتوون و زانستی نوێ دەیانسەلمێنێ جەخت لەوە دەکەنەوە ئەمە پەیامی مرۆڤێ نەبووە و موحەممەد پێغەمبەری خوایە. جیهانی ئەمڕۆی ڕۆژئاوا لە تەنگژەدایە. ئەوەشی دەیڵێن یان دەیبینن ڕاڤەی تەواوی ڕاستی نیەو ئەوان دەگەڕێن بەدوای گەڕانەوە بۆ ئایین و ڕوونکاری دروستی گشتگیردا لێرەوە ئەرکەکە دەکەوێتە سەرشانی موسڵمانان تا پەیامی دروست پێشکەشی مرۆڤایەتی سەرسام بوو بکەن و مرۆڤایەتیش لێرەدا بەیەکگەیشتن لەگەڵ ئایین و زانست و دنیاو دواڕۆژو ماددەو ڕۆح دا لەوپەڕی تەواوی دا بەدیدەکات کە لە سایەی ئەمەش دا مرۆڤ بەختەوەر دەبێ.

ئیسلام وەك لە قورئانی پیرۆز و سوننەتی پێغەمبەردا هاتووە چەند ڕاستیەکی زانستی وا لەخۆ دەگرێ کە لەگەڵ زانستەکانی ئەمڕۆدا ناتەبانین، من بڕوام وایە هەموو جیهانی ڕۆژئاوا ئەو دیدەی بۆ ئیسلام نیە و ژمارەیەکی زۆری زانایانی هاوڕێی ڕۆژئاواییم ئەگەر لە ئیسلام تێبگەیشتنایە موسڵمان دەبوون، دەبێ ئەوە لەبیر نەکەین زۆربەی ئەو ئایینانەی لە ڕۆژئاوا هەن لە ڕۆژهەڵاتەوە هاتوون. بە یەکگەیشتنی زانستی مرۆیی لەگەڵ پەیامی قورئانی دا دیاردەی سەردەمەو زۆرێکی دەبینین، ئێمە لەم

سەردەمەی خۆمان دا لە ئایەتە کەونەکیەکان دا بیستنی دەنگی قورئانی و دیمەنی بەرچاوی واقعی کەونی پێکەوە گۆدەکەینەوە، لە ئەنجام دا ڕوون بوویەوە بۆمان و ئیمانی باوەڕداران زیاتر بوو و دەرکەوت قورئان حەقە.

ئەم کۆمەڵە زۆرە ڕاستیە قورئانی و پێغەمبەرایەتیانەی باسی مەخلوقات دەکەن و هاتنی زانست و پاڵپشتی بۆ ئەو ڕاستیانە وایانکرد هەست بەوە بکەم ناکرێ ئەم پەیامە هی مرۆڤێ بێ و ئەوەی پێش هەزارو چوارسەد ساڵ موحەممەد (ﷺ) هێنای جەخت کردنەوەیە لە پێغەمبەرایەتی ئەو، بۆیە موسڵمان بوونی خۆمم ڕاگەیاند. ئەم ڕاستیە زانستیە نمونەییترین ڕێگەی بانگەوازی ئیسلامیە لە ڕۆژئاوادا. شێوازی ڕۆژئاوایی بۆ بەخششی زانستەکان بڕوای وایە مرۆڤ چەند کیلۆگرامێکی دیاری کراوی پێکهاتەیە لەگەڵ عەقڵێکی ئەلیکترۆنی بچووک دا و گەردونیش ئاماژەیە بە بینراوو هەست پێکراوەکان. ئەمەش بەرەو داکەوتن چوو چونکە هەرکات شتێ ئاشکرا دەکات دەزانێت ئەو زیاتر نەشارەزایە، یاسا فیزیاییەکانیش کە دەیانزانێ بە شێوەیەکی بەرزترو لە ئاستی هەرە گەورەدا کورت و تواوەو کۆتایی پێهاتوو و تێکشکاو دەبن.

هەروەها لێکۆڵینەوەکانی زانایان ئەوەش ئاشکرا دەکەن قورئان بەجۆرێ قۆناغەکانی پەرەسەندنی دروست بوونی مرۆڤی وەسف کردووە کە پێشتر زانست نەیزانیوە (**نطفة، علقة، مضغة، مخلقة و غير مخلقة**) دکتۆر موحەممەد عەلی بار دەڵێت: شیکاری نوێی هەندێ ئایەتی قورئان بۆ وەسفی قۆناغەکانی پەرەسەندنی مرۆڤ هەر لە سەرەتاوە تا پێکهاتنی جەستە پشت ڕاست دەکاتەوە، پێش دابەزینی قورئان ئەو جۆرە تۆمارە ڕاست و تەواوەی پەرەسەندنی مرۆڤ نەبووە و چەندین سەدە پێش ئەوەی زانست ئەو قۆناغانە ئاشکرا بکات قورئان باسی کردوون.

لە ئامارژەکانی ئیعجازی قورئانی نمونەی ئایەتێکی سورەتی حەج دەهێنینەوە کە دەفەرموێت ﴿ يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِن كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِّنَ الْبَعْثِ فَإِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ثُمَّ مِنْ عَلَقَةٍ ثُمَّ مِن مُّضْغَةٍ مُّخَلَّقَةٍ وَغَيْرِ مُخَلَّقَةٍ﴾ هەروەها خوای گەورە هەواڵ دەدات کە ئەم ڕاستیانە دوای ماوەیەك ئاشکرا دەبن وەك دەفەرموێت ﴿إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَالَمِينَ وَلَتَعْلَمُنَّ نَبَأَهُ بَعْدَ حِينٍ﴾.

وەك ئیبن حەجەر دەڵێت بەم شێوە تا ڕۆژی دوایی موعجیزەی قورئان بەردەوام دەبێ و هەرچی سەردەمێ دێ تیایدا شتێ لە ئیعجازی قورئان دەردەکەوێ بەڵگەی ڕاستی قورئانە.

دکتۆر عەبدوڵا تالیز (پسپۆڕی زانستی کۆمەڵناسی) دەڵێت: زۆربەی ئەو ئەوروپیانەی موسڵمان بوون لەڕێی صۆفیەت و ئیمانەوە دەڕواننە ئیسلام، مەعریفەی ڕاستەوخۆی ناسینی خواو ڕاستی ڕۆحیەت دەکرێ لەڕێی ڕووناکی باتنیەوە بێ نەك لەڕێی بیرکردنەوەی مەنتیقیەوە. بەڵام بە ئیسلام چونکە پێگەیشتنی عەقڵی مرۆڤ و ڕێبازی زانستی واقعی ژیانی تێدایە، ئیسلام پەیڕەوو ئاکار و ڕێیەکی تەواوی تێگەیشتنی باری ژیانە، لە دیدی من دا ئەمە بەهای ئیسلامە:

ئەگەر ڕۆژئاوا لەڕووی زانستیەوە پێش کەوتووە ئەوا کۆمەڵگەی ئیسلامی هێشتا دەتوانێ ڕۆڵی زانست لە کۆمەڵگەی مەسیحی دا بنوێنێ و فێرکاریشی زۆرە، ئەمەش نهێنی بڵاوبوونەوەی ئیسلامە لەمڕۆی ڕۆژئاوادا وەك لەبەرچاو گرتنی تایبەتمەندی دینامیکی بەردەوامی ئیسلام لە بەرەنگاربوونەوەی ڕەوتەکانی ژیان دا. ئەوانەش کە ڕەخنە لە ئیسلام دەگرن بیردۆزەیان گشتگیر نیەو واتای حەقیقی کرۆکی ئیسلام نازانن، لە دەربڕینی (مەسیح کوڕی خوایە) هیچ واتایەك نیە چونکە خوا مرۆڤ نیە.

کەسی ئەورووپیش بەشێوەیەکی ڕێکخراو بەشداری هەر پەرستشێکی ئایینی نیەو لە ئەورووپادا ئایین کاریگەری بەهێزی نیە لە ژیانی خەڵک دا بۆیە ئەوان پێیان وایە خەڵکی تریش وەك ئەوان دەژین. بەڵام ئیمانەکەم هاریکارم بوو تا لە لایەنەکانی ژیان تێبگەم، ئەو لایەنانەی ئەگەر موسڵمان نەبوومایە لەوپەڕی تێگەیشتنیشم دا قۆرخ دەکرام.

## *کۆتا وەرینی گەڵاکانی پاییز:

ئێستا کاتی ئەوەیە لەگەڵ بیری ڕۆژئاواییدا بەرەنگاربینەوە، بەرەنگاربوونەوەیەك کە ئیسلام بەرامبەر بە مەسەلەی هەرە مەترسیدار پێی هەستێ کە ئەویش مەسەلەی شوێنکەوتەیی و هەوادارییە، ئیسلام لە یەکەم ڕۆژی کشانی ڕۆژئاواییەوە کە خۆی لە قەڵەمڕەوی بیانی و خستنەڕووی چەمکەکانی ڕۆژئاواو خستنە ڕوویان لە ئاسۆی بیری ئیسلامی دا دەبینیەوە وەك هەوڵی دەورەدانی بیری ئیسلامی دەرکردنی لە خودێتی تایبەت و واتا گشتگیرەکانی ئیسلام لە یەکەم ڕۆژەوە بەرامبەر ئەمانە وەستاوە، مەسەلە گشتگیرەکە دوو بەشە، بەگشتی جەنگی ئیسلامە لە چەمکی یەکخواپەرستی پوخت دا، ئەمەش مەسەلەی سێ ڕەوتە هاوردەکراوەکە بوو:

١- بیری مەسیحی و ڕۆژئاوایی.

٢- بیری مارکسی.

٣- بیری جوولەکە.

لێرەوە هەوڵی دەدا گومان بخاتە دەروونی موسڵمانان سەبارەت بە بەهاکانیان و لە ئیسلام دەریان بکات بەوەی ڕووەو چەمکی لاهوتیان ببات. ئەو چەمکەی دنیاو ئایین لە یەك جیا دەکاتەوە تا ئیسلام وەك ڕێبازی ژیان و نیزامی کۆمەڵگە دەرنەکەوێ. لە لایەکی تریشەوە داپۆشینی چەمکی دروستی ئیسلام تا خەڵکی ڕۆژئاوا نەیبینن و بیکەنە دەروازەیەك بۆ دەرچوون لە تەنگژەی ژیاری ڕۆژئاوایی.

بەڵام بزافی بێداریخوازی توانی چەمکی ئصولیەت و گەڕانەوە بۆ سەرچاوەکان بچەسپێنێ و چەمکی ئیسلامی ڕزگار بکات و بیگێڕێتەوە بۆ ڕاستی خۆی و بەرەنگاری

بیری ڕۆژئاوایش بێتەوەو لە چەمکە جیاجیا سیاسی و کۆمەلایەتی وئابووری و پەروەردەییەکانیش دا چاوی لەسەری بێ و هەڵەو کەموکورتیەکانی و دەستەوسانی و بەخششی ئاشکرا بکات. ئەم هەوڵەش کاریگەرییەکی گەورەو دیاری هەبوو و دەرگا لەبەردەم زانا ڕۆشنگەرە ڕۆژئاواییەکان دا کرایەوە تا بە دیدێکی نوێ بڕواننە ئیسلام و ئەو دیاردە بەهێزە دەرکەوێ کە ئاشکراکردنی لاڕێبوونی ژیار و بیروباوەڕی ڕۆژئاواییەکانە لەلایەن خودی زانایانی ڕۆژئاواوە بەو جۆرەی لەگەڵ چەمکی بنەڕەتی ئیسلام سەبارەت بەو دوانە ناتەبایە.

بەڕاستی ئەورووپا لە چەمك و واتای ئایینی ڕاستی دابەزیو لایدا و لاڕێی کرد و دواتر لەسەر بنەمای دوور لە بەهای ئەخلاقی یان دیدی خوایی ژیارێکی دامەزراند، ئیتر هەر دەبوو بەرەو دارمان بچێ و ڕووداوە یەك دوا یەکەکانی گەندەڵی دیدی ڕۆژئاوایی دەربکەون سەبارەت بە بیروباوەڕو ژیاری، لە ئەنجام دا بیردۆزەکانی نەسرانیەت داکەوتن و دیاردەی گەڕانەوەی ڕۆژئاواییەکان بۆ ئیسلام دەرکەوت کە بێگومان بیری مرۆڤیش دەگات بەو ئاشکرا کاریانەی لێکۆڵینەوەکان چونکە بیردۆزە مرۆییەکان سەلماندیان ناتوانن لەگەڵ بارو سەردەم و کەشەکان دا هەڵبکەن و بیردۆزەکانی بیری مرۆییش نەیانتوانی ببەخشن و خێرا پەکیان کەوت لە ئەنجامی ئەنجامدانی مۆرکی ئارەزووبازی و چاوچنۆکی تایبەتی مرۆیی.

سەبارەت بە لایەنی بیروباوەڕی ئەو بیرۆکەی ڕۆژئاوایی وەستا بوو لەسەر لادانی دەقە خواییەکان کە لە ئەنجام دا خودی ئایینەکەشی لە بازنەی ویستی خوایی بۆ ڕێکخستنی ئایینەکان دەرکردو کردی بە ئایینێکی تایبەتی نەتەوەیی. مەترسیدارترین لادانی فەلسەفەی هاوچەرخی ڕۆژئاواش هەڵگەڕانەوە بوو بە ڕووی خواو دارماندنی پایەکانی ئیمان لە دەروونەکان و ڕاگەیاندنی بێباکی مرۆڤی هاوچەرخ بە بەخششی

ئایینەکان. بیردۆزکانی ڕۆژئاوا (مالتوس و فرۆید و داروین و مارکس و دۆرکایم) داڕمان، ئەمانە باسیان لە بەخششی بیری ڕۆژئاوایی دەکرد (کە بە دەوڵەمەند کردنی بیر ناویان دەبرد) ئەی ئەو بەخششە چی بوو، لە چ بوارێك دا بیری ئیسلامی پێویستی بە پاشماوەی بیری ڕۆژئاوایی هەیە، ئایا لە چیرۆکە بێڕەوشتیەکانی دا یان لە فەلسەفە ماددیەکان دا یان لە مەزهەبەکانی زانستەکانی کۆمەڵایەتی و دەروونزانی و ئەخلاق دا کە بڕوایان بەخوا نیە و دانانێن بە بنەمای چەسپاوە ئەخلاقیەکان دا. بیری ڕۆژئاوا لە چەند بنەڕت و ڕەگەزێکی جیادا خۆی دەنوێنێ:

**یەکەم:** زانستە ئەزموونیەکان: بیردۆزەی بەرزراگیری زانست و شێوەی داڕمانیشی دەرکەوت

**دووەم:** زانستە مرۆیی و کۆمەڵایەتی و دەروونیەکان کە وا دەرکەوتن وەرگێراوی ئارەزووی دەروونی ملهوڕی بێ ڕەوشتی بن لەڕووی بوون و دیدیانەوە.

**سێیەم:** فەلسەفە ماددیەکان کە هەڵەکانیان دەرکەوتن.

**چوارەم:** بیردۆزە ئابووری و سیاسیەکان کە لادان و دەستەوسانییان دەرکەوت.

موسڵمانان ڕای ئەرستۆیان سەبارەت بە خوا بەرپەرچدایەوە هەروەها بیردۆزەکەش سەبارەت بە چەسپان بەرپەرچ درایەوە، موسڵمانان بیردۆزەکەی هیگلیان لە جەدەلیەت و ململانێ دا بەرپەرچ دایەوەو چەمکی پەرەسەندنی ڕەهایان بەرپەرچ دایەوە چونکە بڕوایان بە چەمکی گشتگیری چەسپاو و گۆڕانەکان هەیە، دیموکراتیەت و نەتەوایەتی و شیوعیەت و ئیشتراکیشش نەیانتوانی بەرنامەیەکی دروست پێشکەشی موسڵمانان بکەن، ئەمڕۆ موسڵمانان لایەنە مەترسیدارەکانی پیلانی لەدژ دانراویان بۆ دەرکەوتون، پیلانی صەهیۆنیەت بۆ داڕماندنی دەروونی مرۆیی و ئەخلاق، پیلانی

ڕۆژئاوا لە سەپاندنی چەمکی جیاکاری نێوان ئایین و دەوڵەت، پیلانی مارکسی بۆ سەپاندنی چەمکی ڕاڤەی ماددی لەسەر بنەمای ململانێی چینایەتی. موسڵمانان زانییان ڕۆژئاوا چ ڕقێکی بەرامبەر بە ئیسلام هەڵگرتووە، لەو ڕقەشەوە هەوڵی پیلانێکی گەورە دەدات تا تەنگ هەڵچنێ بە موسڵمانان و بە سەریان دا زاڵ بێ. زاڵبوونێکی ئابووری و هزری و هەوڵی تەنگ پێهەڵچنین و گۆڕینی نەریت و زانراوەکانی موسڵمانان.

عەلمانیەت لە ڕۆژئاواو مارکسیەت لە ڕۆژهەڵات تەواوکەری یەکترن بۆ یەك ڕێباز کە ئەویش ڕێبازی ڕاڤەی ماددیە بۆ مێژوو. ڕۆژئاوا نایەوێت ئیسلام بگەڕێتەوە بۆ سەرچاوەکانی خۆی دوای ئەوەی لە ماوەی سەدە و نیوێك دا ئەو گۆڕانە مەترسیدارە لە جیهانی ئیسلامی دا پەیڕەو کرا چونکە ئەوان پێیان وایە بەو گۆڕانە ئیسلامیان لە واتاو بیری خۆیەوە بردووە بۆ بیرو واتاکانی خۆیان و باڵەکانیان بڕیوەو کۆت بووە، بەڵام ڕای ئێستایان چۆنە کاتێ ئەو پیلانانە بەتەواوی دارمان و بارەکە لایەنی لایەنی ڕاستی موسڵمانانی بۆ تێگەیشتن لە ئایینی حەقیان نیشان دەدات، ئەو ئایینە گشتگیرەی کە جیا لەو چەمکی ئیسلامەی ئەمڕۆ لەسەر زمانی شوێنکەوتەو ئەڵقە لەگوێیانی ڕۆژئاوا دەوترێتەوە. ئەوە نەگبەتیە گەورەکەی ڕۆژئاوا بوو کاتێ ئیسلام ئەو بنەماو بنەڕەتانەی چەند ساڵە بنیادنراوی ئەوان لەناو دەبات، ئیدی بەچاوی خۆیان وەرینی گەڵاکانی پاییز دەبینن. سەبارەت بە بوونی ئیسلام لە وڵاتی خۆی دا نا بەڵکو سەبارەت بە کشانی ئیسلام ڕووەو خودی ڕۆژئاواو خستنی چەمك و واتا لاڕێبووەکانی لاهوت لەلایەن زانایانی ڕۆژئاواوە و نیشاندانی هەڵەی ژیاری ڕۆژئاوا لە لەبیرکردنی دیدی خوایی و دیدی ئەخلاقی دا. ئەمەش گۆڕانێکی گەورە بوو کە ورووژانێکی قووڵی لێکەوتەوە. هێندەش بەسە لێرەدا دیمەنی سەرەتاکانی سەدەی

پانزەی کۆچی ببینین کاتێ ئیسلام لە هەموو جیهان دا ڕووەو سەرکەوتن و دەسەڵات دەڕوات ئیدی ڕۆژئاوا بە بینینی ئصولیەتی ئیسلامی تەواو توورە دەبێ کاتێ دەبینی ئەو ئصولیەتە گەشە دەکات و پێش دەکەوێت، چەندین هەوڵ و پیلانی نوێ هەن بۆ کوژاندنەوەی ئەو گەشەسەندنەی کە بوونی خۆی لە ڕووناکی خواوە وەرگرتووە.

بەڵێ بەڕاستی ئیسلام ڕێبازی خوایی پێشکەشی مرۆڤایەتی کردووە، ئەو ڕێبازەی لەگەڵ فیترەت دا دەگونجێ و لەسەر ئەو ڕاستیە هاوکێشەییە وەستاوە کە خوای گەورە لە نێوان بوون و مرۆڤ دا دایناوە. ئەمەش بریتیە لە هاوکێشەی (موسڵمان بوون لەبەر خوا و قبوڵکردنی بانگەوازی خوا بۆ پەیڕەوی ڕێبازی خوا لەسەر زەوی دا و بنیادی ژیار لەسەر بنەمای ئاشتی و ئاسایش و دڵنیایی).

بەڵام ڕۆژئاوا بە هەموو توانایەوە (توانای ئایینی و زانستی خۆی) بەرپەرچی یاسای خواو سوننەتی بەردەوامی خوایی دەداتەوە ﴿سُنَّةَ اللَّهِ الَّتِي قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلُ وَلَن تَجِدَ لِسُنَّةِ اللَّهِ تَبْدِيلاً﴾.

ئەم سوننەتە خواییە ئەو ئوممەتە لەناو دەبات کە لە فەرمانی خوا دەردەچێ و هەر دەکەوێ، ژیاری یۆنانی و ڕۆمانی و فارسی و فیرعەونی پێشتر بەم یاسایەی خوا کەوتن، وا ئێستاش ژیاری ڕۆژئاوایی هەمان هەڕەشەی لەسەرە، ئیدی بەرەو قۆناغی هەناسە بڕان دەچێ، ئەمەش سەرەتاکانی ئەو قۆناغەن.

فێڵی ساختەکاری کتێبە کۆنەکان کە قورئان ماوەی پانزە سەدەیە ئاماژەی پێداوە وا ئاشکرا دەبن، گەندەڵی ژیارو کۆمەڵگە ڕۆژئاواییەکان کە لەسەر بنەمای ئارەزووگەری و ماددیەت و بێڕەوشتی دامەزراون و ڕقیان لە ڕێبازی خوا وا دەردەکەوێ، ئەو کۆمەڵگە و ژیارانەی لە دیدو سنوری خوایی و دیدی ئەخلاقی

دەرچوون وا ئاماژەکانی کەوتنیان لەڕێی نوسینەکانی خودی ڕۆژئاواییەکانەوە دەردەکەون.

ئەم لێکۆڵینەوە نوێیانەی زانایانێکی ڕۆژئاوایی دوای تێگەیشتن لە ئیسلام (وەك نیزامی کۆمەڵگە و ڕێبازی ژیان) پێشکەشیان دەکەن و پیاوانی بێداریخوازی ئیسلامیش نوێیان دەکەنەوە، ئەو لێکۆڵینەوانە درزێکی گەورەیان لە دیواری ژیاری ڕۆژئاوا و بیری ڕۆژئاواییدا دروست کردووە و لەرزاندوویانە وەك گەورەترین دەنگدانەوەی توند بەجۆرێ بۆکای و گارودی و ئەلیسون و چەندێکی تر کتێبە کۆنەکان زانستە کۆمەڵایەتی و یاسا دانراوەکانیان دانەبەر نەشتەر.

ڕۆژئاوا نیزامی خوای قبوڵ نەکرد و گوڕی بە یاسای دانراوی مرۆیی کە توشی لەناوچوونی کردن، هەوڵیشیان دا موسڵمانانیش بەرەو لادانی خۆیان ڕاکێش بکەن بەڵام بارەکە گۆڕاوە. موسڵمانان گەندەڵی و هەڵەی ڕێبازی ڕۆژئاوایان ئاشکرا کردووەو گەورەیی ڕێبازی ئیسلامی و ڕاستی واقعی پەیامی قورئانی پیرۆزو گەورەیی بەخششی قورئانیان لە ئیعجازی زانستی و ڕاستی واقعی پەیامی قورئانیان سەبارت بە لاڕێبوونی مەسیحی و جولەکە لە کتێبە ئاسمانیە دابەزیوەکان دا ئاشکرا کردووە.

## * پەرە بەرچاو و شاراوەکانی ڕۆژئاوا:

هەڵوێستی ئێستای سەدەی چواردەی کۆچی بەم جۆرەیە:

یەکەم: ئیسلام بە شێوەیەکی ئاشتیانە هەموو کیشوەرەکانی جیهان دەبڕێ.

دووەم: ڕۆژئاوا خۆی بڕوای گەیشتوەتە ئەوەی تەنها ڕێی ئیسلام ماوە.

سێیەم: پێگەی جیهانی ئیسلامی (کیشوەری ناوەڕاست) بوونی سامان و وزەو فرە دانیشتوانی وا لەخۆ دەگرێ کە دەبێ هەمیشە لەسەر بنەمای توانای بەرپەرچدانەوەی دوژمن وەستابێ.

**چوارەم:** ئێستا ئیسلام ئامادەسازی هەیە بۆ گەڕانەوە بۆ پەیڕەوی شەریعەتی ئیسلامی.

**پێنجەم:** موسڵمانان جارێکی تر لەڕێی چەمکە بنەڕەتیەکانیانەوە ژیاری ئیسلامی دەخەنەوە ڕوو و ئەوەی لە ڕۆژئاوایان وەرگرتووە وەك کەرەستەی خاو دەبێ و لەبازنەی چەمکی پوختی یەکخواپەرستی دا شێوەی پێدەدەن.

خواش پشت و پەنایە

أنور الجوندي

یەکی زولقەعدەی ساڵی ١٤٠٦ کۆچی

# ناوەڕۆك

## بەرهەمەکانی وەرگێڕ:

ئەو بەهەمانەی وەرگێر کە دەزگای نارین هەستاوە بە چاپکردنیان

١. ژیانی پێغەمبەر ﷺ بۆ منداڵان. (نووسین).

٢. دەوڵەتی عوسمانی: د.علی محمد الصلابی وەرگێڕانی بە هاوکاری احمد عبدالرحمن أحمد.

٣. چەند وانەیەك لە مێژووی ئیسلامی: شێخ محمد خضری بك.

٤. مێژووی دەوڵەتی عەبباسی: د.محمد سهیل طقوش.

٥. مێژووی ئەییووبی و مەملووکیەکان: د. أحمد مختار العبادی.

٦. فیکری ڕۆژئاوا، ئەنوەرلجوندی.(ئەم بەرهەمەی بەردەستە).

